# سەردەم

گۆڤارێكی تایبەتە بە وەرگێڕان و كەلتووری بیانی

50

نیسان

2007

ســـــاڵی نۆیەم

–ســـەردەم گۆڤارێكـــە بـــە دوو مـــانگ جارێـــك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی كەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیكر و ڕەخنە و لێكۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تكایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەكەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێكی پەڕەكە نووسرابێتەوە یان كۆمپیوتەر كرابێت. پەراوێز و سەرنجەكانیش لە كۆتایی وتارەكەدا هەبن. ئەگەر یەكێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مـــافی بڵاونەكردنـــەوەی هەیـــە و پێـــشەكی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەكات.

–بەرهەمـــەكان بڵاوبكرێنـــەوە یـــان نەكرێنـــەوە نادرێنەوە بە خاوەنەكەی.

–هـــەموو پەیوەندییـــەك لـــە ڕێگـــای سەرنووسەرەوە دەبێت.


خاوەنی ئیمتیاز: شێركۆ بێكەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی      شوان ئەحمەد

د. شاهۆ سەعید

دەرهێنان و كاری كۆمپیوتەری

تاڤگە فائق

بەرگ: قادر میرخان

هەڵەچنی چاپ: ساكار رەووف

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق



ناونیشان

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم *3129609*

بۆ پەیوەندیكردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( *14665/615* و *14665/616*) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

govarysardam@yahoo.com

www.sardamco.com



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەكاتەوە

# ناوەرۆك


| | | |
|---|---|---|
| حەقیقەت و رەخنە | كریستۆفەر نۆریس | لەعەرەبیەوە: د. شاهۆ سەعید (3) |
| ئەقڵیەتی سەدەكانی ناوەڕاست | هاشم ساڵح | له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد (16) |
| مژدە بەخشانی مۆدێرنەی سیاسی | مۆریس باربیه | له فارسییەوە: رێبین هەردی (39) |
| خێزانە حیزبییە گەورەكانی ئەوروپا | د. ئەحمد نەقیب زادە | له فارسییەوە: ئیسماعیل شێخ موراد (50) |
| جان جاك رۆسۆ و ئەندێشەی دادپەروەری | بەهرام مەحی | له فارسییەوە: رەزا مەنوچەهری (61) |
| رووناكبیرانو مۆدێرنیتە | رامین جەهانبەگلوو | له فارسییەوە: سامان كۆنەپۆشی (65) |
| ئۆرهان پاموك سەبارەت بەو رازو ڕەمزانە قسە... | محمد فهیمی | له فارسییەوە: محەمەد كەریم (78) |
| دەربارەی پێكدادانی كولتوورەكان | كارڵ پۆپەر | له فارسییەوە: ئاریا ئەحمەدی (86) |
| پارتە سیاسییەكانو گروپەكانی فشار | عبدالرحمن عالم | له فارسیەوە: حەسەن حسین (95) |
| لە بارەی عەقڵەوە | د. عبدالكریم سروش | له ئینگلیزییەوە: هادی محەمەد (115) |
| ژنانی فەلەستین | زهیرە كەمال | لەعەرەبییەوە: كنێر عەبدوڵلا (124) |
| هیچ چاوێك چاوەڕوانم نییە!! | لاش ئالین | له سویدییەوە: هیوا قادر و عەبدوڵڵا قادر(132) |
| ماڵەكەی ئەستریون | خۆرخێ لویس بۆرخیس | له عەرەبییەوە: سابیر شاكر (146) |
| لە بیرەوەرییەكانی پزیشكێك | ئانتوان چیخۆف | له فارسییەوە: حەمە رەسول حەسەن پوور (149) |
| شیعری فەرەنسی | ژاك پریڤێر | له فەرەنسییەوە: فەرهاد پیرباڵ (160) |
| دوو قەسیدەی ئارتیوور رامبۆ | | له فەرەنسییەوە: سمكۆ ناكام (162) |
| دڵدارە هەرە ئازیزەكەم | نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆلگاكنیپەر | له فارسییەوە: رەووف بێگەرد (164) |


## وێستگەكانی سەردەم


| | | |
|---|---|---|
| ماركیز له هەشتا ساڵیی تەمەنیدا | | له عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد (174) |
| فێندەمێنتالیزم له خۆرهەلأت و خۆرئاوا | هاشم ساڵح | له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد (177) |
| جیهانی بانانا یوشیموتو.. | نزار ئاغری | له عەرەبییەوە: ساكار رەووف (180) |
| خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی "تیرۆرستانی خودا" | جۆن والش | له عەرەبییەوە: عەزیز رەئووف (184) |
| نامەكانی دۆستۆیفسكی پێش فەرمانی تیرەباران ... | هاشم ساڵح | له عەرەبییەوە: رەووف بێگەرد (186) |
| یان هەمووومان لەناو دەچین یاخود هەمووومان ... | هاشم ساڵح | له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع (190) |


**نرخی** (1200) **دینارە**

# حەقیقەت و رەخنە

كریستۆفەر نۆریس
لەعەرەبیەوە: د. شاهۆ سەعید

دیـــدی ســـپینۆزا پێـــچەوانەی دیـــدی رەخنـــەگرانی رۆژگـــاری ئـــەمڕۆمان بـــوو. ئـــەو پێیوابـــوو هەڵەیـــەكی گـــەورەو پـــشێوییەكی {فیكرییـە} گـەر ئـەنگێزە ئـەقڵیو لۆجیكیـەكان تێكـــەڵ بـــە پرســـەكانی ئیمـــان بكـــەین، یـــان لێكۆڵینـــەوەی رەخنـــەییو ئـــەقڵانی بخەینەگـــەڕ لەپێناو چنگكەوتنی مانایەكدا كە پێویستە لە دەقـی شـیكراوەدا هـەبێ بـەوجۆرەی نـەریتێكی رەخنەیی لە نێوەندی ئەو كەسانەدا دەیخوازێ كە سەرقاڵی شیكردنەوەن، جا ئیتر كەسانێكی كۆنـەپارێز بـن یـان نـا. سـپینۆزا لـەم رووەوە جیاوازییـەكی زۆری لەگـەڵ چەند رەخنەگرێكدا هـەبوو لەبابـەتی كیرمـۆد، كـە پێیـانوابوو تاقـە جیاوازی ترسناك لەنێوان ئەقڵو ئیماندا بریتیـە لـە جیـاوازیی لـەنێوان دوو خوێندنـەوەدا كـە یـەكێكیان (داخـراو *closed*)و ئاڕاسـتەكراوە، ئـەوی تریـان (كـراوە *open*)و ئـازادە. یـان جیـاوازیی نێـوان دوو جـۆر خوێندنـەوە: كـە یـەكێكیان بەشـێوەیەكی كوێرانـە لەئاسـت ڕواڵەتی دەقدا تەسلیم دەبێ، بەڵام ئەوی تریان لە راڤەكردنو ئاسۆكانی بیدعەدا رەهادەبێ.

مەترسـییەكی ئـەوتۆ لـەئارادا نیـە گـەر جیاوازیی نێوان ئەو دوو دیدە بگاتە دوورترین ئاسـتی پـەرگیری، چـونكە ئـەو جیاوازییـە بەشێكی دانەبڕاوە لە بەهاو عەقیدە باوەكان، هـەروەها لـەناو جەرگـەی ئـەو وتوێژانـەوە سەرچـاوەدەگرێ كـە ڕێ لەبـەردەم پرۆسـەی راڤـەی مەبەسـتداردا خۆشـدەكەن. سـپینۆزا پێیوابوو حەقیقەتی راستەقینە ئەو شتەیە كە بـەرەنگاری كۆشـشەكانی راڤـەی سـاختە دەبێتـەوە، واتـە ئـەو جـۆرە راڤەیـەی كـە تێگەیـشتنێكی نـوێ بەسـەر دەقەكانـدا دەسـەپێنێ كـە هـیچ پەیوەندییـەكی بـە دەقەكانەوە نیە، بەتایبەتی ئەو دەقانەی كە هەڵگری بۆچوونی جیاوازن. كارێكی لەم جۆرە دەرگا والادەكا بۆ هەموو راڤەكارە جیاوازەكان، تا دەقەكان بە ئارەزوی خۆیان شیبكەنەوە، كە ئەڵبەتە ئەو جۆرە شیكردنەوانەش بێبەری نین

لە ئارەزوو دەمارگیری، چونکە هەندێ جار، بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە، ملکەچ و هاوڕای بەها باوەکانن، هەندێ جاریش حەماسەت دەیانگرێ تا بەپێچەوانەی دەقەکانەوە قسەبکەن و پارێزگاری لە هەیبەتێکی ئەکادیمیانەی ساختە بکەن. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا راستگۆیی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی لەبەیندەچێ کە پەیوەندییەکی دڵنیاکەری بە جیهانبینی مەعریفیەوە نیە وەك پێشتر لە "بازنەی راڤە"دا ئاماژەمان پێدا، هەندێ جاریش ئەو لێکۆڵینەوانە لای خوێنەران پشتئەستور نین بە مەعریفەی پێشوەخت، {سەرەنجام} ئاسۆی تێگەیشتنیان دەربارەی حەقیقەتی تەوراتی یان هەر عەقیدەیەکی ئەهلی سەلەف لێڵ دەبێ.

لەکاتێکی ئاوهادا خوێندنەوە دەبێتە چالاکییەکی رەخنەیی راستەقینە، یان تێکرژانێکی چالاك لەگەڵ ماناکانی کتێبی پیرۆزداو وەك هێماگەلێك مامەڵە لەگەڵ ئەو مانایانەدا ناکرێ کە گوزارشت لە حەقیقەتی یەزدانی دەکەن، بەڵکو وەك ئاماژەگەلێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ کە قابلی هەڵەن و لە سنوری تێگەیشتنی مرۆیی و چوارچێوەی دۆخێکی مێژویی دیاریکراودان. بەهەرحاڵ ناکرێ وەك پەیڕەوانی موسای کوڕی میمۆن و موفەسیرە زۆر سەلەفیەکان رەخنە ببەسترێتەوە بە پێکەوەگونجاندنی نێوان ئەقڵ و شەریعەت، بەجۆرێك کە ئەقڵ بخرێتەگەڕ لەپێناو پێداویستیەکانی شەریعەتدا یان خۆمان لەقەرەی ئەفراندنەکانی خوێندنەوە نەدەین تا ئەقڵ دوورخەینەوە لە ململانێ لەگەڵ خودی داواکارییە ئاینیەکاندا. لە کتێبی "نامەیەك دەربارەی لاهوت و سیاسەت"، کە لە سەرەتای ئەم نەسکەدا ئاماژەمان پێدا، سپینۆزا جەنگێکی گەورەی دژی ئەو دیدە بەرپاکرد کە ئەقڵ دەخاتە خزمەتی وەحی، (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: *Strauss, 1965*).

لێرەدا تەنها هێندە بەسە کە ئاماژەبدەین بەوەی سپینۆزا قەیدومەرج و سنوردانان لەسەر ئەقڵی رەخنەیی رەتدەکاتەوە. ئەو ئامادەیە هەموو بانگەوازێکی حەقیقەتی ئاینی لەسنوری پرسەکانی ئیماندا پەسەندبکا (بەو مەبەستەی لە پرسەکانی لێکۆڵنەوەی کراوەی ئەقلانی جیایان بکاتەوە). ئەو هەرگیز حەزی بەو موفەسیرانە نەدەکرد کە لە خوێندنەوەدا گەمایان دەکردو زۆر فێڵبازانە هەوڵیان دەدا فۆرمە جیاوازەکانی مەعریفە پێکەوە کۆبکەنەوە تا ئەقڵ و پرسەکانی ئیمان بەر یەکدی نەکەون. ئەو موفەسیرانە لە دەلالەتی حەرفیی دەقی پیرۆز هەڵدەهاتن و تەفسیری لەخشتەبەرو سەرنجراکێشی خۆیان دەخستەڕوو (واتە تەحریف و کەچڕەویی مەجازیی و وەعزی تا لە مانا حەرفییە روونەکان دوور بکەونەوە). سپێنۆزا پێیوابوو ئەرکی ئەقڵ بریتییە لە خستنەڕووی پرسیار دەربارەی کتێبی پیرۆز، تەنانەت گەر پرسیارەکان بڕژێنە ناو ئیدعاکانی حەقیقەتی تەوراتیشەوە، چونکە نابێ ئەو ئیدعایانە چالاکیی بیرکردنەوەی ئەقلانی سنوردار بکەن.

ئەو پێیوابوو ئەم پرسیارانە درێژ دەبنەوە تا ئەو پرسیارانەش لەخۆبگرن کە دەچنە خانەی زانستی زمانی بەراوردکارەوە، هەروەها رەخنەو ساغکردنەوەی دەق، مێژوی سیاسی، یان ئەو

زانستەی کە ئەمرۆ پێیدەوترێ سۆسیۆلۆجیای عەقیدە *Sociology of Belief*. هەروەها ئەم ئەرکە پێویستی بەوە هەیە بایەخێکی زۆر بەو بابەتانە بدرێ کە پەیوەندیدارن بە بواری شیعریەتی گێڕانەوە *Narrative Poetics*، چونکە ئەم هونەرە دەتوانێ هاوکار بێ بۆ تێگەیشتنی کێشەکانی دەقی پیرۆز، بەتایبەتی کاتێ حەقیقەت بەرگی مەجاز دەپۆشێ و تێکەڵ بە فەنتازیا دەبێ. ئەم هونەرە ناتوانێ ئەو ئاڵۆزییە بڕەوێنەتەوە و تێگەیشتن بەرجەستە بکا ئەگەر جیاوازی نێوان مانا و حەقیقەت بەهەند وەرنەگیردرێ، هەروەها جیاوازیی نێوان شیکردنەوەی دەق بەشێوەیەکی دیاریکراو و روون لەلایەک و شیکردنەوەی ئەقڵانی کە بیرۆکەی ماقوڵی لێدەکەوێتەوە لەلایەکی ترەوە.

پاشان سپینۆزا ئەو میتۆدە بەتەواوی رەتدەکاتەوە کە سەرلەبەری دەق لەسەر یەك ئاست شیدەکاتەوە، بەجۆرێك تەنها پەخشانێکی لێدەکەوێتەوە کە ئەویش وێنەیەکی تری گێڕانەوەو حیکایەتخوانییە کە تەنراوە بە بانگەشەی حەقیقەت. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو سپینۆزا هێرشی کردە سەر شوێنکەوتوانی موسای کوڕی میمۆن و خەڵکانێکی تر کە زیادەڕۆییان لە میتۆدی راڤەکاریدا دەکرد. لێرەوە دەگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو بابەتەی کە پێشتر باسمانکرد سەبارەت بەوەی کە حەقیقەتی راست دیالۆگ دادەمەزرێنێ لەنێوان شیکردنەوەو خوێندنە جیاوازەکاندا، دیالۆگێك کە رێ خۆشدەکا لەبەردەم تیۆرەیەکی تری راڤەکردندا کە دژی کۆششەکانی داخرانە، یان ترازان لە شیکردنەوەی دەق.

سپینۆزا سێ رەخنە ئاراستەی ئەو میتۆدە ساختەو باوە دەکا کە لە شیکردنەوەی دەقی ئاینیدا بەکاردێ:

یەکەم: ئەو میتۆدە رێگەیەك ناهێڵێتەوە بۆ رەخنەکردنی دەقە تەوراتیەکان، چونکە رەخنە بە پرۆسەیەکی جیاواز لەقەڵەم دەدا کە لەیەك کاتدا دەبێتە رێگر لەبەردەم خوێندنەوەی نوێداو هەرگیزیش پەیوەندیی بە بابەتگەلێکی بنەڕەتییەوە نیە وەك راستگۆیی و حەقیقەت.

دووەم: ئەو میتۆدە کەسی شیکەرەوە (موفەسیر) دەخاتە بان لێپێچینەوەو پرسیارەوە، چونکە تەفسیرەکانی وی ئیدعای گەیشتن بە حەقیقەتێك دەکا کە تەنها خاوەن زانستەکانی وەك خۆیان (خاوەن توانا تەئویلیەکان) پەی پێدەبەن، ئەوانەی –بەبڕوای خۆیان– لەسەر مانای ئاخاوتنێکی پیرۆز دەوەستن کە ئاشکرا نابێ و لەسەرو تێگەیشتنی خەڵکەوەیە.

سێیەم: لە ئەنجامی هەردوو خاڵی پێشووداو لە گەرمەی دۆخێکدا کە کەس رەخنەیەکی رۆشنگەرانە ناگرێ و هەموو جۆرە شیکردنەوەکانی تر لەکاردەکەون، ئەم میتۆدە رادەی تێگەیشتن خامۆش دەکا و جۆرێك لە سڕبوون دەخاتەوە کە هەموو جۆرە شیکردنەوەکانی تر خۆیان لەپشت دەمامکی دەسەڵاتێکی ساختەوە پەنهان دەدەن.

ئەمە ئەو هۆکارە بوو کە وای کرد سپینۆزا، لە بابەتە رەخنەییەکانیدا لەمەڕ وەحی، گومانی هەبێ سەبارەت بە بابەتگەلێکی پەیوەندیدار بە

موجیزەو پێغەمبەرایەتیو کارە سروشت بەزێنەکانو ئارەزووەکانی عەوامی خەڵکەوە. گومانەکانی سپینۆزا لەو هێرشەدا هاتووە کە کردوویەتیە سەر ئەو بیرۆکەیەی دەڵێ کتێبی پیرۆز سەرچاوەی واتای یەزدانییەو کانگای حەقیقەتی ئیلاهییە. "تەنها ئەو دیاردانەی کە تێگەیشتنمان دەربارەی هەیەو پەییان پێدەبەین شایەنی ئەوەن بیاندەینە پاڵ یەزدانو خواستی یەزدان، نەك ئەو دیاردانەی کە ناچێتە ئەقڵمانەوە بەڵام خەیاڵمان دیل دەکاو مرۆڤەکان سەراسیمەدەکا" ( *Spinoza, [1670] 1884, vol.1, p.86*). لە تەفسیرە باوەکاندا بڕوابوون بە موجیزە، پێغەمبەرایەتیو بابەتە سروشت بەزێنەکان بەجۆرێك بەهێزدەبن کە دەچنە سەروو رەخنەوە، چونکە ئەقڵ هەموو توانایەکی هەڵاوێردکردن لەدەستدەداو ملکەچی پێداویستیەکانی حەقیقەتی ئاینی دەبێ.

نمایشکردنی دیدوبۆچوونەکانی سپینۆزا هاریکاریمان دەکا ئەو هەڵەیە ڕوون بکەینەوە کە پێڕەوانی پۆست مۆدێرنیزم تێیکەوتوون، ئەوانەی لە بەهاکانی "رۆشنگەری *Enlightenment*" هەڵگەڕاونەتەوە، سەرباری جیاوازیی بوارەکانیانو قوتابخانەکانیان لە بیرکردنەوەدا. واتە پۆست مۆدێرنەکان شکستێکی گەورەیان خواردووە لەمەڕ جیاکاری لەنێوان دوو چەشنی جیاوازی بانگەشەکردن بۆ حەقیقەت:

چەشنی یەکەم/ رەنگە وێناکردنی "حەقیقەت" لەڕێگەی مانای تەقلیدی (ئەفلاتۆنی یان مەسیحییەوە) بەو مانایە پاساوبدرێ کە حەقیقەت بەشێکە لە وەحیو تێگەیشتنی بەندە بە دەستەبژێر (نوخبە)یەکی خەڵکی ژێرەوە. سپینۆزا لەمبارەیەوە پێیوابوو دەبێ وریا بینو زۆر پشت بەو بەڵگانە نەبەستین کە سیاقە سەردیەکانی تەورات دەیبەخشن (یان نمونەی ئینجیل *parables* کە مەغزایەکی ئەخلاقیی هەیە). ئەو سیاقانە حەقیقەت نوقمی زمانێکی رەمزیی پڕ لە مەتەڵو ئاڵۆزی دەکەنو هیچ بوارێك بۆ تێگەیشتنی لۆجیکی ناهێڵنەوە (هەرچەندە کیرمۆد -بەپێچەوانەوە- پێیوایە سیاقەکان خۆیان لەخۆیاندا گەورەترین کێشە بۆ شیکردنەوە دروستدەکەن، چونکە ئەو فۆرمانەی تەفسیر لەدایکدەبن کە خۆدزینەوە لەخۆدەگرن). لەبەر ئەم هۆیە سپینۆزا پەیوەندییەکی تۆکمەی دەبینی لەنێوان بڕوابوون بە سیاقی تەوراتی کە بەڕاستگۆیانە وەحی دەگێڕێتەوەو بڕوابوون بە موجیزەو پیغەمبەرایەتیو ئەو پرسە سروشتبەزێنانە (خوارق) کە بەگوێرەی یاساکانی سروشتو حوکمەکانی ئەقڵ ناڕۆن بەڕێوە. بەدەربڕینێکی تر سپینۆزا هوشیاریی دا سەبارەت بە کێشەی تێکەڵکردنی بیرۆکە راستەکان لەو بیرۆکانەی کە خەیاڵاویو ناڕاستن، ئەگەر نا ئەوا چەندین جۆر خورافەو قسەی پوچیان لێدەکەوێتەوە. بەڕای وی لە سەردەمانێکی سەختو پڕ پشێویی کۆمەڵایەتیو هەڕەشەدا کە ڕووبەڕووی قەوارەی جولەکەکان بۆتەوە، پەیامبەرانی پەیمانی کۆن (تەورات) ناچاربوون ئەو عەقیدە میللیو بانگەشە خورافیانە وەگەڕخەن لەپێناو سەپاندنی سیستێمو ڕێزگرتن لە شەریعەت. ئەو ناچاربوونەش زادەی دۆخێکی مێژوویی

لەناکاوو پێداویستییەکی ستراتیجی بووە نەك نمونەیەکی جێگیر کە پێویستە هەموو کۆمەڵگەو نەوە رۆشنبیرەکان لە هەموو کاتێکدا پابەندی بن.

چەشنی دووەم/ لە تێگەیشتنێکی شیاودا خۆی دەبینێتەوە، هەنگاوەکانی یەکەمی ئەو تێگەیشتنەش بریتییە لەوەی "هەموو بیرۆکەیەکی راستگۆ هەڵاوێرد بکەینو لە شتە هەستپێکراوەکان جیایان بکەینەوە. واتە بۆ ئەوەی بیرۆکە راستەکان تێکەڵی وێنە خەیاڵیو گومانیاویەکان نەکەین" (*Spinoza, [1677], vol.2, p.18*). پاشان هەنگاوێکی تر دێتەپێشێ بەوەی نابێ دوو جۆر مەعریفە تێکەڵاوی یەکتر بکەین، کە یەکێکیان مەعریفەیەکە زادەی گێڕانەوەی راستەوخۆیە بێ هیچ وردبوونەوەیەك، ئەوی تریان مەعریفەیەکە لەرێگەی لێکۆڵینەوەی ئەقڵییەوە پێیدەگەین، هەروەها لەرێگەی وردبوونەوەو خوێندنەوەی بەهاکانی گێڕانەوەوە بەشێوەیەکی رەخنەیی. لەلایەکی ترەوە دەکرێ بڵێین فەلسەفەی سپینۆزا، لە هەموو هەنگاوەکانیدا، پێچەوانەی پرۆژەی پۆستمۆدێرنە خاوەن گومانەکانە (کە ئەڵبەتە کیرمۆد یەکێکە لەوان بەئەندازەیەکی کەمتر)، چونکە پۆستمۆدێرنەکان خۆیان خستۆتە وێڵگاکانی راڤەکارییەوە بەبێ ئەوەی توانای دەربازبوونیان هەبێ. کاتێ پاییێر ماچریێ *P. Machrey* دەربارەی ئەم خاڵە قسەی کرد مەبەستی بوو لە دیدی سپینۆزاوە بەرپەرچی ئەو رەخنەگرانە بداتەوە کە جیاکارییان نەدەکرد لەنێوان گێڕانەوەی چیرۆكو گوتاری رەخنەییدا. لەمبارییەوە دەڵێ:

"ئەفراندنی خەیاڵی *fiction*[1] شتێك نیە لە وەهم *illusion*[2] راستتر بێ، هەروەك چۆن شتێك نیە جێگەی مەعریفە بگرێتەوە. بەلاّم دەشێ خەیاڵ بزوێنەری وێنە زەینیەکان بێ لەرێگەی بەزاندنی سنورەکانو دروستکردنی پەیوەندییەکی ئایدیۆلۆجی لەنێوان ئێمەو ئەو وێنانەدا. ئەفراندنی خەیاڵی دەمانخەڵەتێنێ، بەلاّم تەنها بەمەبەستی خەڵەتاندن نا، بەڵکو هەندێجار لەوە قووڵتر دەڕوا تا رووتی بکاتەوەو دەستگیرۆییمان بکا تا لێی دەرباز بین. (*Macherey, 1978, p.64*).

کەواتە هەڵەیە، بەڵکو هەڵەیەکی ئانقەستیشە، ئەگەر سەیری سپینۆزا بکەین وەك یەکێك لەو بیریارانەی کە هەرگیز بایەخی نەداوە بە پرسەکانی تیۆرەی مەعریفەی پەیوەندیدار بە حەقیقەتو حەقیقەتی پێچەوانەوە لەبواری تەفسیری دەقو تێگەیشتنی سیاقی چیرۆکەکاندا. نەخێر ئەو هەرگیز هەڵوێستێکی لەوجۆرەی وەرنەگرتووە، تەنها لەو کاتانەدا نەبێ کە عەقیدە راستەقینەکانی ئیمان تێکەڵ بە فۆرمە جیاوازەکانی پەیامبەرێتیو موجیزەو کارە سروشتبەزێنەکان کراوە. بەڵکو ئەو پێیوابوو دەبێ خۆمان لە ستەمی راڤەکاریی شوێنکەوتوانی موسای کوڕی میمۆن بەدووربگرین کاتێ پێکەوەگونجان دەسازێنێ لەنێوان ئیمانو ئەقڵدا، هەروەها دەبێ پەنابەرین بۆ جۆرێك لە خەیاڵ لە راڤەکردنی کێشەی دەقەکاندا کە لە حەقیقەتو سیاقی لۆجیکی دەترازێنو مل بۆ تەفسیرێکی رۆشنگەرانە نادەن. تەنانەت لە کێشەی دەقەکانیشدا

سپینۆزا هانی موفەسیرەکان دەدا تا دەقەکان بە مانای زیادە بارنەکەن، وەك مانا گۆنۆسییەکان و رەمزییەکان و سۆفیگەرییەکان کە مل نادەن بۆ هیچ شیکردنەوەیەکی لۆجیکی، بەڵکو راستتر وایە بەدوای ئەو سیاقە کۆمەڵایەتی و مێژوییانەدا بگەڕێن کە ماناکانیان لەئامێزگرتووە و ئەو مۆرکەیان پێبەخشیوە.

هۆکاری ئەم تێکەڵاوکردنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو عەقیدە باوەی پێڕەوانی پۆست بونیادگەری و پۆستمۆدێرنیزم و رەوتە هاوشێوەکان (کە دژی رۆشنگەریین *anti Enlightenment*). ئەوان پێیانوابوو هەر تێزێك دەربارەی "حەقیقەت"، ئیتر سەر بەهەر سیاقێکی رۆشنبیری و مەعریفی بێ، جۆرێك لە لایەنگیریی پەنهان لەخۆدەگرێ لەئاست پرنسیپێك یان بەهایەکی دیاریکراودا. ئەو لایەنگیرییە پشتئەستورە بە باکگراوندێکی مەعریفی گۆنوسیی تەمومژاوی "میتافیزیکی". ئەو تێکەڵاوکردنە زیاتر دەرکەوت بەهۆی خوێندنەوەیەکی ناڕاست و تێگەیشتنێکی رواڵەتیانە لەو قسەیەی جاك دێریدا *Jacqes Derrida* کردوویەتی دەربارەی "رەوتی مەرکەزیی لۆگۆس *Logocentrism*" یان ئەو شتەی کە ناونراوە "میتافیزیکای ئامادەبوون *metaphysicians of presence*"[3] کە کۆنترۆڵی فیکری خۆرئاوایی کردووە. ئەو زاراوانە کە ئێستا پەرەیان سەندووە دەلالەت دەکەن لە رژێمێکی داپڵۆسێنەر *repressive regime*[4] کە پەیوەستن بەهەندێ دیدوبۆچوونی کۆن دەربارەی زمان، حەقیقەت و واقع و دەشکرێ ئێستا بۆ دواجار لەبەرییەکیان هەڵوەشێنین "لەڕێگەی ئاشکراکردنی ئەو رەوانبێژیی و تاربێژییەی تێیدایە" (*Derrida, 1976*). لەراستیدا ئەم کارە سوکایەتیکردنە بە فیکری ئەم پیاوە بۆ کەسێك کە کتێبەکەی خوێندبێتەوە نەك تەنها پشت ببەستێ بە دروشمگەلێك کە لە سیاقەکانا دەرهاوێژراون. لە راستیدا دێریدا لەسەر هەقە کاتێ لەسەر دوو بابەت جەختدەکاتەوە: یەکەمیان، پێوەرەکانی راستگۆیی و خوێندنەوەی راست بەشێکی دانەبڕاوە لە پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە. دووەم، هەر کۆششێك بۆ خۆدەربازکردن لە "مەرکەزیەتی لۆگۆس" کە پێشتر باسمانکرد، یان هەر بازدانێك بۆ دەرەوەی ئەو مەرکەزیەتە، جۆرێکە لە بیرکردنەوەی میتافیزیکیی سەربەرەوخوار، کە ئەڵبەتە بەردەبێتەوە ناو ئەو ئەگەرو گریمانانەی کە زۆر ساویلکانانەن و دەچنە پێش قۆناغی رەخنەوە (*Derrida, 1981*).

ئەوەی سەرنجڕاکێشە لە نوسینەکانی دێریدا ئەو هەڵوێستە رەخنەییە توندەیە کە لەڕێگەیەوە باس لە توخمەکانی بەرەنگاری دەکا لە دەقدا، واتە دوالیزمە هاودژو ناجێگیرەکان *unstable binary opppsitions*[5]، کە لەیەك کاتدا چەمکی کلاسیکیی کورتکراوەی حەقیقەت لە مەسیحیەت و ئەفلاتۆنیەتدا رەتدەکەنەوە. بۆ ئەو مەبەستە دێریدا جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە پێویستە خوێندنەوەی رەخنەیی دەقەکان بە هەندێ پرس دەربارەی حەقیقەت رێکبخرێن و دیسپلین بکرێن، چونکە هەر پرۆژەیەکی رەخنەیی کە مەبەستی بێ دیوارەکانی دەق ببەزێنێ و دەق

بخاته بەر لێپرسینەوە ناتوانێ دەسبەرداری ئەو پرسانەی حەقیقەت بێ. ئەگەر نا ئەوا –وەك بینیمان– بەتەواوی‌و بەشێوەیەکی ریشەیی لە پرسەکانی مانا و حەقیقەت دادەبڕێن‌و رەخنەش دەبێتە جۆرێك لە تێڕامان لە نهێنییە غەیبییەکانی دەق، ئیتر رەخنە باوەشدەکا بە گومانە پۆستمۆدێرنەکاندا، یان ملکەچی ئەو رەوتە گوماناوییە دەبێ کە دژایەتی هەموو جۆرە ئینتمایەکی مەزهەبی‌و سەلەفی دەکا کە شەیدای گەڕان‌و راڤەکردنی مەسەلە نهێنی و غەیبیەکانی ناو دەقە گرفتئامێزەکانە.

هەر لەبەر ئەم هۆیە دێریدا لە نوسینەکانی دواییدا سورە لەسەر ئەوەی کە بڵێ هەڵوەشاندنەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ دەسبەرداری یاساکانی دیالۆگی فەلسەفیی جدی ببین (*Derrida, 1981*). ئەو یاسایانە خۆیان لە هەڵوێستی دیالیکتیکیدا دەبیننەوە، هەروەها خۆیان لە دڵسۆزیدا بۆ دەق دەبیننەوە لەرێگەی جڵەوکردنی ئارەزوە شەخسیەکانەوە، واتە ئەو ئارەزوانەی کە رێگە نادەن وردەکاریی کێشەکان ببینن کە لە سەرەتاوە رێ لە شیکردنەوە دەگرن. بەکورتی میتۆدی هەڵوەشاندنەوە هێزی خۆی لەو بابەتانە وەردەگرێ کە بەکاریان دێنێ بۆ ئاشکراکردنی بانگەشە وەهمیەکانی حەقیقەت‌و نهێنییە غەیبییەکان. ئەو میتۆدە لە هەمان کاتدا پارێزگاری لە پێوەرەکانی هەڵوێستی تونەدی دیالیکتیکی دەکا و پێداویستییەکانی خوێندنەوەی داخراو لە دەقدا بەهەند وەردەگرێ. هەرچەندە هەندێ لە نەیاران خۆیان غافڵکردووە لەم نەرمییەی کە لە میتۆدی هەڵوەشاندنەوە لای دێریدا هەیە، بەڵام زۆرێکیش لە شوێنکەوتووانی زیادەڕۆییان کردووە لەوەی دەرفەتیان بەخشیوە بەخۆیان بۆ خۆدوورخستنەوە لە هەموو {مانایەکی} حەقیقەت‌و راستی‌و ئەقڵ.

رەنگە پۆل دی مان *Paul de Man* دیارترین کەس بێ بەرپەرچی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە بەخراپ لە خۆێندنەوەی هەڵوەشانگەری حاڵی بوون، لەو گۆشەنیگایەوە کە پێیان وایە ئەو خوێندنەوەیە دەرفەت بۆ هیچ پرسێکی مەعریفی ناهێڵێتەوەو هیچ قورساییەك بە بەهاکانی حەقیقەت‌و ساختەیی نادا. خوێندنەوە –وەك پۆل دی مان– دەڵێ:

"پشتئەستورە بەوەی کە چۆن مرۆڤ لە پەیوەندیی نێوان حەقیقەت‌و تێگەیشتن دەگا. چونکە تێگەیشتن فۆرمێك نیە کە لە تاقە حەقیقەتێکی گەردوونیدا، وەك جەوهەرێك یان وەك سروشتێکی پەتی، دەرکەوێ. حەقیقەتی دەق رووداوێکی ئەزمونی‌و واقعی‌و هەستپێکراوە نەك شتێکی ئەبستراکت. ئەو شتەی کە خوێندنەوە نزیکدەخاتەوە لە واقع یان دووری دەخاتەوە بریتیە لە سەرگرتنی خوێندنەوەکە یان زەرورەتی جێبەجێبوونی، جا ئیتر خوێنەر یان نوسەر رەزامەندییان لەسەر بێ یان نا. بەدەربڕینێکی تر تێگەیشتن پشتئەستورە بەهەڵوێستی تونەدی خوێندنەوەوە، چونکە خوێندنەوە جۆرێکە لە لێپێچینەوەو بەڵگەهێنانەوە لەگەڵ دەقدا. بەڵێ خوێندنەوە جۆرێکە لە لێپێچینەوەو بەڵگەهێنانەوە (کە ئەڵبەتە ناگاتە ئاستی مشتومڕو کێشمەکێش). خوێندنەوە بەرەنگاری

هەموو ئەو شتانە دەبێتەوە کە مرۆڤ خوازیارە رووبدا لەپێناو روودانیاندا. واتە تێگەیشتن روداوێکی مەعریفیی (ئەپستمۆلۆجییە) بەر لەوەی بەهایەکی ئەخلاقی یان ئیستاتیکی بێ. ئەمە مانای ئەوە نیە ئەگەری خوێندنەوەیەکی راستەقینە لەئارادایە، بەڵکو مانای ئەوەیە کە لەبنەڕەتدا ناتوانین وێنای خوێندنەوەیەك بکەین گەر هەر لە سەرەتاوە پەیوەست نەبێ بە پرسەکانی حەقیقەت و ساختەییەوە" .(*de Man, p.xi*)

شایەنی باسە سپینۆزا ئەم پرسیارانە هەروا ناخاتەڕوو، بەڵکو سوورە لەسەر دیدوبۆچوونی خۆی بەئەندازەیەك هیچ کەلێنێك ناهێڵێتەوە لە کەلێنەکانی لە گوتاری رەخنەیی، {بەتایبەتی} ئەو گوتارەی کە بایەخ بە بەهای رەوانبێژی و ئیستاتیکی دەدا. ئەم دیدەی سپینۆزا زۆر بەڕوونی لە گوتاری گێڕانەوەدا دەردەکەوێ وەك فۆرمێك لە فۆرمەکانی مەعریفە، فۆرمێك کە دەکەوێتە نێوان حەقیقەت و ساختەییەوە. لە هەناوی گوتاری گێڕانەوەدا "ناڕاستی *untruths*" هەیە، کە وەك خۆی دەمێنێتەوە و ناچێتە ڕیزی بیرۆکە راستەکانەوە. ئەم لایەنە لە بیرکردنەوەی سپینۆزا هانی هەندێ فەیلەسوفی وەك "ماچێری"ی داوە کە دەروازەیەکی تیۆریی نوێ بۆ مارکسیزم بدۆزنەوە، دەروازەیەك کە ڕێز لە تایبەتمەندیی ڕێژەیی دەگرێ وەك لە ئاست و فۆرمە جیاوازەکانی بەرهەمی رۆشنبیریدا هەیە. بەگوێرەی ئەو دەروازەیە کارێکی هەڵەیە گەر تایبەتمەندییە رۆشنبیرییەکان بەهەند وەرنەگیردرێن یان بازیان بەسەردا بدرێ، وەك لە زۆربەی فۆرمەکانی بەرهەمی رۆشنبیریی هۆشیاریی ئایدیۆلۆجیی ساختەدا دەردەکەوێ (*Macherey, 1987*). مەترسیدارترین شت کە لەئارادا بێ سووربوونە لەسەر پرسەکانی حەقیقەت و ساختەیی کە پێویستە راڤەکارییە تەمومژاوییەکان خامۆشیان نەکەن و نوقمی شیکردنەوەی ئیستاتیکی و ئایدیۆلۆجییان نەکەن، بەجۆرێك کە بەتەواوی وەلابنرێن.

لەم ڕووەوە دیدوبۆچوونی ماچێری لەگەڵ دیدوبۆچوونی دی مان-دا لە چەندین خاڵی یەکلاکەرەوەدا یەکدەگرێتەوە. هەردوکیان پێیانوایە کارێکی هەڵەیە ئەدەب لە هەموو پێوەرەکانی رەخنەی ئەقلانی و لۆجیکی بەتاڵبکرێتەوە (یان لە بەهاکانی حەقیقەت و ساختەیی). هەردوکیان ئینتمایان بۆ ئەو دیدە ناکۆکە هەیە کە دەچێتەوە بەگژ فەلسەفەی هونەری ئایدیاڵ (یان میتافیزیکی)دا، ئەو فەلسەفەیەی کە پێیوایە بەرزترین شت لە ئەزمونی هونەرییدا لە فەلەکی چەند بەهایەکی ئیستاتیکیی زاتیدا دەسوڕێتەوە، وەك "فۆرمی ئۆرگانی *organic form*"[6]، یان چامەی شیعری بەو پێیەی "ئایکۆنێکی وتراوە *verbal icon*" و "جیهانێکی کۆنکرێتییە *concrete universe*"، هەروەها چەند شتێکی تری لەو بابەتەیە. فەلسەفەی ئەو دیدە رەخنەییە پەنادەبا بۆ بەهاگەلێك بەمەبەستی دورکەوتنەوە لەو فاکتەرە کۆمەڵایەتی و مادییانەی کە هاوڕێی کاری ئەدەبین. دواجار هەردوکیان، بەتایبەتی دی مان، یەکسانی دەسازێنن لەنێوان رەخنەیەك کە نوقمی حوکمی جوانکارییە لەگەڵ جۆرێك لە رەخنە کە جیاوازیی ئەنتۆلۆجی لەنێوان زمان و واقعدا بەهەند وەرناگرێ، بەو پێیەی زمان

جیهانێکە پێکهاتووە لە چەند بنیاتێکی ئەدەبی واتابەخش کە کورتناکرێنەوە بۆ رەوتێك لە دیاردەی بەڵگەنەویست، هەرچی واقعە ئەو شتەیە کە لەبەردەم هەستەوەرەکاندا بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەرجەستەدەبێ بێ ئەوەی پێویستی بە نێوەندێکی زمانەوانی هەبێ. کۆکردنەوەی هەرەمەکی لەنێوان جیهانی زمان و جیهانی واقعدا دەبێتەهۆی وەلانانی ئەو شتانەی کە خودی زمان مەبەستێتی بیانگەیەنێ تا بەهۆیانەوە بەرەنگاری نوسینە نارەخنەیی و زیانبەخشەکان ببێتەوە کە زادەی واقعێکن تەنها لەڕێگەی هەستەکانمانەوە پەییان پێدەبەین، چونکە زمان سێنتەری هێزێکی وەرچەرخاوە یان بوارێکی هەمەڕەنگە کە پەیوەندییە لۆجیکی و رێزمانی و رەوانبێژییەکان لەخۆدەگرێ.

لەم ڕووەوە دەکرێ برگەیەك لە کتێبێکی (ئالتۆسێر *Althusser*) و (بالیار *Baliar*) بەنمونە وەربگرین بەناونیشانی "*Reading Capital, 1970*". ئەو برگەیە هاوڕایە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی خستوومانەتە ڕوو. بەڕای ئەو دوو نوسەرە سپینۆزا یەکەمین بیریارە {کە ئەم پرسەی خستۆتە ڕوو}:

"سپینۆزا یەکەمین کەسە کە کێشەی خوێندنەوە *reading* پاشان کێشەی نوسین *writing* دەوروژێنێ...، یەکەمین بیریارە کە دیدی خۆی و تیۆرەی خۆی دەربارەی رابردوو، دەربارەی مێژوو دەخاتەڕوو، هەروەها دەربارەی ئەو فەلسەفەیەی کە بڕوای بە ئاڵۆزیی ئێستاو تازەگەری هەیە. لەگەڵ ئەودا مرۆڤ بۆ یەکەمین جار توانی گەوهەری خوێندنەوە لەگەڵ گەوهەری مێژوودا لەیەك تیۆرەدا کۆبکاتەوە کە جیاوازی بەهەند وەردەگرێ لەنێوان خەیاڵ و حەقیقەتدا"(ل16).

ئاڵتۆسێرو بالیبار پێیانوایە مارکس، لەسەر بنەمای پۆلێنکردنی سپینۆزا بۆ (هەنوکەو مێژو، خوێندنەوەو نوسین، خەیاڵی و واقعی)، توانیویەتی گەورەترین ئەنجام لەسەر ئاستی تیۆریی بەدەستبێنێ، بەتایبەتی کاتێ جیاکاریی کردووە لەنێوان زانست و ئایدیۆلۆجیا بەبێ ئەوەی بەلای یەکێکیاندا دایبشکێنێتەوە. هەروەها تیۆرەکەی ئەو بەهەمان شێوە پارێزگاریی لە هەمەجۆریی گوتاری رەخنەیی کردووە بەئەندازەی هەمەجۆری لە ئاست و فۆرمەکانی بەرهەمی رۆشنبیری. دواتر هەردوکیان دەگەنە ئەو دەرەنجامەی کە بۆچونەکەیان نایەتەدی گەر "ئەفسانەی دینیی خوێندنەوە لەناونەبرێ"، واتە بەرەنگاربوونەوەی فۆرمەکانی راڤەکاری لەپێناو چەند تەفسیرێکی گۆنوسی کە نوقمی سیمبۆل و میتافۆرن. ئەڵبەتە خوێنەریش ناتوانێ لەو شیکردنەوانە تێبگا مەگەر لەڕێگەی وەحیی یەزدانییەوە نەبێ، یان لەڕێگەی مەعریفەیەکی گوماناوی پێشوەختەوە یان هەر بنەمایەکی دیکەی جیاکاری لای کەسانێکی دیاریکراو. لەبەر هەموو ئەم هۆیانە من وابەستەی ئەو بۆچوونەم کە پێیوایە تێزەکانی سپینۆزا تەونێك لە کەلەپوری فیکری راڤەگەری (تەئویلی) پێکدێنن، ئەو فیکرەی کە لەگەڵ کۆششەکانی پێکەوەگونجاندندا دەستپێدەکا لەنێوان دەقەکانی تەورات و دەقەکانی ئینجیل-دا، پاشان لە چەند ئاستێکی

نوێگەریدا کۆتایی دێ (راڤەگەریی و پۆست بونیادگەری) کە تائێستا هەڵگری مۆرکی ئەو رابردووە دوورەن.

لێرەوە ئەو پەیوەندییە دۆزرایەوە کە ئاڵتۆسێرو بالیبار ئاشکرایانکرد لەنێوان تیۆرەی سپینۆزا دەربارەی زمان (نوسین و خوێندنەوە) و فیکری مارکسی دەربارەی سروشتی مەعریفە مێژووییەکان و فۆرمەکانیان. ئەو پەیوەندییە لە سێ تەوەری سەرەکیدا بەرجەستە دەبێ کە بریتین لە:

1) تێگەیشتنمان بۆ رووداوە مێژووییەکان لایەنگرو ملکەچی رەگەزی کاتە، واتە هەمیشە تێگەیشتنێکی نوقستانە لەئاست پرنسیپ و بیرۆکە دروستەکاندا.

2) هەمان شت بەسەر ئەو مەعریفانەدا جێبەجێ دەبێ کە لەرێگەی زمانەوە پێیاندەگەین، چونکە ئاماژەکانی زمان – کە نوسراوو وتراون– ملکەچی هەموو رێکەوتن و پەیوەندییە رەمەکیەکانن، بەڵام کاتێ ئەو ئاماژانە لە تەرازووی ئەقڵ و لۆجیك دەدرێن دەشێ راستگۆیی خۆیان بدۆڕێنن.

3) ئەو میتۆدەی کە زەینی مرۆڤ لە گەرمەی ئەم خاڵە نێگەتیڤانەدا پێرەوی دەکا بریتیە لە میتۆدی گەڕان بەشوێن ئەو فاکتەرە مێژووییانەدا کە بەرهەمیان هێناون، پاشان پێڕەوکردنی چەشنێك لە رێکخستنی لۆجیکی کە تێگەیشتنی نەرێخواز (سەلبی) دەکاتە تێگەیشتنێکی ئەرێخواز (ئیجابی). ئیدی دەبینین پرسەکانی نوسین و خوێندنەوە رەهەندێکی نوێ لە فیکری سپینۆزا وەردەگرن، جگە لەو پرسانەی کە دەیانخاتەڕوو دەربارەی وتەزا خەیاڵییەکان یان ساختەو دروستکراوەکان، کە دەچنە پلەی سێیەمەوە لە پلەکانی مەعریفە، یان ناوچەیەکی مامناوەندی داگیردەکەن لەنێوان حەقیقەت و ساختەییدا. ئەڵبەتە مەرج نیە ئەو وتەزایانە هەمیشە هەڵگری بەهاگەلێکی نامەعریفی بن، یان بەهاگەلێکی ئیستاتیکی ئەبستراکت.

ئەفراندنی خەیاڵی دەبێتەهۆی تویکردن و پارچەپارچەکردن و لەبێژنگدانی ماتریاڵی هەستەکی، تا بیکاتە ماتریاڵێکی دروست، هەروەها بۆ ئەوەی تینوێتی زەینی مرۆیی بشکێنێ لەپێناو چنگکەوتنی پرنسیپ و بیرۆکە دروستەکان. " هەروەك ئاڵتۆسێرو ماچێری دەڵێن، ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێبدرێ ئەوەیە کە سپینۆزا سوورە لەسەر ئەوەی ماڵە لەگەڵ داهێنانەکانی خەیاڵدا بکا وەك چۆن مامەڵە لەگەڵ قاڵب و فۆرمە مەعریفییە تەقلیدییەکاندا دەکا. هەرچەندە ئەو مەعریفانە شێوێندراون و لایەنگرییان پێوەدیارە، بەڵام خاوەن رۆڵێکی ترسناکن لە پرۆسەی گەیشتن بە پرنسیپ و بیرۆکەو حەقیقەتەکان.

### پەراوێزەکان:

(1) ئەفراندنی خەیاڵی بەشێکە لە داهێنانی نوسەر کە دەیخاتە ناو کاری ئەدەبی یان هونەری، زادەی خەیاڵی پەتییەو پشتئەستور نیە بە لاساییکردنەوەی واقیع یان گێڕانەوەی چەند رووداوێکی باو، وەك هەڵوێستە ئەفسانەییەکان و کارە سروشتبەزێنەکان لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکدا بەگشتی، یان وەك شیعرو جۆرەکانی تری داهێنان.

(2) وەهم ئەو هەستەیە کە دانەری کاری ئەدەبی یان هونەری لای وەرگر دروستی دەکا، لەپێناو گەیشتن بە دۆخێك کە مرۆڤ دەکەوێتە وەهمێکەوە وادەزانێ ئەوەی کە دەیبینێ یان دەیخوێنێتەوە بەشێکە لە واقع، یان وەك کۆلێردج دەڵێ: بۆ ئەوەی خۆی بەئیرادەی خۆی هەستی بەدرۆخستنەوەی شتەکان وەلانێ. وەهم کارێکی هاوبەشە لەنێوان دانەرو وەرگردا، هەرچی دانەرە بەکاریدێنێ بۆ رەواندنەوەی دالغە وەهمیەکانی وەرگر لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراودا، وەك لە فۆرمەکانی گوتاری گێڕانەوەی رۆماندا لە سەدەکانی هەژدەو نۆزدە، یان لە هەندێ شانۆی نوێخوازدا، بەدیدەکرێ.

(3) باشترە لەسەر هەندێ لەم زاراوانە بوەستین کە لای پێڕەوانی هەڵوەشاندنەوە باوەو بەکاردێ. ئەڵبەتە لەسەرو هەموشیانەوە بیریاری فەرەنسی جاك دێریدا:

لۆگۆس *Logose* وشەیەکی یۆنانییەو جۆرێکە لە ئاماژە بۆ گوزارشتکردن لە بیرۆکەیەکی شاراوە. وەك تێرم لۆگۆس ئاماژەیە بۆ راستی *truth* یان ئەقڵ *reason*، بەو پێیەی بنەمای بوونە. لە ئاینی مەسیحیدا وشەکە ئاماژەیە بۆ یەزدان بەو پێیەی بنەمای هەموو شتەکانە. دێریداو شیکارەکانی تری هەڵوەشاندنەوە ئەو تێرمەیان بەکارهێناوە بۆ گوزارشتکردن لە "رەوتی مەرکەزیی لۆگۆس" وەك ئاماژەیەك بۆ ئارەزوی دۆزینەوەی سێنتەر یان بنەمایەکی جێگیر بۆ هەموو ماناو پرنسیپەکان. ئەڵبەتە ئەوەش رەوتێکە کە فیکرو فەلسەفەی خۆرئاوایی لە ئەفلاتۆنەوە جڵەوکردووە، یان وەك تیری ئیگڵتن دەڵێ: لە ئەفلاتۆنەوە تا پەیمانی ناتۆ *From Plato to Nato*. دێریدا داوادەکا مرۆڤ خۆی لەو سەنتراڵیزم (مەرکەزیەت)ە دەربازبکاو پرنسیپی (تاك بنەمای جێگیر) هەڵبوەشێنێتەوە، کە پرنسیپێکە بۆ خۆدزینەوەو رەتکردنەوەی دابەشبوونو جیاوازی لە یەك وشەدا، لەپێناو بنیاتێکی مەرکەزیی داخراودا، یان بۆ ساغکردنەوەی فەلسەفەی "ئامەدەبوونی میتافیزیکی *metaphysics presence*"، کە فەلسەفەیەکی هاوتەریبە لەگەڵ چەمکی نائامادەبوون یان هۆخوازی یان ئەو پرنسیپەی کە پشتئەستورە بەخۆی (یەزدان، حەقیقەت، مرۆڤ). ئەڵبەتە ئاشکراترین ئەو دیاردانەی کە لە "رەوتی مەرکەزیی لۆگۆس"دا هەیە بریتیە لە "مەرکەزیەتی وشەی وتراو *phonocentrism*" کە زمانی "ئاخاوتن *speech*" دەخاتە پێش زمانی "نوسین *writing*"، چونکە قسەکردن بە ئامادەبوونی قسەکەر زەمانەتێکە بۆ بەدیهاتنی بوونو کەماڵی مانا.

بەمجۆرە دێریدا داوای وەلانانی رەوتی مەرکەزیی ئاخاوتن دەکا، واتە وازهێنان لە باڵادەستیی ئاخاوتنی بیستراوو وتراو لەپێناو ئاماژەو نەخشە بینراوەکان یان لەپێناو قسەی نوسراو. دێریدا لە کتێبێکی گرنگیدا بەناونیشانی "لێکۆڵینەوە دەربارەی نوسین *De la gramatologic, 1967*" تیۆریزە بۆ میتۆدێك دەکا کە بەها جیاوازو ناکۆکەکانی توخمەکانی نوسین ئاشکرادەکا. لەو بارەیەوە نمونەیەك دێنێتەوە دەربارەی ئەمجۆرە "جیاوازی"یە لەڕێگەی وشەیەکی فەرەنسییەوە کە بریتییە لە "*diffe'rance*"، ئەو وشەیە ئاماژە بۆ سروشتی دابەشکراوی نیشانەی بینراو دەکا، ئەو نیشانە بینراوەش پیتی (*a*)یە کە لەکاتی وتندا نایبیستین، هەربۆیە واهەستدەکەین مانای *diffe'rance* دەگەیەنێ واتە "جیاوازی" کە لە رەگی فەرمانی "*differer*" وەرگیراوەو تێگەیشتن لێی پەیوەندیی بە (شوێن)ەوە هەیە، بەڵام کاتێ بەنوسراوی دەیبینین بۆمان دەردەکەوێ کە مانای "دواخستن" دەگەیەنێو ماناکەی پەیوەندیی بە (کات)ەوە هەیە نەك (شوێن). کەواتە ئەو مانایەی لەسەر مەرکەزیەتی دەنگ یان قسەی وتراو دادەمەزرێ توخمی "دواخستن *diffe'rance*" پشتگوێدەخا، کە وشەیەکە ماناکەی لەرێگەی نوسینەوە

دەردەکەوێ، بەڵکو تەنها تەرکیز لەسەر توخمی "جیاوازی ***differance***" دەکا کە وشەیەکی وتراوەو هاوتای ئامادەبوونی کەسی قسەکەرە. بەبڕوای وی "نوسین" هاوتای جیاوازییە، بەلام ئاخاوتن هاوتای ئامادەییەکی وەهمییە، پاشان دەکرێ بوترێ کە ئاخاوتن لەراستیدا پشتئەستورە بە "نوسینێکی پێشوەخت"، واتە سیستێمێك لە جیاوازی کە ماناکانی زمان بەرهەمدێنێ.

(4) بریتییە لە کارلێك لەنێوان "نوسین"و "ئاخاوتن"دا، چونکە ئاخاوتن پلەیەکی ئامادەیی کامڵو بالاتر داگیردەکا لەبەرامبەر پلەی نزمی نوسیندا....، فەلسەفەی خۆرئاواییش رژێمێکی فیکریی داپڵۆسێنەری بنیاتناوە بۆ پاراستنی "ئامادەیی میتافیزیکی" کە لە پەراوێزی پێشودا روونمانکردەوە. بەلام هەروەك دێریدا دەڵێ، رەتکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی ئەو رژێمە کارێکی ئاسانە گەر گەمەو فێڵە رەوانبێژیو وتاربێژییەکان ئاشکراو ریسوابکرێن کە زمانی ئاخاوتن دەڕازێننەوەو باڵ بەسەر بایەخی بابەتەکەو هێزی بەڵگەکانیدا دەکێشن. لێرەوە دەبینین هەریەك لە نوسینو ئاخاوتن بەشداری لە کێشانی چەند ئەدگارێکی نوسینئامێزدا دەکەن، چونکە هەردوکیان پێویستیان بە ئامادەیی هەیە، رەتکردنەوەی ئەو رژێمەش قۆناغی یەکەمی هەڵوەشاندنەوەیە لای دێریدا.

(5) گەر "جیاوازی ***diffe'rance***" ئەو بنەڕەتە بێ کە دێریدا لە خوێندنەوەی دەقی ئەدەبیدا پشتی پێدەبەستێ، ئەوا جیاوازی هەڵگری دوو خەسڵەتی سەرەکییە:

یەکەم: جیاوازی لەسەر بنەمای جیاوازیی نێوان نیشانەو هێماو وشەکان دادەمەزرێ، لەوبارەیەشەوە نمونەی (***diffe'rance***)و (***diffe'rence***) هێنرایەوە، ئەڵبەتە ئەو جیاوازییەش جیاوازیی ماناکانی لێدەکەوێتەوە. هەر لەسەر بنەمای ئەو نمونەیەش کە بەشێکی بنەڕەتیی تیۆرەکەیەتی، دێریدا زمانی نوسین دەخاتە پێش زمانی ئاخاوتنەوە، یان نوسراو دەخاتەپێش وتراوەوە.

دووەم: جیاوازی لە وێنەی چەند دوالیزمێکی هاودژدا دەردەکەوێ وەك خێرو شەڕ، سروشتو شارستانیەت، سورو سەوز.. هتد. پەیوەندیی نێوان ئاماژەو بەرئاماژە (دال ومدلول) لەم دوالیزمە هاودژانەدا پەیوەندییەکی نەریتیین، واتە پەیوەندییەکی لۆجیکی نین (وەك پەیوەندیی نێوان "سور"و "سەوز" لە ئاماژەکانی هاتوچۆدا، کە یەکەمیان بەمانای "وەستان"و دووەمیان بەمانای "رۆیشتن" دێ)، چونکە بەگوێرەی سیستێمێکی تایبەتی جیاوازیی نێوان شتەکان ئەو مانانە جێگیر دەبن.

خودی جیاوازی، کە بەگوێرەی شیکردنەوەکەی دێریدا مانا دەبەخشێ بە نیشانەو ئاماژەو وشەو هێماکان، دەبێتە رێگر لەبەردەم ئەوەی کە تاقە ماناو دوا مانایان هەبێ. لەلایەکی ترەوە نیشانەکان، بەگوێرەی سیاق، گۆڕانیان بەسەر دێ، بەلام لەگەڵ هەموو سیاقێکی نوێدا ئاماژە بۆ چەند سیاقێکی پێشوتر دەکەن. بەمجۆرە چەشنەکانی "جیاوازی" لە پەیوەندیی نێوان دالو مەدلولدا کەڵەکەدەبنو تێکدەڕژێنو دەقی ئەدەبیش ئاڵۆزترو لێکدراوتر دەبێ. لێرەوە مانای ئەدەبی دیاریکراوو رۆشنو تەنها نیە، واتە "ناکۆکی" لێدەکەوێتەوە نەك "پێکەوەگونجان"، "هەڵوەشانەوە"ی لێدەکەوێتەوە نەك "پێکەوەلکان". بەلام پێویستە بوترێ کە هەڵوەشاندنەوە لای دێریدا مانای روخاندن ناگەیەنێ، بەڵکو راستتر مانای بنیاتنانەوە دەبەخشێ. هەڵوەشاندنەوە واتە شیکردنەوەی رەخنەیی لەڕێگەی گەڕانەوە بەدوای ئەو توخمانەدا کە لەیەك کاتدا دەکەونە ململانێی ناوەکییەوە لەگەڵ خۆیاندا، هەروەك چۆن

دەکەونــە ململانێــی دەرەکییــەوە لەگــەڵ توخمــەکانی دەرەوەی دەقــدا، بــەڵام دواجــار ئــەو توخمانــە -لــە ڕواڵەتدا- ئاماژە بۆ یەکێتی و پتەویی دەق دەکەن.

(6) فـۆرمی ئۆرگـانی چـەمکێکە کـە کـاری ئـەدەبی دەچـوێنێ بـە بوونـەوەری زینـدو، کـە خـۆی لەناوخۆیـدا گەشەیەکی سروشتی دەکا. ئەم چەمکە لە کۆتاییەکانی سـەدەی هەژدەیەمـدا لـە ئـەڵمانیا سـەریهەڵداو شـاعیرو ڕەخنــەگری ڕۆمــانتیکی ئینگلیــزی ســامۆئیل تیلــۆر کـۆلێردج (1772-1834) بەکاریهێناوە، تا لەڕێگەیـەوە پرۆســەی داهێنــان لــە شــیعردا شــیبکاتەوە، لەســەر بنەمایـەکی سـایکۆلۆجیو ئیـستاتیکیی دوور لـە یاسـا کلاســیکیەکان کــە بەقــسەی کــۆلێردج یاســاگەلێکی میکانیکیی پەتی بوون.

بــەڵام "ڕەخنــەگرە نوێیــەکان"ی ئــەمریکا پــشتیان بەستووە بەم چەمکە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی یەکێتیی کــاری ئــەدەبی زادەی کــۆی بەشــەکانو پێکهاتــە جیاوازەکانـە، کـە مەحاڵـە هـەڵاوێرد بکـرێنو بـەجیاجیا لێکۆڵینەوەیان لەسـەر بکرێ، چونکە فۆرمو ناوەڕۆك لە کــاری ئەدەبیــدا تاقــە قەوارەیەکــە کــە لەیەکێتیــەکی ئۆرگانیدایـە. ڕێچکەی یـەکێتی ئۆرگـانی *organicism* لـە "ڕەخنـەی نـوێ"دا یاسـا کلاسـیکیەکانی کـاری ئـەدەبی ڕەتدەکاتـەوەو دژی ئەوەیـە ئـەدەب دابەشـبکرێ بەسـەر چەند ژانرێکدا، هەروەکچۆن دژی ئەو کارە ڕەخنەییانەیە کــە دەقــی ئــەدەبی پــەرشو شــیدەکاتەوە لەڕێگــەی ڕێچکەیەکی ئەبستراکتی ڕوخێنەرەوە.

### سەرچاوە:

کرستوفر نوریس، الحقیقة والنقد: الأدب و النقد و التـاریخ الادبـي. ت: د. عبـد الحمیـد شـیحة. المجلـس الأعلی للثقافة، ص 102-117.

# ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**هەژموونی هۆشیاری میتۆلۆژی بەسەر هۆشیاری مێژوویدا:**

بەر لەوەی باس لە قەیرانی هۆشیاری ئەوروپی بکەین و ئەوە نیشان بدەین کە چۆن چۆنی دواجار قەیرانێکی وا سستمی مۆدێرنەی لێدەکەوێتەوە، پێویستە بگەڕێینە دواوە بۆ ئەوەی قسە لەسەر ئەوە بکەین کە پێشتر لە ئارەدابووە، واتە قسە لە سەدەکانی ناوەڕاست بکەین. چونکە مۆدێرنە لە ئاکامی دژایەتیکردنی سەدەکانی ناوەڕاست و کێشمە کێش و ململانێ لەگەڵ ئەقڵیەتی ئەو سەردەمانەدا دروست بوو. کەواتە بۆ ئەوەی لەو جەنگە فکریە بگەین کە لە سەروەختی قەیرانی هۆشیاری ئەوروپیدا ڕوویدا، سەرەتا پێویستە بگەڕێینەوە سەر تاوتوێکردنی سستمی فیکر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

شایەنی باسە سەدەکانی ناوەڕاست بەو قۆناغە مێژووییە دەڵێن کە دەکەوێتە نێوان شارستانیەتی یۆنانی – ڕۆمانی و سەردەمی مۆدێرنەوە. ئەگەر بە زمانی ئارکیۆلۆژیستەکان قسان بکەین دەتوانین بڵێین چینی ژێری ژێرەوەی فیکری ئەوروپی، بە شارستانیەتی یۆنانی – ڕۆمانی دەست پێدەکات کە لە سەدەی پێنجەمی پ.ز (سەردەمی سوکرات)وە درێژ دەبێتەوە و تا سەدەی پێنجەمی زایینی (مێژووی هەرەسهێنانی شارستانیەتی ڕۆمانیو سەرکەوتنی مەسیحیەت) دەخایەنێت. پاشان چینی دووەم دێت کە سەدەکانی ناوەڕاستە و بە ڕمانی شارستانیەتی ڕۆمانی لە خۆرئاوا (ساڵی 476) دەست پێدەکات و بە هەرەسهێنانی شارستانیەتی بیزەنتی لە خۆرهەڵات لە سەردەستی تورکەکان (ساڵی 1453) کۆتایی دێت. واتە ئەم قۆناغە هەزار ساڵی خایاندووە. ئەمەش بۆ خۆی لە مێژووی شارستانیەت و تەمەنی میللەتاندا، ماوەیەکی زۆر دوور و درێژە.. لە دوای ئەم قۆناغەشەوە

مۆدێرنە دێت کە تا ئێستا و بۆ ماوەی چوار سـەدەیە بەردەوامە. بەمجۆرە چینەکانی شارستانیەت و قۆناغە ئەپستمۆلۆژیەکان لە سەریەك کەڵەکە دەبن.

بێگومان لە ناو ئەم قۆناغە مێژوویانەدا جیاوازی زۆر هەیە و نابێت ئەم دابەشکاریانە وامان لێبکات، ئەو قۆناغانە بێکێشە و یەکگرتوانە سەیر بکەین. بۆ نمونە لە ناو سەدەکانی ناوەڕاستدا، سەدە دوورەکانی ناوەڕاست و سەدە نزیکەکانمان هەیە، سەدەی ناوەڕاستی ئاست نزم و سەدەی ناوەڕاستی ئاست بەرزمان هەیە. یەکەمیان لە سەدەی پێنجەمی زایینیەوە دەست پێدەکات و تا سەدەی دەو یازدە دەخایەنێت و لە رووی فیکری و زانستییەوە بە تاریکترین و قاتوقڕترین قۆناغ ئەژمار دەکرێت، بەڵام دووەمیان لە سەدەی دوازدەوە (مێژووی رێنیسانسی یەکەمی ئەوروپی) دەست پێدەکات تا سەدەی پازدە و شازدە (مێژووی رێنیسانسی راستەقینەی ئەوروپی) بەردەوام دەبێت. کەواتە ناهەقی دەکەین، کاتێك تەواوی سەدەکانی ناوەڕاست بە سەدەی تاریك و دوژمنی ئەقڵ و زانست ناونوس دەکەین. ئەم وێنە زۆر نێگەتیڤەی لەسەر سەدەکانی ناوەڕاست هەیە، لە سەردەمی رێنیسانس و دواتردا دروست بوو، مەبەستیش لێی ئیدانەکردنی ئەو قۆناغە و خۆ جیاکردنەوە بوو لێی. بەڵام وابۆ ماوەی سێ ساڵێك دەچێت فیکری ئەوروپی خەریکی ئەوەیە ئیعتیبار بۆ ئەو سەردەمە بگێڕێتەوەو هەندێ لایەنی ئیجابی باس بکات، واتە نایەوێت راست و چەپێکی تەواو بەسەر ئەو قۆناغەدا بێنێت. بۆ نمونە مێژونوسی ناسراوی فەرەنسی "جاك لۆگۆڤ" ساڵی 1977 کتێبێکی بە ناونیشانی: (لە پێناو سەدەیەکی ناوەڕاستی دیکەدا)[1]، بڵاوکردەوەو لە ناو توێژەرو لێکۆڵیاراندا هەرایەکی گەورەی نایەوە. "لۆگۆڤ" لەو کتێبەدا داوای کردبوو وێنەیەکی دیکە دەربارەی سەدەکانی ناوەڕاست پێشکەش بکەن، وێنەیەك لە حەقیقەتی مێژوویی و بابەتیەوە نزیك بێت. هەروەها توێژینەوەکانی بیریاری فەرەنسی "ئالن دولیبیرا"[2]، بەم ئاڕاستەیە کار دەکات.

سەرباری ئەم هەولانە بۆ ئیعتیبار گێڕانەوە بۆ هەندێ ماوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەڵام دەتوانین بڵێین لەو کاتانەدا شتێك هەبوو ناوی (ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست) بوو. واتە رستێك خەسڵەت و تایبەتمەندی لە شێوازی بیرکردنەوەو جیهانبینی ئەواندا هەبووە. ئێمە کاتێك بە کەسێك دەڵێین بە ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بیردەکاتەوە، ئەمەی وەك تەشەرلێدانێك پێدەڵێین و مەبەستمان لێی ئەوەیە ئەو کەسە ئەقڵیەتی کۆن و بەسەرچووە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ شتێك بکەم و بڵێم: (ئەگەر لە ئەوروپادا سەدەکانی ناوەڕاست کۆتایی هاتبێت و لەبیرچوبێتەوە ئەوا لای ئێمە هەر بەردەوامە و تا ئێستاش درێژەی هەیە. واتە ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست لای ئێمە بالادەستە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تا ئێستا مۆدێرنە لە ژینگەی ئێمەدا سەرکەوتوونەبووەو نەیتوانیووە بە چاکی شوێن پێی خۆی بکاتەوە. تەشەنەسەندن و گەورەبوونی بزاوتە ئسوڵیەکان لە ئێستادا،

بەڵگەی ئەوەیە سەدەکانی ناوەڕاست لای ئێمە بەردەوامە. تەنانەت ئێمەش کە ڕۆشنبیری مۆدێرنین و لە زانکۆکانی خۆرئاوادا خوێندومانە، تا ئێستاش شتێك لە پاشماوەی سەدەکانی ناوەڕاست لە ناخماندا هەرماوەو نەمانتوانیووە لێی دەربازبین).

جیاوازی نێوان ڕۆشنبیری ئێمەش لەگەڵ ڕۆشنبیری ئەوروپیدا لەمەدایە. واتە ڕۆشنبیری ئێمە لەبەرئەوەی تا ئێستاش لە فەزای سەدەکانی ناوەڕاستدا دەژی، دەتوانێت بە ئاسانی ئاشنای ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بێت و وەکو ڕۆشنبیری ئەوروپی پێویستی بەوە نییە، دەست بە هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی بکات. من بۆ ئەوەی بە سەدەکانی ناوەڕاست ئاشنابم، پێویستم بەخەرجدانی هەوڵێکی زۆرنییە، چونکە تا ئێستا لەو فەزایەدا دەژیم و جێم نەهێشتووە. من چاو نوقاندنێکم بەسەر بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە ئامێزی ئەو قۆناغە. نەخێر، سەدەکانی ناوەڕاست لای ئێمە کۆتایی نەهاتووە. جیاوازی سەرەکی نێوان ئێمە و ئەوروپاییەکانیش لێرەدایە[3].

بالێرە بەدواوە بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا بگەڕێین کە دەڵێت: (ئەو خەسڵەتە سەرەکیانە چین کە تایبەتمەندی مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاستە، یاخود تایبەتمەندی ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاستە؟). "جاك لۆگۆڤ" تایبەتمەندیەکانی ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بەمجۆرە باس دەکات:

1-هەژمونی بیروباوەڕی مەسیحی لەسەر بیرکردنەوەی خەڵکی. لەو قۆناغەدا مرۆڤێك نەبوو لە دەرەوەی چوارچێوەی عەقیدەی مەسیحی بیر بکاتەوە. ڕاستە بیریاری گەورە و فەیلەسوفانی گرنگ هەبوون، بەڵام هەموویان ملکەچی عەقیدەی تیۆلۆژی بوون. بیرکردنەوە بەشێوەیەکی ئازاد و لە دەرەوەی فەزای خوداناسیدا، کارێکی مەحاڵ بوو. ئەقڵ لەو سەردەمەدا ملکەچ و گوێڕایەڵ بوو، فەلسەفە خزمەتکاری زانستی خوداناسی کڵێسا بوو.هەر بۆیە تەواوی تەقەللاکانی فیکر لە دوای سەدەی حەڤدەوە، بۆ ئەوەیە تا لەم قەفەزە دەربازی بێت. وەکو دواتر دەبینین ئەم پرۆسەیە چەندین سەدە دەخایەنێت.

2-وێنەی مرۆڤێکی ڕەشبین و لاواز و ترساومان هەیە، لەوەی گوناه و هەڵە بکات. بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست ئەم وێنەیەی مرۆڤ لە ئارەدا بوو. بێگومان لە سەدەی پێنجەمەوە تا سەدەی یانزەو دوانزە، وێنەکە زۆر تاریکتر و ڕەشتر بوو، بەڵام دواتر و بە هۆی بڵاوبوونەوەی زانست و ئەقڵانیەت و کلتوری یۆنانیەوە، ئەم وێنەیە کەمەکێك گۆڕانی بەسەردا هاتووە، وایلێهات مرۆڤ بەرە بەرە باوەڕی بە خۆی پەیدا دەکرد. بە کورتیەکەی مرۆڤی مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا موبتەلای گوناهی یەکەمین بوو، نەشیدەزانی چۆن چۆنی لە دەستی قوتاربێت و خۆی ڕزگار بکات.

3-نەفرەت کردن لە ژیان و سەیرکردنی وەك وێستگەیەك بۆچوون بەرەو ژیانی ڕاستەقینە لەوە دنیا. واتە مرۆڤ نەدەبوو چێژ لە خۆشیەکانی ژیان ببینێت، چونکە هەژاری و نەداری مرۆڤیان لە یەزدان نزیك دەکردەوەو دەوڵەمەندبوونیش نیشانەی دوورکەوتنەوە بوو

لـە یـەزدان. واتــە لــە ســەدەکانی ناوەڕاســتدا هـــەژاری عەیبـــە نـــەبوو، بـــەڵکو نیـــشانەی خواپەرستی و نزیکبوونەوە بوو لە خودا. بۆچی بایـــەخ بـــەم دنیایـــە بـــدرێت و خـــەریکی کۆکردنەوەی پارەو سامان بین، گەر بزانین ئەم ژیانـە کاتیـە و ژیانی راستەقینە لـەوە دنیایـە؟ مرۆڤ تا توشی نارەحەتی و چەرمەسەری بوایە، هەستی بە بەختـەوەری زیـاتر و زۆرتـر دەکـرد، چـونکە ئـەوەیان بـە نیشانەی ئـەوە دەزانـی کـە خوا ئەو مرۆڤە تاقی دەکاتـەوەو گەر رازی بوو، ئـەوا لـەوە دنیا قـەرەبووی بۆ دەکاتـەوە. ئـەوەی مرۆڤـی سـەدەکانی ناوەڕاسـت زیـاد لـە هـەر شـتێکی دی ترسـی لێـی هـەبوو، ئـەوە بـوو خـوا لێـی خـۆش نـەبێت و لـە رۆژی قیامەتـدا بـەر رەحمـەت و عـەفوی ئـەو نەکـەوێت. لەبەرئـەوە هەمیـــشە نیگـــەرانی چارەنووســـی خـــۆی و پاشەرۆژی بوو.

4-هـەژموونی ئەقڵیـەتی رەمـزیو فـەنتازی لەسـەر هۆشـیاری خـەڵکی. واتـە مرۆڤـی ئـەو سەردەمە زۆر زوو باوەڕی بەو شتانە دەکرد کە باسدەکران و ئـەو شـتانەش چـەند لـە واقیعـەوە دوور بوونایــە، خــەڵك زیــاتر پێیــان سەرســام دەبــوو. کاریگـــەری ســـیحر و جـــاد و لێـــرەوە سەرچـاوەی دەگـرت. ئـەوەی لـەو قۆناغـەدا زاڵ بـوو هۆشـیاری میتۆلـۆژی و رەمـزی بـوو، نـەك هۆشـیاری مێـژوویی و واقیعـی. ئەمـەش تـەواو پێچەوانەی مرۆڤی مۆدێرنە کە زیاد لە پێویست مرۆڤێکی واقیعی و زانستخوازە. بۆ ئـەوەی لـە سستمی فیکری سەدەکانی ناوەڕاست تێبگەین، پێویـستە بـزانین ئـەو سـستمی بیرکردنـەوە بـە شـێوەیەکی گـشتی تـا سـەدەی دوازدە، لەسـەر بنەمای بەڵگەنەویستەکانی تیۆلۆژیای مەسیحی بەنـدبوو. دوای ئـەوە فەلـسەفەی "ئەرســتۆ" دێـتو دەبێتـە دووەمـین سەرچـاوەی رەوایـەتی پێدانی مـەعریفی. "ئیتیـان گیلـسۆن" یـەکێك لـە گـەورە مێژوونووسـانی فەلـسەفە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا، دەڵێـت: (وەك چـۆن لـە ئێـستادا دەبێت فیکری فەیلەسوف لەسەر بنەمای گشتی زانستە مێـژویی و کۆمەڵایەتیـەکان دامـەزرابێت، ئاوەهـاش لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا فیکـری فەیلەســـوف لەســـەر بنـــەمای عەقیـــدەی تیۆلۆژیـــای مەســـیحی بەنـــدبوو. مـــرۆڤ لـــەو سـەردەمانەدا لـە جیهـانی بیروبـاوەڕی ئاییینیـدا دەژیــا، وەك چــۆن ئێمــە ئێــستا لــە جیهــانی زانستو تەکنۆلۆژیادا دەژین)[4].

"ئــەلبێرتی مــەزن" و "رۆجــی بیکــون" و تـەواوی فەیلەسـوفە مەسـیحیەکانی دیکـە، لـەم سیاقەدا بیریان دەکردەوە و جیهان بینی خۆیان دادەڕشت. ئەمانە وەك واقعێکی ئایینی سەیری دنیایــان دەکــرد و نەیانــدەتوانی لــە دەرەوەی ئەوەدا مەزندەی بکەن. بەڵام کاتێك زانستی نوێ دێت، هەموو پیرۆزییەك لەبەر واقیع دادەماڵێ و وەکو موقەدەسێك لە دنیا ناڕوانێت. هەر بۆیە لە سـەرەتادا دۆزینـەوە زانستیەکان، وەکو کوفر و کەیاســێك ســەیر دەکــران. بــۆ ئــەوەی بــزانین تیۆریای مەعریفەی سەدەکانی ناوەڕاست چۆن بـووە، دەبێـت بـە تیۆریـای زانـستی سـەردەمی مـۆدێرنی بـەراورد بکـەین. مرۆڤـی مـۆدێرن وا سەیری زانست دەکات وەکو ئەوەی کەشفکردن بێت، واتە پەیبردن بێت بە نەزانراوێك و تەنها لە رێی گەڕان و سۆراخکردنەوە پێیبگات، ئەمەش پێویـــستی بەوەیـــە لـــە لابوورەکانـــدا بکەوینـــە

تویکاریکردنی، بۆ ئەوەی لە حەقیقەت و پێکهاتەی ناوەکی شتەکان حاڵی بین. نابێت تەنها بەڕوکەشی شتەکان ئیکتیفا بکەین و حەقیقەتیان لە روکاردا ببینین. یەکەمین پرانسیپی فەلسەفەی زانست (یاخود ئەبستمۆلۆژیا) پێمان دەڵێت: (پێویستە دەستبەرداری ئەو زانیاریە روکەشانە بین کە بەشێوەیەکی هاکەزایی لەسەر شتەکان پێمان دەگات و هەوڵبدەین مەعریفەیەکی زانستی راستەقینەمان لە سەریان دەسگیر بێت، کەواتە پرۆسەی زانین بەر لە دروستکردن و بونیادنان پێویستی بە روخاندنە).

مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست لە رواڵەتی شتەکان رادەما و باوەڕی پێدەکردن، واتە تەنها بەسەیرکردنیان وایدەزانی ئاشنابووە پێیان و تێیان گەیشتووە، بەڵام هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە شتەکان لێك شیتاڵ بکات یاخود تویکاریان بکات تا بگاتە حەقیقەتیان. ئەم مرۆڤە پێیوابوو تەنها بە خوێندنەوەی دەقەکان، دەتوانێت بگاتە حەقیقەتی تەواو و مەعریفەتێکی پڕاوپڕی لەسەر جیهان هەبێت، چونکە وایدەزانی هەرچی هەقیقەتە لەبیر و باوەڕ و یاسای ئاینی مەسیحیدایە. "رۆجێ بیکۆن" تەواوی ئەم شتانە بەمجۆرە دەخاتە روو: (تەنهایەك زانستی تەواو و پڕاوپڕ هەیە کە خوا بە مرۆڤی بەخشیووە، ئەویش بۆ ئەوەی بگاتە تاکە ئامانجێك: کە سەرفرازیە لەوەدنیا و شادبوونە بە بەهەشت و ژیانی هەتاهەتایی. هەموو ئەم زانستەش لە ئینجیلدا هەیە، بەڵام پێویستە لە رێی فەلسەفە و یاسای کڵێساوە شرۆڤە بکرێت و لێکبدرێتەوە، هەرچی شتێکیش لەگەڵ ئەم زانستە پیرۆزەدا نەگونجێت و نامۆ بێت پێی، هەڵەیە و بێمانایە)[5].

ئەم تێزەیە بەسەر تەواوی ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵ بوو، هەر بە ناوی ئەمیشەوە دادگاکانی پشکنین دوای سێ سەدە لەوە، "گالیلۆ"یان تاوانبارکرد و زیندانیان کرد. مانای ئەم تێزەیە ئەوەیە کە حەقیقەت لە جیهانی واقیعدا نییە، بەڵکوو لەناو تێکستەکاندایە و هەر هەمووی لەناو ئەو دەقانەدا پەنهانە. بۆ ئەوەی بەو حەقیقەتانەش بگەین، هێندە بەسە کە بزانین چۆن ئەو تێکستانە دەخوێنینەوە و چۆن چۆنی راڤەیان دەکەین. لێرەوە پێویستە ئەو سێ زمانە بزانین کە تەورات و ئینجیلیان پێنوسراوە (لاتینی، یۆنانی، عیبری). ئەڵبەتە مەعریفە و فزوڵی مەعریفی ئامانج نەبوون، ئەوەی ئامانج و مەبەست بوو بۆ مرۆڤ، ئەوەبوو بتوانێت لەوە دنیا رۆحی خۆی قوتار بکات و سەرفرازبێت. ئەم جیهانبینییە لای مرۆڤی مۆدێرنی ئەوروپایی رەونەقی نەماو ئاوا بوو. تەنانەت مرۆڤی ئەوروپی ئەمڕۆ، بڕوای نییە بەوەی دنیابینیەکی لەو جۆرە بە درێژایی چەند سەدەیەك کارابوو بێت و خەڵکانێك هەبووبن باوەڕیان پێکردبێت..

ئێمە بۆئەوەی لە سەدەکانی ناوەڕاست تێبگەین، دەبێت ئەو راستیە بزانین کە مەعریفەی تیۆلۆژی لەو قۆناغەدا لەسەرو هەموو شتێکەوە بوو، بەڵام لە سەردەمی نوێدا زمانی ماتماتیك و میتۆدی زانستە ئەمبرکیەکان لە ریزی پێشەوەدان.

ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست ئەقڵیەتێکی سیمبۆلیزمییە، واتە سمبوڵ و نیشانەکان لە هەموو جێ و شوێنێکدا دەبینێت. هەموو شتێك لە سروشت و مرۆڤدا بەڵگەیە بۆ خوڵقاندن و ئەفراندنێکی جوان و قەشەنگ، واتە هەموو شتێك رەمزە بۆ شتێکی دیکە کە لە پشتیەوەیەتی. ئەو شتانەی لە خوارەوە لەسەر زەوین، لەو شتانە دەچن کە لە ئاسمانە بەرزەکاندا هەن. لەمبارەیەوە یەکێك دەڵێت: (شتێك نییە دیار و بەرجەستە بێت و ئاماژە نەبێت بۆ شتێکی هیولایی و نادیار). یەکێکی دی دەڵێت: (ئەم جیهانە واقعیە هەمووی کتێبێکەو بەدەست و پەنجەی خالق نوسراوە). بۆ ئەوەی لە جیاوازی نێوان دنیابینی سەدەکانی ناوەڕاست و دنیابینی مۆدێرن تێبگەین، دەتوانین نمونە بە "گالیلۆ" بێنینەوە کە یەکەمین زانایە بە مانا مۆدێرنەکەی. "گالیلۆ" دەڵێت: (کتێبی گەورەی سروشت بە هێڵی راست یان بەشێوەی سێگۆشە و بازنەیی یاخود بە شێوازی ئەندازەیی جۆراوجۆر نوسراوە. لەبەرئەوە مرۆڤ هێندەی بەسە کە فێری زمانی ماتماتیك بێت تا بزانێت چۆن دیاردە سروشتیەکان راڤە دەکات و ئیتر پێویستی بەوە نابێت بگەڕێتەوە سەر کتێبی کەلەپوور و تێکستە کۆنەکان).

## چەند خەسڵەتێکی سەرەکی دیکەی ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست:

سستمی پەروەردە و خوێندن لە فەرەنسا و تەواوی ئەوروپادا، رووبەرێکی بچوك و دیاریکراوی بۆ سەدەکانی ناوەڕاست تەرخانکردووە، وەکو ئەوەی بیانەوێت ئەو قۆناغە لەبیر خۆیان بەرنەوە. راستیەکەی ئەو وێنە باوەی دەربارەی ئەم قۆناغە هەیە، ئەوەیە کە سەردەمێکە لەسەر ئاستی زانستی و فیکری هیچ شتێکی تێدا روینەداوە. ئەم بۆچونەش دوای سەرکەوتنی مۆدێرنە، بوو بە قەناعەتێکی حاشا هەڵنەگر. ئەگەرچی لە سەدەی حەڤدە و هەژدەدا دان بەوەدا دەنرا کە سەدەکانی ناوەڕاست هەبووە، بەڵام وەکو قۆناغێکی لێڵ و تاریکی بەر لە مێژوو هەبووە. ئەم قۆناغە ئەنگوستە چاوەش قۆناغی نوستنی ئەقڵە. سەردەمی رێنیسانسیش لەسەر ئەو بنەمایە خۆی بەیانکرد کە سەدەکانی ناوەڕاست قۆناغێکی تاریکە و هەوڵی ئەوان بۆ ئەوەیە، پەیوەندی لەگەڵ سەرچاوە مەعریفی و ئەدەبیەکانی سەردەمی یۆنانی و رۆمانیدا دروست بکەن. واتە ئەوان بازیان بەسەر هەزار ساڵی سەدەکانی ناوەڕاستدا دا، بۆ ئەوەی ئاوێزانی "ڤیرجیل" و "ئەفلاتۆن" و "ئەرستۆ" بن. شاعیری فەرەنسی "لوکۆنت دولیل" (1818–1894) بەمجۆرە وەسفی سەدەکانی ناوەڕاست دەکات و دەڵێت: (ئای لەو سەردەمە دزێوانەی تیۆلۆژیای مەسیحی و بڵاوبوونەوەی گولی و پەتاو برسیەتی). ئەمەی لە گەرمەی سەدەی نۆزدەدا بوو، واتە لەو کاتانەدا بوو کە تەرێزکردن لە سەدەکانی ناوەڕاست گەیشتبووە لوتکە و مۆدێرنەی پۆزەتیڤستیش لە هەڵکشاندابوو. هەر سەبارەت بە سەرکۆنەکردنی سەدەکانی ناوەڕاست، "ولیام ویوێل" مامۆستای زانکۆی کامبریدج لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا دەڵێت: (ئەمێستا

باس لە ماوەیەکی دوورودرێژ و قات و قڕی زانست دەکەین، باس لەو ماوەیە دەکەین کە دەکەوێتە نێوان هەوڵی زانستی یۆنانییە کۆنەکان و تەقەلای زانستی ئەوروپای مۆدێرن، ئەم قۆناغەش سەردەمی داکشان و بە بنبەست گەیشتنی زانستە)[6].

ئەم بۆچوونە دەرهەق بە سەدەکانی ناوەڕاست شتێکی تازە نییە و بە وتەی "جۆرج گۆسدۆرف"[7]، (کە لێرەدا وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی پشتمان بە نوسینەکانی بەستووە) لە ساتەوەختی "فرانسیس بیکۆن"ەوە زۆر دووبارە بۆتەوە.

وەکو ئاشکرایە "فرانسیس بیکۆن" (1561–1626) لەگەڵ "گالیلۆ" و "دیکارت"دا، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی زانستی نوێ و لە سەردەمی رۆشنگەریدا رەواجی زۆری پەیداکرد و ئینسایکلۆپیدیستەکان بە (مەزنترین و لێهاتووترین فەیلەسوف) دایانە قەڵەم. تەنانەت لە "دیکارت"یشیان پێباشتر بوو، ئەگەرچی "دیکارت" وەکو خۆیان فەرەنسی بوو. شایانی باسە مەرجەعی گەورەی فەیلەسوفانی رۆشنگەری فەرەنسی، ئینگلیزی بوون. لەبەرئەوەی ئنگلتەرا بەر لە وڵاتانی دیکەی ئەوروپی پێینایە قۆناغی مۆدێرنەوەو لە رووی زانستی و فەلسەفی و پیشەسازیشەوە، بەر لە هەموویان بە خۆی راگەیشت و دەستی پێکرد. دواتر فەرەنسا و ئەڵەمانیا دەستیان پێکرد. بەڵام لەگەڵ ئینگلتەرادا وڵاتێکی ئەوروپی دیکەش دەستی پێکرد کە رۆڵێکی گرنگی لە بەرفراوانکردنی ئازادی فیکر و رۆشنگەریدا گێڕا، ئەو وڵاتەش هۆڵەندابوو.

جارێکی دیکە "ویلیام ویویل" دەربارەی سەدەکانی ناوەڕاست دەڵێت: (لەو وەختەدا بیرو بۆچوونی خەڵك تاریك و دواکەوتوو بوو. توانای بەراوردکردنیان لە نێوان پرانسیپە گشتیەکان و هەقیقەتی واقعدا، لاوازبووبوو. ئەمانە بەهۆی ونبونیان لەناو چەمکە هیولایی و ناواقعیەکاندا، هەوڵ و کۆششەکانیان بە هەدەر دەچوو)[8].

بیرو بۆچوونی خەڵك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا شپرزەو مۆلەق بوو، بیرکردنەوەیان کلۆمدرابوو. دەمارگیر و دۆگماتیست بوون. هاوکات لە غەیبیانیەتدا نقوم بوو بوون و لە واقیع بە دوور بوون. لێرەوە فەلسەفەی نیو – ئەفلاتۆنیزم و زانستی کیمیاو جادووگەریی و سۆفیگەرێتی بیرو بۆچوونی خەڵکیان داگیرکرد. رێبازی سۆفیزمیش دژ بە هەڵوێستی زانستی بوو. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین سەدەکانی ناوەڕاست لە رووی روناکبیریەوە، سەردەمێکی تاریك و ناهەموار بوو. سەدەکانی ناوەڕاست نەك هەر نەیتوانی هیچ شتێکی نوێ بخاتە سەر کایەی زانست و پێشکەوتن، بەڵکو تەنانەت نەشیتوانی دەسکەوتی سەدەکانی رابردووش، بە تایبەت زانست و فەلسەفەی یۆنانی بپارێزێت. خەڵکی سەدەکانی ناوەڕاست لەو قۆناغەدا، زانست و زانیاریان لە دووتوێی ئەو کتێبە زەردانەدا دەردەهێنا کە تۆزیان لەسەر نیشتبوو، نەك لە سەرنجدانی سروشت و ئەزمونکارییەوە پێیبگەن. بەڵام بابزانین کێ لەو هەلومەرجە بەرپرسیارەو کێ بۆتە بایسی ئەوەی، بە درێژایی هەزار ساڵ بزاوتی بەرەو پێشچوونی زانستی رابگرێت؟

بێگومان ئەوەی لەو هەلومەرجە بەرپرسیارە کڵێسای مەسیحیە، لەبەرئەوەی تەواوی کایەی رۆشنبیری ئەو کۆنترۆڵی کردبوو. هەروەها تاکە خوێنەوارانی ئەو سەردەمە پیاوانی ئایینی بوون. هەر بۆیە کاتێك فەیلەسوفانی رۆشنگەری پەلاماری کڵێسایاندا، رەخنەکانیان ئاراستەی پیاوانی ئایینی کرد و ئەوانیان بە دوژمنی سەرسەختی ئەقڵ دایە قەڵەم. تەواوی ماڵوێرانی و نەهامەتیەکانیان خستە ئەستۆی ئەوان، چونکە ئەو کلتورەی ئەوان لە کۆمەڵگەدا رەواجیان پێدەدا، کلتورێکی کۆن و تەقلیدی بوو. کلتورێك بوو رابردوو خواز و کوشتەی وەعز و موجیاریکردنی ئەخلاقی بوو، نەك دەربایسی زانست و مەعریفە بێت. پیاوانی ئاینیی هەرگیز گرنگیان بە زانستی ئەزمونگەری نەدەدا و کارێکی واشیان بە دەسکاریکردنی ئیشی خوا دەزانی، ئەوان لە بری سەرنج و پشکنین و تاوتوێکردنی شتەکان، خەڵکیان هاندەدا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ تێکستە ئاینییەکان و ملکەچی ئەو دەقانەبن، چونکە پێیانوابوو هەموو راستیەکان لە دووتوێی ئەو دەقانەدان و ئیتر ناکرێت هیچ شتێکی نویٰ بێتە ئارا.

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا توێژەری ئەمریکی "ئەندرۆ. د. وایت"، کتێبێك بەم ناونیشانە دەنووسێت: (مێژووی جەنگ لە نێوان زانست و تیۆلۆژیا لە جیهانی مەسیحیدا)[9]. توێژەر دەیەوێت ئەو شەڕە بێئامانەمان نیشان بدات کە فێندەمێنتالیزمی مەسیحی لە دژی زانست بەرپایکرد، بۆ ئەوەی رێگە لە بڵاوبوونەوەی بگرێت. وەکو نمونەیەکیش باس لەوە دەکات کە چیان بە "رۆجیٰ بیکۆن"کرد. "بیکۆن" لە ماوەی ساڵانی 1214 بۆ 1294دا ژیاوە. ئەم بیریارە بلیمەتێکی هێندە مەزنبوو، گەر کڵێسا لێبگەڕایەت شۆڕشی زانستی زۆر زوتر رویدەدا، بەڵام ئەفسوس دادگاکانی پشکنین ئەو هەوڵەیان پەکخست و نەیانهێشت پڕکێشی زیاتر بکات. لە کۆتایی کتێبەکەشیدا "ئەندرۆ. د. وایت" لیستێکی دوورودرێژ بەناوی ئەو زانایانە دەخاتە روو کە پاپاکانی رۆما و دادگاکانی پشکنین تاوانباریان کردوون، تەنها لەبەرئەوەی بیریان لە بەرەو پێشبردنی زانست کردۆتەوە.

بێگومان ئەم سەرکۆنەکردنە هەمەلایەنەی سەدەکانی ناوەڕاست، بەلای کەسانێکەوە پەسەند نییە کە پێیان وایە مەسیحیەت ئەو نەیارە سەرسەختەی فیکری ئازاد نەبووە و کاریشی هەر بە تەنها بەرگرتن نەبووە بە زانست وپێشکەوتن، ئەمانە وێنەیەکی دیکەی مەسیحیەتیان لایە، جیاواز لەو وێنەیەی دوای سەردەمی رۆشنگەری و سەرکەوتنی مۆدێرنە هاتە ئاراو پێیان وایە سەدەکانی ناوەڕاست، بەیەکجارەکی دەستبەرداری تاقیکردنەوەی زانستی و سەرنجدانی واقعی دیاردە سروشتییەکان نەبووە. هەروەها هەندێك لێکۆڵیاری دیکە لەو راستیە ئاگادارمان دەکەنەوە کە (زانستی یۆنانی بە ماوەیەکی زۆر بەر لە هاتنی ئایینی مەسیحیەت، مەحف بوو بووەوەو نەمابوو). کەواتە مەسیحیەت لە وەستان و بەرگرتن بە پێشکەوتنی زانست بەرپرسیار نییە. شایەنی باسە زانستی یۆنانی

بۆ ماوەیەکی کەم دەرکەوت (بە تایبەت لە سەردەمی ئەرستۆدا)، پاشان بەهۆی سەرکەوتنی ئەفسانە بەسەر ئەقڵدا لە کۆتاییەکانی سەردەمی یۆنانی – رۆمانیدا، پوکایەوەو نەما. کەواتە سەدەکانی ناوەڕاست زانستی نەکوشتووە، بەڵکو لەسەر هەمان رەوتی پێش خۆی مامەڵەی لەگەڵ زانستدا کردووە. ئەی کەواتە بۆچی لەو مەسەلەیەدا هەر بە تەنها سەدەکانی ناوەڕاست و مەسیحیەت تاوانبار دەکەین؟ بۆچی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی تاوانبار ناکەین کە ئیمپراتۆریەتێکی مەسیحی نەبوو، بەڵکو بتپەرستی بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکی سەرباری زانستی "ئەرستۆ" نەخست؟

ئەوەی راستی بێت لە خۆرئاوا دوو بۆچونی پێچەوانە لەسەر سەدەکانی ناوەڕاست هەیە: بۆچونێکیان تا ئەوپەڕی بە چاوی سوك سەیری دەکات و پێیوایە هەر هەمووی تاریکی بووە، لەگەڵ ئەو بۆچونەی سەرسەختانە داکۆکی لەو قۆناغە دەکات و بەتاسەی سەرلەنوێ گەڕانەوەیەتی. ئەوانەی دژایەتی سەدەکانی ناوەڕاست دەکەن، ئەو زۆرینە عەلمانیەن کە لە دوای سەردەمی رۆشنگەری دروست بوون و لە سەدەی نۆزدەدا واقعی کۆمەڵگەی ئەوروپیان کۆنترۆڵکرد، بەڵام ئەوانەی داکۆکی لێدەکەن ئەو کەمینە مەسیحیەن کە دڵخوازی ئەو سەردەمە بەسەرچووەن و داخ لەوە دەخۆن کە دەسەڵاتی مەسیحیەت لە وڵاتەکانیاندا لاواز بووە.

لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکانی ئەوروپادا تا ئێستاش گروپ و رێبازی مەسیحی چالاك هەیە کە دەیەوێت لە بەرامبەر مۆدێرنەدا، پێگە و بەهاکانی خۆی بپارێزێت و دەستبەرداریان نەبێت، بەڵام هەموو ئەمانە مۆدێلێکی مەسیحی تازەن و تەواوی ئەو دەسکەوتە فەلسەفی و زانستیانەیان قبوڵە کە لە سێ سەدەی رابردوودا بەرهەم هاتووە. بێگومان ئەم گروپانە گەر هەڵوێستیان وانەبوایە، تیا دەچوون و ئاسەواریان نەدەما. ئاقاری فێندەمێنتالیزمی پەڕگیر، لەبەرئەوەی سەرسەختانە دژایەتی دەسکەوتەکانی سەردەمی نوێی کرد و بەگژ دۆزینەوە تازەکاندا چووەوە، بۆیە چوونەوەیەك و بەشێوەیەکی بەرچاو بچوك بوونەوە. هەرچۆنێك بێت مەسەلەی زانست و کارەکتەری زانا وەکو ئەوەی لە سەدەی حەڤدەهەمدا فۆرمەلە بوو (سەدەی گالیلۆ و کیبلەر و دیکارت)، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نەبوو. ئەمەش بۆخۆی راستیەکی حاشا هەڵنەگرە..

ئەڵبەتە نابێت ئێمە لۆمەی سەدەکانی ناوەڕاست لەسەر شتێك بکەین، کە نەیتوانیووە تێی بگات یاخود بیرکردنەوە لێی کارێکی مەحاڵ بووە! باوریا بین و نەکەین بۆچوون و وتەزاکانی سەردەمە نوێیەکان بەسەر سەردەمانی رابردوودا بسەپێنین، چونکە ئەمە بۆ خۆی هەڵەیەکی مێژوویییە و گەورەترین تاوانێکە کە مێژوونووس بیکات. راستیەکەی زانستی نوێ وەختێك دروست بوو کە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و لەگەڵ جیهان و یەزداندا گۆڕانی بەسەرداهات. ئەم گۆڕانکاریە رادیکالیانەش دەبوو رووی بدایە، بۆ ئەوەی زانستی نوێ بهاتایەتە ئاراو دروستبوایە. واتە دەبوو جیهانی سەدەکانی ناوەڕاست و سستمە فیکری و کایە ئەپستمۆلۆژیەکەی دارمانایە،

ئەو كات زانستی نوێ لەدایك دەبوو. لێرەدا جارێكی دی پێویستە خەسڵەتە سەرەكیەكانی سەدەكانی ناوەڕاست باس بكەینەوە:

ئەوەی بەسەر ئەقڵیەتی خەڵكی سەدەكانی ناوەڕاستدا زاڵ بوو، ئەو ترس و دڵەڕاوكێ و نیگەرانیە بوو كە لەسەر ئاستی مادی و مەعنەوی دەیانچەشت. لە رووی مادیەوە، سستمی فیودالی سەركوتی كردبوون و كارەساتە سروشتیەكانیش دەیتوانی هەرچی بەربومیانە لە ناوی ببات، بەبێ ئەوەی بتوانن لە بەرامبەریدا هیچ بكەن. واتە خەڵكی بەردەوام لەبەردەم مەترسی برسیەتی و پەتای كوشندەدا بوون، بە تایبەتی پەتای تاعون. ئەم پەتایە دەستە دەستە لێی دەكوشتن و هەر گوندێك توشی بوایە دەبووە وێرانە خاك. لە رووی مەعنەویشەوە كەس دڵنیانەبوو، سەرەڕای ئەو هەموو نوێژو دوعاو خێر و خێراتەی دەیانكرد. لە سەدەی سیانزەدا، یەكێك لە پیاوانی ئایینی مەسیحی دەڵێت: (لە رۆژی دوایدا لە كۆی سەد هەزار كەس، یەك كەس رزگاری دەبێت و بەهەشت دەبینێت و ئەوانی دیكە هەموویان چارەنووسیان ئاگری دۆزەخ دەبێت). تەنها بیركردنەوە لەم مەسەلەیە بەس بوو بۆ ئەوەی مرۆڤی مەسیحی بتۆقێنێت و نەهێڵێت بە ئارامی چاولێك بنێت. لەبەرئەوە بۆ دڵنیایی خۆیان سەردانی گۆڕ و مەزاری پیاو چاكانیان دەكرد و هەرچیان لە دەست بهاتایە دەیانكرد بەخێر، بۆ ئەوەی لە رۆژی دوایدا "مەریەم" یاخود یەكێك لە قەشەكان شفاعەتیان بۆ بكەن. هەندێ لە پیاوانی ئایینی توانیان ئەم هەلە بقۆزنەوەو لەسەر حسابی ئەو خەڵكە بێچارەیە، خۆیان دەوڵەمەند بكەن و سەروەت و سامانێكی بێشومار كۆبكەنەوە. هەروەها –صكوك الغفران– بە هەموو جێ و شوێنێكدا بڵاوبووەوەو بەهۆی ئەمەشەوە پاپاو قەشە و پیاوانی ئاینی دەوڵەمەندبوون. بێگومان ئەم مەسەلەیە بووە مایەی ئەوەی "لۆتەر" هان بدات تا شۆڕشە بەناوبانگەكەی رابگەیەنێت و دەست بە بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بكات لە ئەوروپادا.

خەڵكی سەدەكانی ناوەڕاست لە هەموو نوێبونەوەیەك دەترسان و وەك شتێكی شەیتانكردانە سەیریان دەكرد. كڵێساش لەسەر پێ بوو بۆ سەركۆنەكردنی هەموو داهێنانێك. بۆ ئەم مەبەستەش ئۆفیسێكی تایبەتی بۆ پشكنین كردبووەوە كە مەبەست لێی رێگرتن بوو لە هەموو داهێنان و شتێكی مۆدێرن. كلێسا بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ كەوتە دژایەتیكردن و سەركۆنەكردنی، هەموو پێشكەوتنێكی فیكری تەكنۆلۆژی[10].

## مشتومڕی گەورەی نێوان ئەقڵ و ئیمان:

نابێت پێمانوابێت تەواوی سەدەكانی ناوەڕاست لە ژێر هەژموونی ئەقڵیەتی میتۆلۆژی و خورافیدا بووە. ئەمە رەنگە بۆ ئەو ماوەیە راست بێت كە دەكەوێتە نێوان سەدەی پێنجەم و دەیەم، بەلاَم لە قۆناغی دووەمی سەدەكانی ناوەڕاستدا كە لە سەدەی یانزەوە تا سەدەی چواردە دەخایەنێت، بارودۆخەكە گۆڕانی بەسەردا دێت. شایەنی باسە ئەقلاَنیەت لە سەدەی دوانزەوە هاتە ناو ئەوروپاوە و لە سەدەی سیانزدەدا گەیشتە ئەوپەڕی، پاشان لە

هەڵکشاندابوو تا گەیشتە سەردەمی ڕێنیسانس لـە سـەدەی شـازدەهەمدا. کەواتـە سـەدە زۆر تاریك و ئەنگوستەچاوەکان، ئەو سەدانەن کە لـە سەدەی پێنجەمی زایینیـەوە دەست پێدەکەن و تا سەدەی یازدە دەخایەنن. مرۆڤی ئـەورووپی تا بەراییەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری، واتە تـا ئـەو کاتـەی ئەقلانیـەت چەسپی و بەیـەکجاری ڕەگـی داکوتا، مرۆڤ هـەر لـە ژێر کاریگـەری ئەفسانە و خورافـەدا بـوو. ئـەوەی بـەر لـەو ماوەیـە خـۆی لـەو دنیابینیـە قوتـار کردبـوو، تـەنها دەسـتە بـــژێرە خوێنـــدەوار و ڕۆشـــنبیرەکەبوو، نـــەك تەواوی هاوڵاتیان.

لەگەڵ دەسپێکردنی ئەقلانیـەتی فەلسەفیدا، بـۆ یەکـەمجار زانکۆکـانیش لــە ئــەورووپادا دامەزران و شـارەکان گەشـەیان کرد و بازرگـانی لە نێوانیاندا پـەرەی سـەند. کەواتە لێرەدا دەبێت بێداربوونەوەی ئـەقڵ و بەرەوپێشچونی فیکـری، بە گەشەی مادی و بوژانەوەی کەرتی ئابووری و بازرگانییـەوە گـرێ بـدەین، چونکە بـەبێ بـوونی زەمینەیـەکی مـادی پتـەو، ئەقلانیـەت ناتوانێـت تەشەنە بکات یاخود بۆ ماوەیـەکی دوورو درێـژ بەردەوام بێت. لە سەدەی سیازدەهەمدا زانکـۆی سـۆربۆن لـە پـاریس و زانکـۆی ئۆکسفۆرد لـە بەریتانیاو زانکۆی بۆلۆنیا لـە ئیتاڵیا کرانـەوە. دواتـر لـە چـەند شـارێکی دیکـەی وەك وەك ڤینیـسیاو سـکلیە و بەرشـەلۆنە، ژمارەیـەك سـەنتەری وەرگێـڕان دروسـتکران، بـە مەبەسـتی تەرجەمەکردنی تێکستە کلاسیکیەکانی یۆنانی. بەڵام لەگەڵ دەسپێکردنی ئەقڵیەتی فەلسەفیدا، جیهـانبینی میتۆلـۆژی و خـوراف پاشاکـشەیان نەکرد، بەڵکو هەردوکیان شان بەشانی یـەکتر لـە کـاردابوون. بـەڵام بـەهۆی نـاکۆکی نێوانیانـەوە بەردەوام بەریەك دەکەوتن و شەڕ لـە نێوانیاندا دروسـت دەبـوو، تـا وای لێهـات گـاف گـاف ســـستمی ئـــەقلانی بەســـەردەکەوت و لـــە بەرامبەریشدا دنیابینی ئەفسانەیی و خوراف لـە پاشەکشەدا بوو.

بــا لێــرەدا گوێبیــستی دامەزرێنــەری کۆمەڵناسی فەرەنسی "ئەمیل دۆرکهایم"بین کە چـۆن بـاس لـە وردەکاریـەکانی ئـەو کێـشەو ململانێیـە دەکـات: (میتـۆدی سیکولائیـستی، بیروبـاوەڕی مەسـیحی ڕەتنـەدەکردەوە، بـەڵام تـوانی تـۆوی ئەقلانیـەت لـە هەناویـدا بـچێنێت. هەروەها لە هـەوڵی ئـەوەدابوو هاوسـەنگییەك لـە نێـوان ئـەو دوو هێـزە گەورەیـەدا دروست بکات کـە دنیـابینی خـەڵکی سـەدەکانی ناوەڕاسـتیان دیاریـدەکرد: ئـەو دوو هێـزەش هێـزی ئـەقڵی ئەرستۆتالیـسی و هێـزی بیروبـاوەڕی مەسـیحی بـوون. دروسـتکردنی هاوسـەنگی لـە نێـوان ئـەم دوو نیابینیــــــدا لەلایــــــەن میتــــــۆدی سکولائیستیەوە، هـەم مـەزنی و هـەم نەهامـەتی بـوو. ئـەو قۆناغـە قۆنـاغێکی شـلۆق و نـاجێگیر بـوو، پـڕی پـشێوی و گێرمـە و کێـشە بـوو. قۆناغێـك بـوو لـە نێـوان ڕێزگـرتنی کەلـەپوور و دڵخـوازی فیکـری ئـازاددا تیامـابوو. دەیویـست وەفاداربێـت بـۆ کڵێـسای مەسـیحی، بـەڵام حـەزێکی زۆریشی لـە ئەقلانیـەت و تێگەیشتنی شتەکان هەبوو. ئەم سـەردەمانە کە هەندێ جار وەکو قۆناغێك سڕو مردوو نیشان دەدرێت، پڕ بـووە لـە پـشێوی و نیگـەرانی و هـەرگیز ئـارام نـەبووە. بـە پێـچەوانەوە سـەدەیەکی پـڕ گـرێ و گـــواڵ و کێـــشمەکێش بـــووە. ســـەدەکانی

ناوەڕاست، یەکێکە لەو چرکەساتانەی ڕۆحی مرۆڤایەتی زۆرترین گرژی و هەڵچون و داڕانی بەخۆیەوە بینیووە. سەدەکانی ناوەڕاست قۆناغی زەمینەسازی و تۆو چاندن بوو، بەڵام قۆناغی چنینەوە نەبوو. چنینەوەی دواتر و لە سەدەکانی دوایدا، واتە لە سەدەی حەڤدە و هەژدەدا دەستی پێکرد[11].

بەمجۆرە دەبینین چاندنی تۆی ئەقڵانیەت لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا دەستی پێکرد و ئەو قۆناغە وەکو باسی لێدەکرێت، هەر هەمووی تاریك و ئەنگوستە چاو نەبووە، بەڵام کەس نکوڵی لەوە ناکات کە سەرەتاکانی تاریك بووەو نەیاری ئەقڵ بووە.. هەر لەسەرەتای مەسیحیەتەوە ئاقارێك هەبووە کە دژایەتی ئەقڵی کردووەو بە چاوێکی سوك لە زانستی ڕوانیووە، بەڵام بۆچی؟ لەبەرئەوەی پێیان وابووە ئەقڵ و زانست ئەرکی سەرەکی لە بیری مرۆڤ دەبەنەوە کە لەسەر ئەم زەویە بۆی دروست بووەو بریتیە لە مسۆگەرکردنی سەرفرازی خۆی لەوە دنیا. ئێمە بۆ ئەوەی لەمە بگەین، پێویستمان بەوەیە لەم ئەقڵیەتە مۆدێرنەی ئێستا بێینەدەرێ و بگەڕێینەوە بۆ رابردویەکی دوور.

مرۆڤی هاوچەرخی ئەوروپی تەنها بیر لە کارو بەرهەم هێنان و کۆکردنەوەی پارەی پێویست دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لە حەز و خۆشیەکانی ئەم ژیانە تێربێت و دەستی بە هەموو پێداویستیەکانی کۆمەڵگەی بەرخۆری رابگات. ئەم مرۆڤە ئەوە دنیای هەرگیز بە بیردانایەت، چونکە لای ئەو شتێکی وابوونی نییە. ئەوەی هەیە هەر ئەم ژیانەیە و دەبێت بەر لەوەی تێپەڕێت و لە دەستمان بچێت، چێژی لێ ببینین. بەڵام ئەوە دنیا بۆ مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست، راستیەکی حاشا هەڵنەگربوو. تەنانەت لەم دنیا فانیەش گرنگتربوو. ئێمە بۆ ئەوەی لە ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بگەین، دەبێت ئەم خاڵە گرنگە بە هێند وەربگرین. هەموو مێژووی نوێی خۆرئاواش بریتیە لە ململانێی نێوان ئەم دوو رێبازە: رێبازی ئیمانداری لەگەڵ ئاقاری ئەقڵانی و عەلمانیدا. ئەم ململانێیە بە درێژایی چەند سەدەیەك بەردەوام بوو، تا لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەیەکجارەکی ئاقاری ئەقڵانی و عەلمانی سەرکەوتن.

بۆ ئەوەی لە چۆنیەتی دروستبوونی مۆدێرنە تێبگەین، پێویستە قۆناغ بە قۆناغی ئەم ململانێ تولانیە بخوێنینەوە. ئەگەر لە نیوەی یەکەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا، فەرامۆشکردنی زانست و ئەقڵ لە ئارادا بووبێت، ئەوا لە نیوەی دووەمدا و لە ژێر کاریگەری فیکری یۆنانیدا ئەو شتانە خەریك بوو جێگەی خۆیان دەکردەوە. ئەمەش بووە مایەی ئەوەی قەیرانێك لە هۆشیاری مەسیحیدا دروست بێت، بە تایبەت لە نێوان ئەوانەی بڕوایان بە غەیبانیەت هەبوو، لەگەڵ ئەوانەدا کە دەیانویڕا ئەقڵیان بەکاربەرن لە پێناو پەیبردن بە هۆکاری دیاردەکاندا. بالێرەدا گوێ بۆ یەکێك لە رێبەرە یەکەمینەکانی ئاقاری ئەقڵانی لە مەسیحیەتی ئەوروپیدا بگرین کە "گیۆم ئەلکۆنشی"یە (1080-1145)، تا بزانین دەرهەق بە فێندەمێنتالیزمی مەسیحی دەڵێت چی: (ئەوان لەبەرئەوەی لە هێزەکانی سروشت

بێئاگـان، دەیانـەوێت هـەموو خـەڵکیش وەکـو ئـەوان بـیر بکاتـەوە. ئەمانـە دەیانـەوێت بەشـێوەیەکی کاڵفامانـە بڕوابێنین و سـۆراخی حەقیقەتی هیچ شتێك نەکەین، بەڵام ئێمە پێمان وایـە دەبێت لـە هـەموو دیاردەیـەکی سروشـتی بپێـچینەوە. ئەمانـە هەسـت بکـەن کەسـێك خـەریکی توێژینـەوەی ئەزموونگەریـە، دەسـتبەجێ گومـانی لێدەکـەن و بـە کـوفر و بێباوەڕی تاوانباری دەکەن[12]).

بـەمجۆرە سـەرەتاکانی گـرژی و ململانـێ لـە نێـوان بیروبـاوەڕی مەسـیحی و مەعریفـەی ئەقڵانیدا دەست پێدەکات و لە دوایشدا توندتر دەبێت، تا دەگاتـە دادگایکردنی گالیلۆ لەلایـەن کلێـساوە. بـەڵام لـەم سـەروبەندەدا مەسـیحیە ئەقڵانیـەکان کەوتنـە سـەرکۆنەکردنی فێندەمێنتالیـستەکان، لەبەرئـەوەی بـێ هـیچ لێکدانەوەو شرۆڤە کردنێك، تێکستە پیرۆزەکان وەکو خۆیان وەردەگرن و کاریـان پێدەکەن. لەو کاتـەداو لـە سـەدەی دوانزەدا زانستی تیۆلۆژیا هاتـە ئـاراوە لەسـەر دەسـتی یـەکێك لـە گـەورە فەیلەسوفانی مەسیحی ئەورووپی "پییر ئەبیلار" (1079–1142) فۆرمەلە بوو. واتە "ئەبیلار" بە شێوەیەکی ئـەقڵانی کەوتـە تـاوتوێکردنی دەقـە پیرۆزەکـان، تـا لەگـەڵ پێـدراوەکانی زانـست و هەلومـەرجی تـازەدا بگونجێـت. بێگومـان لـەو قۆناغـەدا کـەس بـیری لـەوە نـەدەکردەوە ئـەو شـتانە بـە درۆ بخاتـەوە کـە لـەو دەقانـەدا هـاتبوون، بـەڵکو دەیانویـست بەشـێوەیەکی ئـەقڵانی و لـە ڕێـی بـەکارهێنانی لـۆژیکی "ئەرسـتۆ"وە ئـەو تێکـستانە لێـك بدەنـەوە. بـەمجۆرە فەلـسەفەی مەسـیحی دروسـت بـوو.

لەمبارەیەوە "جۆرج گۆسدۆرف" دەڵێت: (وەکو ئاشکرایە سەرهەڵدانی ئەقڵانیەت لە ئەوروپای سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا، دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەرلەنوێ هاتنـەوە ئـارای فیکـری یۆنـانی. فیکـری یۆنـانیش بـەهۆی وەرگێڕانـی تێکستەکانی ئەرستۆوە بە ئەوروپای مەسیحی گەیـشت. جوگرافیـای کلتـوری خۆرئـاوای سـەدەکانی ناوەڕاسـت، ئاسـتی گرنگـی کـارلێکردنی نێـوان کلتـورە جیاوازەکانمـان نیـشان دەدات[13]). یەکـەمین کتـێبی "ئەرسـتۆ" کـە وەرگێـڕە لاتینیـەکان دەسـتیانکرد بـە وەرگێڕانـی کتـێبی (لۆژیـك) بـوو. لـە ناوەڕاستی سـەدەی دوازدەهەمـەوە، ئـەم کتێبـە زۆر ناسـراو وەرگێڕانیشی ڕێنیسانسێکی گرنگی لە بواری زانـستی دیالەکتیکـدا دروسـتکرد. پاشـان لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی دوازدەدا و سـەرەتاکانی سـەدەی سـیازدەدا، وەرگێڕانـی کتێبـەکانی دیکەی "ئەرستۆ" دەستی پێکرد، لەوانە کتێبی سروشت و میتافیزیك. ئەم کتێبانە شرۆڤەکاری و لێکدانـەوەی کەسـانی وەك "ئـیبن سـینا" و "ئـیبن روشـد"ی لەگەڵـدا بـوو هـەروەها چـەند کتێبێکی زانستیش وەرگێڕدران، لەوانە: کتێبی (المجـسطي) "پـەتلیمۆس" لـە سـاڵی 1175، لەگـەڵ کتێبی (ئەندازە)ی "ئەقلیدس" و کتێبـە پزیـشکیەکانی "جـالینۆس" و "ئـەبیقرات" و کتێبگـەلێکی دیکـەی بـواری گەردونناسـی و ئەستێرەناسـی. وەرگێڕانـی ئـەم سەرچـاوانە تـەکانێکی نـوێی بـە زانـست داو بـووە مایـەی بوژاندنـەوەی، تەنانـەت زانـستی "ئەرستۆتالیـستی" گەیـشتە نـاو کایـەی تیۆلۆژیـای مەسـیحیش. وەکـو ئاشـکرایە

تیۆلۆژیا بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست دایکی زانستەکان بووە، تەواو وەکو فەلسەفە لە سەردەمە نوێیەکاندا.

لەم سەروبەندەدا پیاوانی ئایینی مەسیحی کەوتنە پرسیارکردن لەوەی: (ئایا دەشێت بیروباوەڕێکی موقەدەس بگۆڕێت بۆ زانست؟ دەکرێت لۆژیکی "ئەرستۆتالیسی" بەسەر ئەو بیروباوەڕە ئایینیەدا پراکتیزە بکرێت، بەبێ ئەوەی پرۆسەیەکی وا ببێتە مایەی شێواندنی؟ بەمجۆرە ئەم کێشەیە بووە بابەتی سەرەکی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەویش مەسەلەی گونجاندنی نێوان زانست و ئایین یاخود نێوان ئەقڵ و ئیمان بوو. ئەمەش بووە مایەی دابەشبونی خەڵکی ئەو سەردەمە بەسەر دووبەرەدا، بەرەیەکیان لەگەڵ ئایین و خواپەرستی بوون و بەریەکیشیان لایەنگری ئەقڵ و زانست بوون. بەڵام بەرەی سێهەمیش هەبوو کە لە هەوڵی پێکگەیاندنی ئەو دووبەرە ناکۆکەدا بوو، بێگومان لە رووی فیکریەوە رۆڵی ئەمانە گەورە و گرنگتر بوو. بەمجۆرە یەکەمین پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی مەزن لە خۆرئاوادا فۆرمەلە بوو. کەسێکیش دەستی لە فۆرمەلەکردنیدا هەبوو کە ناوی قەشە "تۆما ئەکوینی" بوو. ئەم پیاوە توانی چارەسەرێك بۆ ئەو کێشەیە بدۆزێتەوە کە هەموان عەودالی دۆزینەوەی بوون، بەڵام پێی نەدەگەیشتن.

دەڵێن لە مێژووی خۆرئاوادا سێ پێکهاتەی فەلسەفی مەزن هەیە: یەکەمیان، ئەوەیە کە "ئەرستۆ" لە سەردەمی کۆندا هێنایە ئاراوە دووەمیان، ئەوەیە کە "تۆما ئەکوینی" لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دایمەزراندو سێیەمیان، ئەوەی "هیگڵ"ە کە تایبەتە بە سەردەمی مۆدێرن. ئامانجی "تۆما ئەکوینی" ئەوەبوو عەقیدەی مەسیحی و فەلسەفەی یۆنانی لەگەڵ یەکدا ئاشت بکاتەوە. گەورەترین کێشەیەك کە بەرەو رووی تیۆلۆژیستە مەسیحیەکان دەبووە لەو سەردەمانەدا، ئەوەبوو: ئەگەر دانمان بە دەسەڵاتی ئەقڵدا نا، ئەو دەسەڵاتە تاکوێ دەبێت و تا چەند بڕ دەکات، ئایا سنوری دەبێت؟ ئایا دەکرێت سنورداری بکەین و بەری پێبگرین، بۆ ئەوەی سنوری خۆی نەبەزێنێت و دەستدرێژی نەکاتە سەر دەسەڵاتی ئایین؟

بێگومان گونجاندنی پێکەوەی ئەو دوو دنیابینیە، پێشوەخت مسۆگەر نەبوو، چونکە "ئەرستۆ" بەشێوەیەکی زانستی ورد شرۆڤەی جیهان و دیاردەکانی دەکرد و دەسەڵاتێکی بێسنوریشی بەخشیبوو بە ئەقڵ، واتە خودموختارییەکی بەرفراوانی بە مەعریفەی ئەقلانی دابوو. "ئەرستۆ" لە دەرەوەی بازنەی بەڵگەنەویستە تیۆلۆژی و ئایینیەکاندا، شرۆڤەی دیاردەکانی دنیای دەکرد. لەبەرئەوە ئەم کارەی ئیماندارە مەسیحیەکانی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، دوچاری شۆککرد. بەڵام لە هەمانکاتدا بوو بە چەکێك بە دەست ئەو مەسیحیانەوە کە لایەنگری تازەبوونەوەو بیرکردنەوەی ئازادبوون، تا بەرپەرچی ئەو ئاقارە دۆگماتیست و داخراوەی پێبدەنەوە کە باڵێکی بەهێزی ناو ئایینی مەسیحی بوو. بەمجۆرە دەبینین "ئەرستۆ"، هەژانێکی لەناو کایەی مەسیحی ئەورووپیدا دروستکرد و هاوسەنگی فیکری لەو کایەدا تێکدا.

بەر لە هاتنی "ئەرستۆ" ئەوەی بالأدەست بوو، بەڵگەنەویستەکانی تیۆلۆژیای مەسیحی بوو، بەلأم بە هاتنی فەلسەفەی "ئەرستۆ" گۆڕانێکی تازە رویدا و گەمەکارێکی نوێ هاتە کایەوە. کەواتە کار چیەو کامیان شایانی ئەوەن خەڵك شوێنیان بکەوێت؟ ئەم گۆڕانکاریە وایکرد پیاوانی ئاینی و فەرمانڕەوا سیاسیەکانیش، هەست بە مەترسی و دژواری بارودۆخەکە بکەن. پیاوانی ئاینی فەلسەفەی یۆنانیان بە هەڕەشەیەك دەزانی بۆ سەر دەسەلأتی ئایین و پلە و پایە تۆکمەکانیان، چونکە ئەقڵ ئەو ئازایەتیەی پەیدا کرد داوا لە ئایین بکات بە بەڵگە راستی و دروستی ئەو شتانە بسەلمێنێت کە باسیان دەکات!! بەلأم با بپرسین شتێکی لەمجۆرە چ کاتێك شیاوە؟ لێرەدا پێویستە ئێستێك بکەین بۆ ئەوەی باس لەو فەزا کلتوریە بکەین کە بەر لە هێرشی فەلسەفەی ئەرستۆتالیسی بۆ سەر مەسیحیەتی ئەوروپی، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بالأ دەست بووە.

بۆ ماوەی چەند سەدەیەك بیروباوەڕی قەشە "ئۆگەستین" (354-430)، بەسەر مەسیحیەتدا زاڵ بوو. بیروباوەڕی ئەمیش دەچووەوە سەر ئەو میراتیە فیکریەی ئەفلاتۆنیزم یاخود ئەفلاتۆنیزمی نوێ کە هیچ پەیوەندیەکی بە "ئەرستۆ"وە نەبوو. وەکو دەزانین مەسیحیەت دەتوانێت زۆر بە ئاسانی لەگەڵ میسالیەتی "ئەفلاتۆن"دا هەڵبکات، بەلأم ئەمەی لەگەڵ ریالستیەتی "ئەرستۆ"دا بۆ ناکرێت. شایانی باسە قەشە ئۆگەستین زانا نەبوو، بەڵکو وتاربێژێکی بە توانا بوو. هاوکات حەکیم و عارفێکی گەورە بوو، بەر لە هەر شتێك سەرقاڵی ئەزموونی رۆحی ناوەکی و تێڕامانی قوڵ بوو لە کاروباری ئیلاهیدا، بەلأم ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە بایەخ و گرنگی ئەقڵ بە هێند ناگرێت و فەرامۆشی دەکات. بە پێچەوانەوە، ئەو یەکەم کەس بوو زانست و ئیمانی لەگەڵ یەکدا ئاشتکردەوە، دوای چوارسەدە لە پشێویو ناکۆکی نێوانیان. ئەو دەستەواژە بەناوبانگە هی قەشە "ئۆگەستین"ە کە دەڵێت: (بۆ ئەوەی باوەڕبهێنێت، پێویستە تێبگەیت و بزانیت). واتە ئەو لەو کەسانە نەبووە کە بانگەشە بۆ باوەڕهێنانێکی کوێرانەو هەرەمەکی بکات. ئەو دەیووت: (زانست بۆ تێگەیشتن لە تێکستە پیرۆزەکان، پێویستە). بەڵگەمان بۆ سەلماندنی بلیمەتی و ئەقلأنیەتی قەشە "ئۆگەستین" بە پێوەدانگی سەردەمەکەی، ئەوەی کە دەڵێت: (گەرهاتوو تێکستە پیرۆزەکان لەگەڵ زانستدا ناکۆك بوون، ئەوا دەبێت سەر لەنوێ شرۆڤەی تێکستە پیرۆزەکان بکەینەوە). "ئیبن روشد"یش هەمان هەڵوێستی دەبێت، وەکو دواتر دەبینین. بەلأم کڵێسا بۆچونی پێچەوانەی هەبوو، دەیووت: (لە حاڵەتێکی وادا، دەبێت زانست بگۆڕێت، نەك دەسکاری دەقە پیرۆزەکان بکەین). ئەمەش هەڵوێستی فێندەمێنتالیستە پەرگیرەکانە لەناو هەموو ئایینەکاندا.

قەشە "ئۆگەستین" سەرباری ئەو هەڵوێستانەی، بەلأم وەك هەموو تیۆلۆژیستەکان پێیوابوو: (زانستی ئەم دنیایە لە خوار ئاستی حیکمەتی یەزدانیەوەیە). لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی حیکمەتی ئیلاهی باس لە شتە سەرمەدی و نەمرەکان دەکات و گرنگی بە تەنها شتێکی

سەرەکی دەدات: کە بەدەستهێنانی سەرفرازیە لە دنیای دوای مردن و شادبوونە بە بەهەشت. ئەمە لە کاتێکدا زانستی دنیایی گرنگی بە شتە کاتی و فانیەکان دەدات. سەرەڕای ئەوە زانست وا دەکات مرۆڤ زۆر بە خۆی بنازێت و بوغرا بێت، وەکی قەشە "پۆلس" دەڵێت. کەواتە (سەرچاوەی هەموو خۆپەرستی و خراپەکاری و رەزیلەتێکە. زانستی ئینسانی بۆ دروستبونی، پێویستی بە هیچ ئیشراق و سروشتێکی ناوەکی نییە، لە کاتێکدا حیکمەتی یەزدانی بەرهەمی وەحی و سروشە. جیاوازیەکی گەورەش لە نێوان زانستی زەمینی و زانستی ئاسمانیدا هەیە. زانستی ئاسمانی فێری سادەیی و لە خۆبوردویمان دەکات تا ئاستی ملکەچی، هەروەها فێرمان دەکات چۆن لە ژیانی دنیا تەرێز بکەین و لە حەز و ئارەزووەکان دووركەوینەوە[14]).

بەمجۆرە دەبینین هەموو شتێك لە دنیابینی قەشە "ئۆگەستین"دا بەخشین و لێبوردنە، وەحی و سروشە. لەم دنیابینیەدا هەموو شتێك ملکەچە بۆ ئیمان، تەنانەت ئەقڵ و سروشتیش، چونکە ئیمان هەموو شتێك دەگرێتەوەو هەموو شتێك دادەپۆشێت. هیچ جیاوازییەك لە نێوان کایەی فەلسەفە و کایەی تیۆلۆژیادا نییە. فەلسەفە جگە لە خزمەتکارێکی گوێرایەڵی تیۆلۆژیای مەسیحی، شتێکی تر نییە. بیروباوەڕی قەشە "ئۆگەستین" توانی تا بەراییەکانی سەدەی دوازدە بڕ بکات و لەوە بەدوا کاریگەری نەما، چونکە وەکو باسمانکرد، هەلومەرجی تازە هاتە گۆڕێ و گۆڕانکاری گەورە رویدا. لە پای ئەمەشدا پیاوانی ئایینی

مەسیحی بوون بە دووبەشەوە: بەشێکیان زۆر سەرسام بوون بە فەلسەفەی "ئەرستۆ" و ئامادەبوون سەر لەبەر تەبەنی فەلسەفەکەی بکەن، تەنانەت گەر کارێکی لەو جۆرە ببێتە مایەی رامالینی کەلەپووری مەسیحی و پاکتاوکردنیشی، بەڵام بەشەکەی دیکەیان زۆر دەرگیری کەلەپووری مەسیحی بوون و ئامادەبوون بەرخوردی ئەو فەلسەفە بتپەرستیە بکەن. "تۆما ئەکوینی" خۆی لە بەرامبەر ئەم کەرتبونە رۆحیە ترسناکەدا بینیەوە. بینی دڵ و دەرونی مرۆڤەکانی سەردەمەکەی شڵەژاوو دادڕاوە، بلیمەتی ئەویش لەوەدا بوو کە توانی چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەو کەرتبون و دادڕانە بدۆزێتەوە و توانی هەماهەنگیەك دروست بکات کە گرنگییەکی مێژووی گەورەی هەبوو. واتە توانی هەماهەنگیەك لە نێوان فەلسەفەی "ئەرستۆ" و کەلەپووری مەسیحیدا دروست بکات. لێرە بەدواوە بە دوورو درێژی باس لەم مەسەلەیە دەکەین.

### قەشە تۆما ئەکوینی و کێشەی نێوان ئەقڵ و ئیمان:

وەکو باسمانکرد بە درێژایی چەندین سەدە بیروباوەڕی قەشە "ئۆگەستین" بەسەر فیکری مەسیحیدا زاڵ بوو، بەڵام دواتر قەشەیەکی دیکە دێت کە "تۆما ئەکوینی"یەو دەتوانێت ئایینی مەسیحی بە ئەقڵانی بکات. پێویستە ئەوە بزانین کە قەشە "ئۆگەستین" لە نێوان ساڵانی 354 بۆ 430 دا ژیاوە و قەشە "تۆما ئەکوینی"ش لە ماوەی 1225 بۆ 1274 دا ژیاوە. تا ئەمڕۆش رێبازی تۆمائیزم لە

فەلسەفەی هاوچەرخدا بەردەوامە و گەورە مێژوونوسی فەلسەفە "ئیتیان گیلسۆن"[15] و "جاك ماریتان"[16]ی فەیلەسوف و بیرمەندگەلێکی دی، سەربەم ئاقارەن.

بەرلەوەی بێینە سەر باسی "تۆما ئەکوینی" و تۆمائیزم، پێویستە هەندێ خاڵی جیاوازی نێوان فەلسەفەی "ئەرستۆ" و بیروباوەڕی مەسیحی بخەینە ڕوو. "ئەرستۆ" باس لەوە دەکات کە جیهان ئەزەلییەو لە دێر زەمانەوە هەیە، لە کاتێکدا مەسیحیەت بۆچونێکی پێچەوانەی هەیە و پێیوایە ئەزەلی نییە و لەلایەن خاڵقێکەوە دروستکراوە. هەروەها "ئەرستۆ" پێیوانەبوو ڕۆح بەبێ جەستە بونی هەبێت، واتە ڕۆحیش لەگەڵ جەستەدا دەمرێت، بەلاّم مەسیحیەت دەڵێت: (دوای مەرگی جەستە، ڕۆح دەمێنێتەوەو نامرێت). "ئەفلاتۆن"ی مامۆستای "ئەرستۆ"، وەکو مەسیحیەت بڕوای وابوو کە دوای مردن ڕۆح بە نەمری دەمێنێتەوەو ئەمەشی بە ئومێدی جوان وەسفدەکرد کە ترس و بیمی مردن کەم دەکاتەوە. لەبەرئەمەیە دەوترێت هەڵکردنی مەسیحیەت لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتۆنیزم، ئاسانترە لە هەڵکردنی لەگەڵ فەلسەفەی ئەرستۆتالیزم. دواتر "تۆما ئەکوینی" هات و لە هەوڵی ئەوەدا بوو چارەسەری ئەم کێشانە بکات، ئەویش لەو ڕێیەوە کە باس لە بوونی دووکایەی تەواو لێکجیاوازی مەعریفە بکەین: کایەیەك تایبەت بە فەلسەفە و کایەیەکی دیکە تایبەت بە خودناسی و ئایین. کەواتە ئیمان و ئەقڵ هەریەکەیان حەقیقەتی خۆیان هەیە و نابێت تێکەڵ بەیەکیان بکەین. بەمجۆرە "تۆما ئەکوینی" لە کایەی تایبەت بەخۆیدا خودموختاری دا بە فەلسەفە و بەمەش یەکەمین فەیلەسوفی (مۆدێرن) بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. بەلاّم وەکو دواتر دەبینین ئەو خودموختاریە، ڕێژەیی و سنوردار بووە. با گوێ لە "ئیتیان گیلسۆن" بگرین، بزانین چۆن باس لەو چارەسەرە دەکات کە "تۆما ئەکوینی"، بە مەبەستی نەهێشتنی ناکۆکی نێوان ئەقڵ و ئیمان پێشنیاری کردووە: (تۆما ئەکوینی دەڵێت: کایەی فەلسەفە بە گشتی دەرگیری ئەقڵە و کایەی خواناسیش دەرگیری سروشت و وەحییە، واتە سەرەنجام دەرگیری دەسەلاّتی ئیلاهیە. پرانسیپەکانی ئیمان مەعریفەیە، بەلاّم مەعریفەیەکی تایبەت و میتافیزیکانەیە. ئەگەرچی ئێمە لە هەموو ناوەرۆکی تێناگەین، بەلاّم چارمان نییە و دەبێت وەکو خۆی قبوڵی بکەین، بەلاّم فەلسەفە وا نییە و تەنها ئەو شتانە پەسەند دەکرێت کە ئەقڵ بە بەڵگەوە دەیانسەلمێنێت. فەیلەسوف لە سۆراخکردنی شتەکاندا و لە مشتومڕکردنی لەسەر مەسەلەکان پشت بە ئەقڵ دەبەستێت، لە کاتێکدا پیاوی ئایینی بۆ تەواوی ئەو شتانە، پشت بە سروش و وەحی دەبەستێت)[17].

بەمجۆرە "تۆما ئەکوینی" دووکایەی مەعریفە و دەسەلاّتی لە یەکتر جیاکردەوە: کایەی خودناسی کە لە بواری ئاییندایە، لەگەڵ کایەی فەلسەفە و زانست کە سەر بە بواری ئەقڵ و ئەقلاّنیەتە. ئەم کارەشی بەو مەبەستەکرد، تا کێشە لە نێوانیاندا ڕونەدات و بەریەك نەکەون. بۆ نمونە خوڵقاندنی جیهان و نەمری ڕۆح، دوو حەقیقەتن سەر بە کایەی

ئـايينين و فەلـسەفە پەيوەنـدى پێيانـەوە نييـە. بۆيــە دەبێــت بــێ هــيچ پــرس و مــشتومڕێك باوەڕيان پێ بهێنرێت. واتە ئەقڵ تواناى ئـەوەى نييە بە شێوازى تايبەتى خۆى پەى بەو شتانە بەرێت، لەبەرئەوە نابێت دەرون و رۆحى خۆمـان بە شتێكەوە ماندوو بكەين كە ئاكامى نابێت. لە لايــەكى تــرەوە تــاوتوێكردنى دياردەكــانى سروشــت و پــەيبردن بــە ياســا ناوەكيــەكانى، شـتگەلێكن دەبێـت ئـەقڵ پێيـان هەڵبـستێت و ئەنجاميان بدات. لە يەكەمجاردا ئەم چارەسـەرە وەكو چارەسەرێكى ژيرانەو گونجاو دێتە پێش چـاو، لەبەرئــەوەى رێ لــەوە دەگرێــت ئــەقڵ و ئيمــان بەيەكــدا بــدەن و كێــشە لــە نێوانيانــدا دروست بێت. بـەڵام ئـەم چارەسـەركردنە بـەلاى زۆرێكەوە لەوساوە تا رۆژگـارى ئـەمڕۆ، شتێكى پەسـەند و گونجـاو بـووە، چونكە وەكـو پێـشتر باسمـانكرد، تـا ئێـستاش رێبـازێكى ئـەكتيڤى تومـائيزمى مەسيحى لـە ئـەوروپاى هاوچەرخدا هەيە. بەڵام ئـەى ئەگـەر دژايـەتى و ناكۆكيەك لە نێوان ئەم دوو كايەدا دروست بوو، چى بكـەين؟ ئايـا شـوێن پێـى ئـەقڵ هـەڵبگرين يـاخود دواى ئايين و بيروباوەڕى ئايينى بكـەوين؟ لـە وەڵامـى ئـەم پرسـيارەدا "تۆمـا ئـەكوينى" دەڵێـت: (لـە رووى مەبدەئيــەوە گونجانــدنى نێــوان ئــەم دوو كايە مەعريفيە بڕاوەتەوەو هيچ كێشەيەك نييـە، ئەگەرچـى لـە رواڵەتـدا ديارنييـە.. گونجانـدنى حەقيقەت لەگەڵ يەكتريدا – مەبەست حەقيقەتى فەلسەفيە لەگەڵ حەقيقەتى ئايينيدا–، شتێكى بەڵگەنەويستە. كەواتـە ئـەو حەقيقەتـەى لـە رێـى فەلــــسەفەوە پێدەگـــەين، ناشـــێت لەگـــەڵ پێدراوەكانى ئيمانـدا نـاكۆك بێـت. بـەڵام ئەگـەر هـاتوو حەقيقـەتى فەلـسەفى لەگـەڵ بيروبـاوەڕى ئايينيـدا نـاكۆك بـوو، ئـەوا ئـەو كـات دەبێـت حەقيقەتى فەلسەفى بە خۆيدا بچێتەوەو رەخنە لــە خــۆى بگرێــت، تــاواى لێــدێت لەگــەڵ بيروباوەڕى ئايينيدا دەگونجێت)[18].

ئەم بۆچونەى "تۆما ئـەكوينى" بە ئاشكرا پێمـان دەڵێـت، هـەر كاتێـك نـاكۆكى و كێـشە لەسەر مەسەلەيەك لە نێوان بيروباوەڕى ئايينى و مەعريفەى فەلسەفيدا دروست بوو، ئـەوا قسەى كۆتــايى بــۆ ئايينــە نــەك بــۆ فەلــسەفە. ئــەم چارەســـەرە لەلايــەن پيــاوێكى مەســيحى وەك "تۆما ئەكوينى"يەوە، شتێكى چاوەڕوانكراوەو لە نێوان ئەقڵ و ئيماندا، سەرەنجام هـەر دەبێت قوربانى بە ئەقڵ بدات.

بــا لێــرەدا كەمــەكێك بــە وردى بــاس لــە مەسەلەكان بكەين. "تۆما ئەكوينى" پـێ لەسەر ئــەوە دادەگرێــت كــە پێكــەوە گونجانــدنى بيروبـــاوەڕى مەســـيحى لەگـــەڵ فەلـــسەفەى ئەرستۆتاليستيدا، شتێكى پێويستە و دەكرێت روبـدات. ئـەم قـسەيە ئـەو خەسـڵەتە تايبەتيـەى زانـستى ئەرستۆتاليـستى فەرامۆشـدەكات كـە پشت بە بەڵگەنەويست و پێودانگەكانى فيكرى يۆنـانى دەبەسـتێت. بـەڵام هــەر رۆژێـك ئــەوە ئاشكرا دەبێت كـە لـە نێـوان ئـەم دوو كايەيـەدا ناكۆكى هەيە نەك پێكەوە گونجان، لەبەرئـەوەى ئـەو بەڵگەنەويـستانەى ئـەقڵى يۆنـانى كـارى پێدەكات، جياوازە لـەو پێدراوانـەى سەرچاوەى بيروبـــاوەڕى مەســـيحى و تـــەواوى ئايينـــە يەكتاپەرســتيەكانە. واتــە كــارێكى مەحاڵــە "ئەرستۆ"يەكى مەسيحى قوت كەينـەوە يـاخود لەگـەڵ مەسـيحيەتدا بيگـونجێنين، وەكـو ئـەوەى

"تۆما ئەکوینی" دەیویست بیکات. ئەو دنیابینییەی رابەری فیکری بتپەرستی یۆنانی کاری پێدەکات، زۆر لە پرانسیپییەکانی بیروباوەڕی مەسیحیەتەوە دوورە. لەبەرئەوەی وەکو "جۆرج گۆسدۆرف" دەڵێت: (پێویستە لە نێوان ئەرستۆو یەسوعی مەسیح، لەنێوان ئەقڵو ئیماندا یەکێکیان هەڵبژێرین). ئەگەر هەوڵیش بدەین "ئەرستۆ" و بیروباوەڕی مەسیحیەت، یان ئەقڵ و ئیمان پێکەوە بگونجێنین، ئەوا سەرەنجام بەوە دەگەین کە لە یەککاتدا هەریەك لە ئەقڵ و ئیمان بشێوێنین، چونکە پێکەوە گرێدانی ئەم دوکایەیە ئەستەمەو ناشێت روبدات. ئەمەش ئەو کێشە سکولائیستیەیە کە بیریارانی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەخۆیەوە خەریککردبوو. سیکولا بە زمانی لاتینی واتە قوتابخانە و سیکولائیستیش واتە ئەو پەیڕەوو پرۆگرامە فەلسەفیەی لە نێوان سەدەکانی دەو حەڤدەدا، لە قوتابخانە ئایینیەکان و زانکۆکانی ئەوروپادا دەخوێندرا، تا ئەو کاتەی "دیکارت" هات و فەلسەفەیەکی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێنایە ئاراو کۆتایی بە ئاقاری سیکولائیستی هێنا. خەسڵەتی سەرەکی فەلسەفەی سیکولائیستی ئەوەیە کە دەرگیری تیۆلۆژیایە و لە هەوڵی ئەوەدایە وەحی و ئەقڵ پێکەوە بگونجێنێت. لەلایەکی ترەوە بە خوێندنەوەو شرۆڤەکردنی فیکری فەیلەسوفە کۆنەکانەوە خەریك بوو، بە تایبەتی "ئەرستۆ". بەڵام لێرەدا دەبێت بزانین کە ئاقاری سکولائیستی لە میانەی پشکنین و تاوتوێکردنێکی رەخنەیی یاخود مێژوویی تێکستە مەسیحیەکانەوە (بۆ نمونە ئینجیل)، باسی لە کێشەی ئەقڵ و ئیمان یاخود فەلسەفەو عەقیدە نەدەکرد، چونکە شتێکی وا لەو سەردەمەدا مەحاڵ بوو، یان دەکرێت بڵێین کاتی نەهاتبوو. پرۆسەیەکی لەمجۆرە بە شێوەیەکی جدی لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەدا لەسەر دەستی "سپینۆزا" هاتە ئارا، وەکو لە دواتردا دێینە سەر باسکردنی.

ئەوەی ئاقاری سیکولائیستی پێیەوە خەریك بوو، ئەوە بوو نیشانی بدات کە چۆن دەکرێت فەلسەفەی بتپەرستی (بەتایبەتیش ئەفلاتۆنیزم و ئەرستۆتالیزم)، لەگەڵ پرانسیپەکانی بیروباوەڕی مەسیحیدا بگونجێنرێت، گەر بزانین چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین و تێبگەین. بە واتایەکی دی پێویستە فەلسەفەی یۆنانی وای لێبکرێت، تا لەگەڵ پرانسیپەکانی ئایینی مەسیحیدا بگونجێت. شایەنی باسە ئەم ئاقارە لە سەرەتادا، (واتە لە سەدەی سیانزدەهەمدا)، گوزارشت بوو لە پێداویستیەکی مێژوویی، بەڵام دواتر بوو بە میتۆدێکی نەزۆك و داخراوو بوو بە ئامرازێك بۆ تۆقاندن و سەرکوتکردنی بیریارانی ئازاد. لە ساڵی 1624دا بڕیارێك لەلایەن زانکۆی سۆربۆن و پەرلەمانی شاری پاریسەوە دەردەچێت و تیایدا هاتووە: (بۆ هیچ کەسێك نیە شتێك بخوێنێت کە پێچەوانەی بەرنامە و پرۆگرامی سیکولائیزم بێت). نابێت لێرەدا سەرسام بین لەوەی ئەم بڕیارە لەلایەن سۆربۆن و پەرلەمانەوە دەرچووە، چونکە سۆربۆن لەو کاتەدا کۆلێژێکی خوداناسی بوو، پەرلەمانیش هەڵبژێردراوی گەل نەبوو، بەڵکو ئەندامانی بریتی بوون لە پیاو ماقوڵان و دەرەبەگەکانی سەردەمی پادشایەتی.

لەسەر دەستی سیکولائیستەکان فەلسەفەی "ئەرستۆ"، بوو بە عەقیدەیەکی پیرۆز و بەمجۆرە "ئەرستۆ" بوو بە قەشەیەکی موقەدەس کە بۆ هیچ کەس نەبوو رەخنە لە بیروبۆچوونەکانی بگرێت. واتە ئەم "ئەرستۆ"مەسیحیە پەیوەندیەکی ئەوتۆی بە "ئەرستۆ"ی راستەقینەوە نەبوو. لەو سەردەمەدا هەرکەسێك دژ بە تێزەکانی "ئەرستۆ" بوایە کە باس لە سێنترالیزمی زەوی دەکات و پێیوایە خۆر بە دەوریدا دەسوڕێتەوە، ئەوا خۆی دوچاری سزایەکی توند دەکرد، چونکە دوای تەبەنیکردنی لەلایەن کلێساوە ئیتر بەشێك بوو لە باوەڕی کلێسای مەسیحیەوە، بوو بە باوەڕێکی موقەدەس. هەر لەم چوارچێوەیەدا "گالیلۆ" لە 16 ی حوزەیرانی 1632 دا دادگایی کرا. پێویستە بزانین تەواوی ئازادیخوازانی ئەوروپا، ئەوانە بوون کە بەگژ بیر و بۆچونە دۆگماتیستەکانی رێبازی سیکولائیستیدا چوونەوە. لەوانەش، "مارتن لۆتەر"ی رابەری بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی لە ئەوروپا. هەروەها "دیکارت"ی دامەزرێنەری ئەقلانیەتی مۆدێرنیش، بەگژ ئەو سستمە دۆگمایەدا چووەوە کە بە منداڵی لە قوتابخانە ئەزمونی کردبوو. "دیکارت" لە پێشەکی کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وتارێك دەربارەی میتۆد)، بە شێوەیەکی زۆر کاریگەرانە باسی لەو قۆناغە کردووە. "گالیلۆ"یش هەمان هەڵوێستی لە سیکولائیزم هەبوو. بەڵام هەر هێندەی "نیوتن" و میتۆدی ئەزمونگەری لە ئینکلتەراو پاشان فەلسەفەی دیکارتیزم لە فەرەنسا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ئیتر بیروباوەڕی سیکولائیستی دای لە کزی و بەرەو نەمان چوو. لەناو کۆلیژەکانی شەریعە و خودناسی مەسیحی بترازێت، هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆی لەسەر رەوتی دنیای نوێ نەما. بەمجۆرە سەدەکانی ناوەڕاست بە فیعلی کۆتایی هات.

راستیەکەی کێشەی هەڵکردنی ئەقڵ لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینیدا، لە بەراییەکانی سەدەی دوازدەوە دەستی پێکردو لە سەدەی سیازدەدا، واتە لە سەردەمی "تۆما ئەکوینی"دا گەیشتە لوتکە. گەورەترین روناکبیری فەرەنسایی و تەنانەت ئەوروپیش لەو سەردەمەدا "پییر ئەبیلا" (1079–1142) بوو. ئەم بیریارە لە دوا ساتەکانی ژیانیدا کتێبێکی بەناوی: (گفتوگۆ لە نێوان فەیلەسوف و یەهودی و مەسیحی)دا نوسی. ئەوەی لەم گفتوگۆ و مشتومڕەشدا سەردەکەوێت، مەسیحیە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە نوسەرەکەی بوێربووەو بای ئەوە ئازایەتی تێدا بووە بتوانێت، یەهودی و فەیلەسوف شان بە شانی مەسیحی دابنێت. پێویستە ئەوەمان لە یاد نەچێت ئەمە لە گەرمەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بووە.

لەو سەردەمەدا کێ دەیتوانی ئایینی جولەکە بێنێتە ریزی ئایینی مەسیحیەوە و لەیەك ئاستدا دایان بنێت. ئەمە بۆ ئەو سستمە فیکریەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئارادا بووە، شتێکی مەحاڵ بوو.. بیرکردنەوە لە دروستکردنی دیالۆگ لە نێوان ئەو لایەنە ناکۆکانەدا، ئەوە دەگەیەنێت "ئەبیلار" بڕوای بەوە هەبووە کە لە دواجاردا ئەمانە دەتوانن، لە نێوان خۆیاندا پێك بێن و زەمینەیەکی هاوبەش بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

ئەمەش بۆ ئەو سەردەم و زەمانە، شتێکی زۆر تازە و پێشکەوتنخوازانە بووە.

بەڵام کێ دەتوانێت ئەو زەمینە هاوبەشە بۆ دیالۆگ و لێکگەیشتن بدۆزێتەوە. بێگومان ئەوە نە بە یەهودی دەکرێت و نە بە مەسیحی، بەڵکو ئەوەی دەتوانێت بەو کارە هەڵبسێت فەیلەسوفە، چونکە فەیلەسوف وەکو دوو لایەنەکەی دی پێشوەخت دەرگیری عەقیدەیەکی دیاریکراو نییە. "ئەبیلار" دەگێڕێتەوە کە سێ کەس هاتوونەتە خەوی و پێیان وتووە: (ئێمە سەر بە ئایینی جیاجیاین. لە راستیدا هەمووومان یەك خوا دەپەرستین و بەلام هەریەکەمان بە شێوازی تایبەتی دەیپەرستین، هەریەکەشمان بیروباوەڕی تایبەت بە خۆمان هەیە)[19]. ئەم سێ کەسە دوای ئەوەی بە دوورو درێژی دەکەونە گفتوگۆوە لەگەڵ یەکتریدا و ناگەنە هیچ ئەنجامێك، ناچار پەنا دەبەنە بەر فەیلەسوف. فەیلەسوفیش وەکو کەسێکی بێلایەن کە داوەری لە نێوان چەند بۆچونێکی جیاوازدا دەکات، خۆی نیشان دەدات و بەشێوەیەك باس لە رۆڵی خۆی دەکات کە "کانت" و بیروباوەڕە ئەقلانیەکەیمان بیردەخاتەوە. فەیلەسوف دەڵێت: (کاری من بنەمای هەموو مشتومڕو گفتوگۆیەکە. ئەی ئامانجی بەرزی فەلسەفە ئەوە نییە کە بەشێوەیەکی ئەقلانی سۆراخی حەقیقەت بکات؟ یاخود ئامانجی تێپەڕاندنی هەموو حەز و ئارەزووە تایبەتیەکانی مرۆڤ نییە، بۆ ئەوەی بڕیاری ئەقڵ شوێنی ئەوانە بگرێتەوە؟ ئەی چی یارمەتی ئەقڵ دەدات بۆ ئەوەی بەکاری خۆی هەڵبستێت؟ ئەڵبەتە زانستە نوێیەکانی وەك لۆژیك و دیالەکتیك و هونەری دیالۆگکردن، یارمەتیدەری ئەقڵ دەبن بۆ ئەوەی بەم کارە هەستێت)[20].

بەمجۆرە دەبینین ئیشکالیەتی ئەقڵ و ئیمان، هەر لە سەدەی دوازدەهەمەوە لە ئارادابووە و چاوەڕوانی سەدەی سیازدەو "تۆما ئەکوینی" نەبووە، تا خۆی بەیانکات. ئەگەرچی "تۆما ئەکوینی" توانی ئەو تەلیسمە بکاتەوەو چارەسەرێك بۆ ئەو ئیشکالیەتە بدۆزێتەوە. وەکو پێشتر باسمانکرد ئەو چارەسەرکردنەی، قەناعەتی بە زۆرێك کرد، هەرواش مایەوە تا بەراییەکانی سەردەمی مۆدێرنە. بەلام ئاقاری فێندەمێنتالیزمی مەسیحی تا دەوروبەری ساڵی 1563، هەر دژایەتی دەکرد و پەسەند نەبوو بەلایەوە. تا ئەو کاتەی بە شێوەیەکی فەرمی بیروباوەڕی تۆمائیزم لەلایەن کڵێسای کاتۆلیکیەوە قبوڵکراو بە رەسمی ناسێنرا. یەکێك لە خاڵە سەرەکیەکانی ئەم ململانێیە، پەیوەندی بە جیاکردنەوەی ئیمانی گشتی لە ئیمانی تایبەتی، یاخود بە شێوازی بڕواهێنانی فەیلەسوفان بە بیروباوەڕی پیاوانی ئاییني و خەڵك و خواوە هەبووە. ئاشکرایە فەیلەسوفەکان دەیانویست جۆرێك لە ئەقلانیەت بهێننە ناو کایەی بیروباوەڕی ئاینیەوە، ئەویش لە رێگای بەکارهێنانی فەلسەفەی "ئەرستۆ" و لۆژیکی دیالەکتیکەوە. بەلام فێندەمێنتالیستەکان ئەوەیان بە تەواوەتی رەتدەکردەوە و بەلەکەدارکردنی ئیمانی راستەقینەیان دەزانی. ئەم دوو بۆچوونە دژ بەیەکە بووە مایەی بەرپابوونی شەڕ لە نێوان گەورە بیریارانی ئەوروپایی وەك: "ئەبیلار و

ئــەلبێرتی مــەزن و رۆجــیٚ بیکــۆن و تۆمــا ئــەکوینی و ســـیجیۆ دوبرابـــان"، لەگـــەڵ ســـەرکردەکانی فێنــدەمێنتالیزمی مەســیحی ئەو سەردەمەدا.

## پەراوێزەکان:

1-جاك لۆگـۆف: لـە پێنـاو سـەدەیەکی ناوەڕاسـتی دیکەدا.

*Jacque Le Goff, Pour un autre Moyen – Age, Gallimard, Paris, 1977.*

2-ئـــالان دولیـــبیرا: بیرکردنـــەوە لـــە سەدەکانی ناوەڕاست.

*Alain de Libera, Penser au Moyen – Age, Seuil, Paris, 1988.*

هـــەروەها، ئـــالان دولیـــبیرا: فەلـــسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست.

*Alaun de Libere, La philosophie medievale, P.U.F, Paris, 1993.*

3-نوسـەر لـە زۆر شـوێنی ئەم بەشـەدا بەشـێوەیەکی پەرگیرانــە بـاس لــە ســەروەری و دەســکەوتە مـادی و مەعنەویەکانی عەرەب و موسڵمانان دەکات لە سەدەکانی ناوەڕاسـتدا کـە زیـاتر لـە پیاهەڵـدان و ستایـشکردنەوە نزیکــە، بۆیــە ئێمــە لــە کــاتی وەرگێڕانــی دەقەکــەدا چاوپۆشیمان لەو شتانەکردووەو نەمانکردۆتە کوردی.

4-بڕوانە ئەم کتێبـەی ئیتیان گلیسۆن: فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

*Etienne Gilson, La philosophie au Moyen – Age Payot, Paris, (1,edition 1930), pp.308-309.*

*5-Ibid., 2,edi, p.571.*

*6-William whewell, History of the Inductive Sciences, London, 1837, Vol. I, p. 235.*

7-بڕوانــە جــۆرج گۆســدۆرف: بنەچــەی زانــستە مرۆڤایەتیەکان.

*Georges Gusdorf, Les origines dws Sciences humaines, Paris, Payot, 1967.*

بەتایبــەت ئــەو نەســکەی کــە تایبەتــە بــە کلتــوری سەدەکانی ناوەڕاست.

8-بڕوانە ویلیام ویویل: ه.س.پ، ل 235-236.

9-بڕوانە ئەندرۆ. د. وایت: مێژووی جەنگ لە نێوان زانست و تیۆلۆژیا لە جیهانی مەسیحیدا.

*Andrew. D. White: A History of the warfare of Science and Theology. London, Prometheus Books (1 st ed. 1896, Last ed. 1994*)

10-لێـــــرەدا نوســــــەر زۆر درێـــــژە بـــــە باســـکردنی هەلومـــەرجی ژیـــانی ســـەدەکانی ناوەڕاســت دەدات و باسکردنەکەشـــی دووبارەبوونـــەوەی زۆری تێدایـــە، بۆیـــە لـــەکاتی وەرگێڕانیـــدا چاوپۆشـــیمان لـــەو پەرەگرافانە کرد.

11-ئــەم دەقــەی دۆرکهــایم، لــەم کتێبــەی ئــالان دولیبیرادا هاتووە:

*Alain de Libere: Penser au Moyen – Age, op. cit., p. 352.*

12-بڕوانــە ئــەم کتێبــەی قەشــە شــینۆ، یــەکێك لــە گـەورە زانایـانی مەسـیحیەت لـە ئەوروپای هاوچـەرخدا: خوداناسی لە سەدەی دوازدەدا.

*Lepere chanu, La Theologie au XIIe Siecle. Vrin, Paris, 1957.*

*13-Georges Gusdorf, Les origines des Sciences humaines, op. cit., p.207.*

14-بڕوانە ئەو بەشە زۆر سەرنج ڕاکێشەی کە جۆرج مینوا لەم کتێبەیدا بۆ قەشە ئۆگەستینی تەرخانکردووە:

*Georges Minois, L,Eglise et la Science, Hitoire d,un malentendu.*

*De Saint Augustin a Galilee. Fayard, Paris, 1990, pp.110-121.*

15-ئیتیان گیلسۆن (1884-1978) ***Etienne Gilson***: مامۆستا بووە لە کۆلێژ دوفرانس. لە گرنگترین کتێبەکانی فەلسەفەی تۆمائیزم (1921)، فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا (1922)، ڕۆحی فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا (1933).

16-جاک مارتیان (1882-1973) ***Jacques Maritain***: یەکێکە لە گەورە بیریارانی فەلسەفەی تۆمائیزم و هیومانیزمی مەسیحی لە سەدەی بیستەمدا. لە گرنگترین کتێبەکانی: دەربارەی فەلسەفەی مەسیحیەت (1933)، هیومانیزمی سەراپاگیر (1936)، واتە هیومانیزمێك كە ئایین و زانست یاخود ڕۆح و مادە پێکەوە کۆ دەکاتەوە.

*17-Etienne Gilson, La philosophie au Moyen – Age, op. cit., p.528*

*18-Ibid*

19-ئەم قسەیە لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە:

*Georges Gusdorf, Les origines…, op. cit., p. 212*

*20-Ibid.*

**سەرچاوە:**


هاشم صالح: مدخل الى التنوير الاوروبي – دار الطليعة، بيروت – الطبعة الاولى، 2005.

# مژده بەخشانی مۆدێرنەی سیاسی

## سپینۆزا، لۆك، مۆنتسیكۆ

مۆریس باربیە

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

مۆدێرنـــەی سیاســـی پـــاش پەیـــدابوونی تاكبـــــاوەڕی لەســــــەردەمی ڕێنسانـــــــسدا، بەشـــێوەیەكی شـــاراوە و ئاشـــكرا خـــۆی دەرخست و یەكەم ئاماژەكانیشی لە ئینگلتـەرا دەركـــەوت. لـــەم وڵاتـــەدا بـــە فـــەرمی بـــوونی مافـەكانی تـاك كـە بڵاوكـراوەی مـەزنی سـاڵی *1215*ی مـیلادی ڕێگـەی بـۆ خۆشـكردبوو، بـە داخوازینامەكەی ساڵی *1638* سەلمێنرا و پەرەی سەند. ئەم داخوازینامەیە سەرەڕای ئەو ماف و ئازادیانـەی لـە بڵاوكـراوەی مەزنـدا هەیـە، ئـەو ماف و ئازادیانەی كە پەرلەمان لە پەیوەندیدا بە ژیـان، ئـازادی و سـامانەكانی هـەر تاكێـك بـە فـەرمی ناسـیبووی، بـە بـیر هێنایـەوە "بـێ قبوڵكردنی ئەم مافە كە هەركەسێك بتوانێ لە دادگـادا بـەرگری لـە خـۆی بكـات، ناتوانێـت زەوی و مـوڵكی كەسـێكی دی. لەهـەر پایـە و پلەیەكدا بێت. زەوتبكات، هەروەها ناتوانرێت كەسێك بگیرێت یان زیندانی بكرێت، لە ماف وەرگـرتنی داراییـەكانی لەرێگـەی میراتـەوە بێبەش بكرێت یان بكوژرێت."(بەندی *14)*. لە ئەنجامدا ئەندامانی پەرلەمان دەیانویست بەبێ ڕەزامەنـدی پەرلـەمان هـیچ كـەس ناچـار بـە قـەرزدانان و باجـدان یـان خـەراج نـەبێت و "نـەتوانرێت كەسێك لەبەر باج یان خەراج بە مـەیلی خـۆی بـۆ دادگـا راكێـشێت، ناچـار بەئەنجامـدانی كـارێكی بكـات یـان دەسـتگیری بكات و ئازاری بدات" و "هەروەها ناكرێ هیچ مرۆڤێكـی ئـازاد" بـە شـێوازێكی نایاسـایی "دەستگیر یا زیندانی بكرێت"(بەندی *10)*.

ئەنـــــدامانی پەرلـــــەمان هـــــەموو ئـەم خواسـتانەیان "وەك مـاف و ئازادیـەكانی خۆیـان گونجـاو لەگـەڵ یاسـاكان و پێوەرەكـانی ئـەم سـنوری پاشـایەتیەدا" دەخـستە ڕوو (بەندی *11)*.

پاش نزیك شەست ساڵ ڕاگەیاندنی مافەکان "bill of rights" ی ساڵی 1689، سەرلەنوێ ماف و ئازادییەکانی پێشتر گوترابوون، سەلماندو هەندێك شتی تازە بەتایبەتی ماڤ بەرپرسیاران بۆ گەیاندنی خواستەکانی خۆیان بەدەستی پاشا، ئازادی هەڵبژاردنی پەرلەمان و هەروەها ئازادی گوتار و وتوێژ لە پەرلەماندا، خستە سەر. ئەم مافە جیاوازانە کە لە ئینگلتەرای سەدەی حەڤدەهەمدا بە فەرمی ناسرا، پیشاندەری خاوەنداریێتی تاك بوو بۆ بونێکی دیاریکراو لە بەرامبەر دەسەڵاتی سیاسیدا. ئەم دیاردەیە ئەگەری دروستبوونی جیاوازی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی ئامادە کرد و بەمشێوەیە ڕێگەی بۆ مۆدێرنەی سیاسی کردەوە. ئەم گۆڕانە هەرچەند خاو و لەڕووی مێژوویی و جوگرافیاوە سنوردار بوو، بەڵام ڕەنگدانەوەی لە بیری سیاسی بەتایبەتی بیرەکانی سپینۆزا، لۆك و مۆنتیسیکۆدا هەبوو، ئەمانەش هەریەکەیان بەشێوەی خۆی وەك مژدەبەخشانی مۆدێرنەی سیاسی، دەرکەوتن.

## 1- سپینۆزای و ئازادی بیرکردنەوە.

لەراستیدا سپینۆزا بە داواکردنی ئازادی بیرکردنەوە و دەربڕین، ماوەی خستە ناو کۆمەڵگای سیاسی و تاکەوە و بەمشێوەیە سەربەخۆی تاکی بەرامبەر بە کۆمەڵگا و دەسەڵاتی سیاسی ڕاگەیاند و بەمشێوەیە پرۆژە کۆنەکەی سوقرات کە دەیویست ئازادانە سەرقاڵی فەلسەفە بێت، سەرلەنوێ کردەوە. ئامانجی سەرەکی ئەو لە "وتارێك لە بارەی یەزدانناسی. سیاسی"(1679)بریتیە لە ئازادی بیرکردنەوە بۆ هەمووان و بەرگری لەم ئازادیە. ئەم ئازادیە بە مافێك سەبارەت بە کۆمەڵگای سیاسی و حوکمڕانان دەژمێرێت و نەك هەر هەڕەشەیەك نیە بۆ سەر ئاشتی و ئارامی دەوڵەت، بەڵکو بەپێچەوانەوە بۆ پاراستنی شتێکی پێویستە. لێرەوە دەسەڵاتی سیاسی دەبێت "هەر مرۆڤێك ئازاد بکات بۆئەوەی چۆن دەیەوێت بیر بکاتەوە و بیرەکانی خۆی دەرببڕێت".

سپینۆزا دەیویست ئەوە پیشانبدات کە "لە کۆماری سالاریەکی ئازاددا، هەموو کەسێك خاوەن ئازادی بیرکردنەوە و دەربڕینی بیروڕاکانی خۆیەتی". ئەویش وەك هۆبز بڕوای وابوو کۆمەڵگا لەسەر پەیمانێك راوەستاوە کە تاکەکان لە ڕێگەیەوە واز لە ماڤ سروشتی خۆیان دەهێنن و بە کۆمەڵگای دەسپێرن و تەنانەت دەڵێت "هەر تاکێك دەسەڵات و تواناکانی خۆی بەکۆمەڵگا دەبەخشێت". بەڵام تاکەکان ناچار نین هەموو مافە سروشتیەکانی خۆیان ببەخشن، بەڵکو دەتوانن هەندێکیان بۆ خۆیان ڕاگرن "هیچ کەس ناتوانێت هەموو مافە سروشتیەکانی خۆی لەدەستبدات. لێرەوە لە هەموو کۆمەڵگا بەدەزگایی بووەکاندا، هەموو فەرمانبەران بەپێی خەسڵەتێکی سروشتی، هەندێك داهێنانی کار دەپارێزن کە وەرگرتنەوەی ڕەنگە دەوڵەت ڕوبەڕووی مەترسیەکی گەورە بکاتەوە". تاکەکان ئەگەر سودمەند بن، تەنانەت دەتوانن پەیمانی خۆیان وەربگرنەوە. بەتایبەتی دەبێ سەرنج لەوە بدرێت کە تاکەکان ناتوانن لە ماڤ ئازادی بیرکردنەوەی خۆیان چاو بپۆشن. چونکە ئەمە

مافێکە قابیلی بەخشین نیە: "هەر مرۆڤێك لە بـــواری بیرکردنـــەوە و بـــیروڕادا خـــاوەن سەربەخۆییەکی تەواوە و هیچ کاتێك تەنانەت بـــە نیـــەتی خێـــریش، نـــاکرێ ئـــەم مافـــە ببەخشرێت".

دەســەڵاتی سیاســی نــە دەتوانێــت بەســەر زیهنی مرۆڤەکاندا فەرمان بکات و نە بیروڕاکان و یا بڕوای دینیان بەسەردا بسەپێنێت. چونکە تاکـەکان بـەپێی مافـە سروشـتیەکانی خۆیـان، هەمیـــشە ئـــازادی بیرکردنـــەوەی خۆیـــان، دەپـارێزن. دەبـێ ئـازادی بیرکردنـەوە بـەهۆی خەسـڵەتە سروشـتیەکانیەوە لـە کۆمـەڵگادا بپـــــارێزرێ و لەدەستدانیـــــشی بـــــەبێ دەسـتدرێژیکردن بـۆ سروشـتی مـرۆڤ مـومکین نیـە. سـپینۆزا بەپێـچەوانەی هـۆبزەوە "مافـە سروشـــتیەکان دەپارێزێـــت" و بـــڕوای وایـــە "دۆخــی سروشـتی" لــە کۆمـەڵگادا "بـەردەوام دەبێـت". لــە ئەنجامــدا لــە کتــێبی "وتــاری سیاســیدا"(*1677*) بــوون و بــەردەوامی مافــە سروشتیەکان لە کۆمەڵگادا، دەسەلمێنێ.

سـپینۆزا بـۆ ئاراسـتەکردنی تێڕوانینەکـەی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی کلاسیکی نێوان بیرکردنەوە و کارکردن و عەقڵ و ئیرادە. دەزانین توانایی بیرکردنەوە بەستراوە بە خودی تاکەوە و لێرەوە قابیلی بەخشین نیە، لەکاتێکدا مـافی کـارکردن بەسـتراوە بـە کۆمـەڵگاوە و لێـرەوە گواستراوەتەوە بۆ ئەو: "هەر تاکێك بە مەیل و ئارەزووی خۆی وازی لە مافی کارکردنی خۆی هێناوە، بەڵام وازی لە هیچ مافێکی بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندن نەهێناوە". پەیمانی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی رێکەوتنی مرۆڤەکان بۆ وازهێنان

لە مافی یەکەم (واتە مافی کارکردن) دروستبووە، نــەك بــۆ وازهێنــان لــە مــافی دوهــەم (مــافی بیرکردنـــەوە). کـــەوابوو نابێـــت یاســـاگەلێك دابڕێژرێت کە بیرکردنەوە یان باوەڕێك بسەپێنێ یان قەدەغە بکات. کارێکی وا هەم بێهودەیە و هــەم ترســناك، بێهودەیــە چــونکە ئــەمجۆرە یاســـایانە بـــێ کاریگـــەری و نـــەکردەن، و ترسناکیـشن چـونکە یاسـاگەلێکی لەمـچەشنە هەمیــشە ئــاژاوە دروســتدەکات. بــەڵێ تــەنها دەکرێ کرداری مرۆڤەکان بەدواداچونی یاسایی بۆ بکرێت، نـەك بـڕوا و قسەکانیان. لەڕاسـتیدا بیرکردنـــەوە لـــە دەرەوەی بـــواری توانـــای دەســەڵاتو یاســادایە: "سیــستەمی یاســارێژی هـــەرگیز نابێـــت لـــەبارەی بـــاوەڕ و بـــڕوای مرۆڤەکانەوە، حوکم و یاسا دابڕێژێت، مەگەر ئەوەی ئەم بڕوایانە پشێوی دروستبکەن و بنەما پشت پێبەستوەکان و نەتەوە، وێران بکەن."

لە دیدی سپینۆزاوە ئازادی بیرکردنەوە نەك هــەر ئــازادی فەلــسەفاندنە، بــەڵکو ئــازادی بڕوابوون و باوەڕهێنانیش دەگرێتەوە. بەڵام ئەم ئازادیــە تــەنها پەیوەنــدیان بــە بیرکردنــەوە و بــاوەڕی دەرونیـــەوە هەیــە، چــونکە کــردارە دەرونیـــەکان. بـــۆ نمونـــە رێبـــاز و نەریتـــە مەزهەبیـــەکان. پەیوەنـــدیان بـــە دەســـەڵاتی سیاسیەوە هەیە. هەروەها ئەم ئازادیە پێویستی بـە ئـازادی بیرکردنـەوە لـە رێگـەی فێربـوون و نوسینیــشەوە هەیــە. بــەڵام ئــازادی دەربــڕین کۆمەڵێك مەرجی هەیە: بەتایبەتی نابێت بیروڕا ئـــاژاوە گێڕەکـــان بڵاوبکرێنـــەوە و نابێـــت بڕیارەکـــانی دەســـەڵات و دەســـەڵاتداران، رەخنە بکرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێت سەرنج لەو خاڵە بدرێت کە سپینۆزا بە راگەیاندنی ئازادی بیرکردنەوە و دەربڕین، سنورێکی بۆ دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی دانا. جگە لەمەش سپینۆزا داوای مافێکی قابیلی نەسپاردن و بوارێك کە قابیلی دەستدرێژیکردن نیەی بۆ تاك دەکرد. بێگومان ئەم ئازادیە بەتەواوی دەرونیە و پەیوەندی بە کردارە دەرەکیەکانەوە نیە.

لە بابەتی دینیشدا تەنها لە بواری باوەڕ و بیروڕاکاندا بەکاردەهێنرێت، نەك لە بواری نەریتە دینیەکاندا. هەروەها کاریش ناکاتە سەر مۆڵکایەتی سامان و دارایی. لەگەڵ ئەمانەشدا هەر ئەم ئازادیە بەشێوەیەکی شاراوە دەست پێشخەری جیابونەوەی بواری تاکەکەسی و کۆمەڵگای سیاسی بوو. بەڵێ چیدی تاك تەنها بە ئەندامێکی دەوڵەت نەدەژمێررا کە هەموو مافەکانی خۆی بە کۆمەڵگا سپاردووەو بەشێوەیەی تەواو گوێڕایەڵی دەسەڵاتی سیاسی بێت. تاك بەشێوەیەکی سەقامگیر بوارێکی تایبەتی بۆ خۆی دەپاراست کە ئەگەر چی تەنها بواری بیرکردنەوەو دەربڕینی دەگرتەوە، بەڵام لەناو ئەم بوارەدا تەواو ئازاد بوو. سپینۆزا هێشتا بە جیابونەوەی نێوان دەوڵەتو کۆمەڵگای مەدەنی نەگەیشتبوو، بەڵام جیابونەوەی کۆمەڵگای سیاسی وبواری تایبەتی بیرکردنەوەی شەخسی راگەیاندوبەمشێوەیە بنەمای سەرەکی مۆدێرنەی سیاسی هێنایە پێشێ. کەمێك دورتر لۆك هەمانکاری بەشێوەیەکی تر، بە پێشکەوتن لەم رێگەیەدا گرتەبەر.

**2- لۆك و راگەیاندنی بواری تایبەتی**

جۆن لۆك لە وتاری "لەبارەی حکومەتی مەدەنیەوە"(*1690*) بونیادی کۆمەڵگا و دەسەڵاتی لەسەر پەیمانی کۆمەڵایەتی، واتە رێکەوتنی تاکەکان دامەزراند. تاکەکان بەشێوەیەکی ئازادانە کۆمەڵگا دروستدەکەن و دەسەڵاتی خۆیانی پێدەبەخشن: "لێرەدا تەنها کۆمەڵگای سیاسی هەیە کە تیایدا هەر ئەندامێك وازی لە دەسەڵاتی سروشتی خۆی هێناوە و بە کۆمەڵگای سپاردووە."

بەڵام لەبەر چەند هۆیەك رێگەی کارکردنی لۆك لە رێگەی کارکردنی هۆبز جیاوازە. سەرەتا لای لۆك دۆخی سروشتی نەك دۆخی جەنگ، بەڵکو دۆخی ئاشتیە کە تاکەکان تیایدا ئازاد و یەکسانن. لێرەوە قسەکردن لەسەر دەرچون نیە لە دۆخی سروشتی، بەڵکو قسە لەسەر پڕکردنەوە یان کەمکردنەوەی کەموکوڕیەکانێتی، بۆئەوەی رێگە لە خلیسکانی بەرەو جەنگ بگیرێت. ئاشکرایە هەر کاتێك دەستدرێژی بکرێتە سەر یاسای سروشتی، هەر کەس دەتوانێت بەرگری لە خۆی بکات. بەڵام گەر مرۆڤەکان بە داوەری خۆیان بژمێرین، ئەوا ئەمە چەند مەترسیەکی تێدایە و دەتوانێ ببێتە هۆی دۆخی جەنگ، رێك لەبەر خۆدورخستنەوە لەم مەترسیانەیە کە مرۆڤەکان دەست دەکەن بە دروستکردنی کۆمەڵگا و حکومەتی مەدەنی. ئەم حکومەتەش وەك دەزانین بەرپرسیارە لە رەچاوکردنی یاسای سروشتی و پاراستنی ئاشتی. لە ئەنجامدا " حکومەتی مەدەنی بریتیە لە تەکبیرێکی تایبەت بۆ نەهێشتنی کەموکوڕیەکانی دۆخی سروشتی". لێرەوە ژیان

لەناو کۆمەڵگادا کۆتایی بە دۆخی سروشتی ناهێنێت، بەڵکو هەم رایدەگرێت و هەم هەوڵدەدات بیپارێزێ: "ناچاریەکانی لە یاسای سروشتیەوە دێن، لە کۆمەڵگادا راناوەستن، بەڵکو لە زۆرێك لە حاڵەتەکاندا بەهێزتریش دەبن".

لە دیدی لۆکدا هەرچەندە تاکەکان بۆ دروستکردنی حکومەتی مەدەنی، دەسەڵاتی سروشتی خۆیان بە کۆمەڵگا دەسپێرن، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هۆبز دەیەوێت، چاوپۆشی لە هەموو مافەکانی خۆیان ناکەن و دەسەڵاتێکی رەها بەرپا ناکەن. لەئەنجامدا نەك هەر خۆیان بۆ ئەندامێکی سادەی کۆمەڵگا و فەرمانبەرانی دەسەڵات دانەبەزێنن، بەڵکو تاکێتی تایبەتی خۆیان دەپارێزن. حکومەت دەوری "پارێزگاری کردن لە موڵکیان" واتە هەرچی کە موڵکی ئەوانە وەك ژیان، ئازادی و داراییەکانیان، دەبینێت. جگە لەمە تاکەکان چاودێری دەسەڵات دەکەن و لە حاڵەتی پێویستدا دەتوانن خراپ بەکارهێنانەکانیان و زیادەرەویەکانیان، کۆنترۆڵ بکەن. لەمەش زیاتر هەر کاتێك حکومەتکاران رەفتارێکی دیکتاتۆریانەو ناداپەروەرانە بگرنەبەر، ئەوا تاکەکان دەتوانن شۆرشیان دژ بکەن و بیانگۆڕن. کەوابوو تاکەکان نە بەشێوەیەکی تەواو لەکۆمەڵگادا تواونەتەوە، نە بەتەواوی فەرمانبەری دەسەڵاتن. بەڵکو ماوەیەك لەنێوان خۆیان و کۆمەڵگا و حکومەتدا دەپارێزن. لەراستیدا ئەوان بوارێکی تایبەتی کە قابیلی بەخشین و دەستدرێژی کردن نییە، دەپارێزن و دەتوانن لە بەرامبەر ئەگەری خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتدا، بیپارێزن.

بەمشێوەیە بوو کە بنەمای جیاوازی نێوان بواری تایبەتی و کۆمەڵگای سیاسی، بونیادنرا. هەرچەندە کۆمەڵگای سیاسی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی تاکەکان، بەپێویست دەزانرێت، بەڵام لەراستیدا هیچ نیە جگە لە ئامرازێك. لەراستیدا حکومەتی مەدەنی پەیرەوی ئەو ئامانجانەیە کە دەبێت خزمەتیان بکات. ئاشکرایە ئەم خاڵە تۆوی مۆدێرنەی سیاسی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە و لە دوو بواری سەرەکیدا واتە موڵکایەتی و دیندا، بەکارهێنرا و لە هەردوو بوارەکەشدا مافەکانی تاك بە روونی سەلمێنرا.

دەبێ سەرنج لەوە بدەین کە لۆك تێروانینێکی تازە و نوێی بۆ موڵکایەتی هێنایە پێشێ. لەراستیدا لە دیدی لۆکدا وشەی موڵکایەتی وەسفی موڵکایەتی هەموو شتێکی مرۆڤ واتە ژیان و دارایی و ئازادیەکانی دەکات. کەوابوو مرۆڤ بە موڵکداری خۆی و کردارەکانی خۆی دەژمێرێت. لۆك موڵکایەتی داراییەکان و سامان لەسەر بناغەی تاك یا وردتر لەسەر کارەکانی دادەمەزرێنێ. لە کاتێکدا لای هۆبز موڵکایەتی لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە حوکمڕانەوە و هەر ئەم دەسەڵاتەش سەرقاڵی بەشی موڵکایەتی دەبێت. لەراستیدا: "هەرکەس خاوەن مافێکی تایبەتە سەبارەت بەخودی خۆی *(...)* کارکردن دەرئەنجامی جەستە و هەروەها بەرهەمی دەستەکانێتی (...) لێرەوە بە داراییەکانی ئەو دەژمێرێن. کەوابوو هەرچیەك بە رەنج و زەحمەت لە دۆخی

سروشـــــتیدا بەدەســــــتیهێناوە، تــــــەنها موڵکی خۆیەتی."

تـاك موڵكایـەتی لـە دەسـەڵاتی حوكمڕانـەوە وەرناگرێــت، بــەڵكو بــەهۆی هــەوڵ و كــاری تایبــەتی خۆیــەوە بەدەســتی دێنێــت. لێــرەوە موڵكایـــەتی بـــەماف سروشـــتی تـــاك، وەك دروســـتكەری ئـــەم موڵكایەتیـــە دەژمێرێـــت. لەبەرئـەوە پەیوەسـت نیـە بـە دەوڵـەت یـان حكومەتـەوە. موڵكایـەتی شـتەكان بریتیـە لـە گواستنەوەی شتەكان لە بواری هاوبەشەوە، بۆ بـواری تایبـەتی لەرێگـەی كـارەوە: "كـار كـە مـوڵكی منـە، بـەدەرهێنانی شـتەكان لـە دۆخـی سۆشیالیستی (كـە تـا ھەنوكـە تیایـدا بوون) لـە راسـیتدا ئـەو شـتانەی سـەقامگیر كـرد و كردیـە مـوڵكی مـن". كـەوابوو موڵكایـەتی نـەك لەسـەر بناغـەی كومـەڵگا یـان فـەرمانڕەوا، بـەڵكو لەسـەر كــاری تــاك دامــەزراوە "مــرۆڤ (...)وەك ئاغــا و موڵكــداری كەســی خــۆی و هــەموو كــردار و كارەكـانی خـۆی، هەمیـشە بنـەمای سـەرەكی موڵكایـەتی لەخۆیـدا هـەڵگرتووە". بەمـشێوەیە لۆك بە سەندنی موڵكایەتی لەدەستی دەسەڵاتی فـەرمانڕەوا و بەسـتنەوەی بـە كـاری تاكـەوە، جیابونـەوەی بـواری سیاسـی و بـواری تایبـەتی كـردە شـتێكی پراكتیكـی و سـەربەخۆی تـاكی لەبەرامبەر دەوڵەتدا راگەیاند.

هــەروەها لــۆك بــە جیاكردنــەوەی دیــن لــە سیاسەت و كەنیشە لە دەوڵـەت، بە ئـەنجامێكی هاوشێوە گەیشت. لەكاتێكدا هۆبز دەیوست ئەم دوانـە یـەكبخات. لـۆك لـە نوسـینێكدا بـەناوی "وتارێــــــك لـــــــەبارەی لێكبوردنــــــــەوە" (1689)بـــەروونی مەســـەلەی دەوڵـــەتی لـــە مەسەلەی دینی جیا دەكاتـەوە. لـە دیدی لۆكدا كەنیــسە و دەوڵــەت بــەهۆی سروشــت و ئامانجــەكانیان لەیەكــدی جیــاوازن. دەوڵــەت دەزگایەكــە بــە سروشــتێكی مــادی و ئــەم دنیاییەوە كە تەنها ئامانجی مادی و دنیایی بە هـۆی ئـامرازی مـادی و دنیاییـەوە، دێنێتـە دی. دەســـەڵاتی سیاســی تــەنها ســەرقاڵی ئــەو مەسەلانەیە كە پەیوەندی بە شتە كۆمەڵایـەتی و مەدەنیەكانەوە هەیـە و نابێت سـەرقاڵی مەسـەلە مەعنەویــەكان بێــت. دیــن نــە پەیوەنــدی بــە دەوڵەتـەوە هەیـە، نـە بـە حكومـەتی مەدەنیـەوە. لەراســتیدا دەســەڵاتی سیاســی لــە شــتە مەعنەویەكاندا دەسەڵاتی نیە و لێرەوە ناتوانێت لەم بوارەدا هیچ كارێك ئەنجامبدات. لە ئەنجامدا بــە پێــچەوانەی بــاوەڕی هــۆبزەوە، دەوڵــەتی مەسیحی ناتوانێت بوونی هەبێت.

لەلایـەكی دیـەوە كەنیسەش كۆمەڵگایـەكی ئــازاد و ســەربەخۆیە. چــونكە هــەر مرۆڤێــك بەشــێوەیەكی ئازادانــە دیــن و كەنیــسەكەی هەڵدەبـژێرێ. بـەڵێ ئـازادی دیـن و مەزهـەب لـە دەوەرەی دەســـــەڵاتی دەوڵەتدایـــــە و تـــــەنها پەیوەنـدی بـە تاكـەوە هەیـە. لـەم قسانەوە ئـەو دەرئەنجامــە وەردەگــرین كــە دیــن بەتــەوای سەربەخۆیە لە دەوڵـەت و كەنیسە لـە دەسـەڵاتی سیاســی رزگــاری بــووە. كــەوابوو دەســەڵاتی سیاسی ناتوانێت دین یان باوەڕێك بسەپێنێت یان قەدەغە بكات، و سەرەڕای ئەمەش ناتوانێت دەسـت لـە مەسـەلەی بنـەماكانی دیـن و نەریتـە دینیەكانــەوە بـدات. بەمـشێوەیە سـنورەكانی دەوڵەت بەروونی دیاریكراوە و كەوابوو كەنیسە دەتوانێت سەربەخۆ لە دەوڵەت بوونی هەبێت.

لەئەنجامدا لەپاڵ دەوڵەتدا، بوونی بوارێکی جیاواز و جیابۆوە، واتە بواری باوەڕ و ویژدانی فەردی و مەسەلە مەعنەویەکان سەلمێنرا. لۆك بە ڕاگەیاندنی ئازادی شەخسی لە مەسەلە دینیەکاندا و بە سەربەخۆیی کەنیسە لە دەوڵەت، لەراستیدا تاك و دینی لە کۆمەڵگای سیاسی و دەسەڵات جیاکردەوە. لەراستیدا لۆك لێرەدا ڕێك وەك مەسەلەی موڵکایەتی، بە جیاکردنەوەی سیاسەت لە دین، جیابونەوەی بواری سیاسی لە بواری تایبەتی هێنایە پێشیٚ و بەمشێوەیە بنەمای مۆدێرنەی سیاسی بە پیشاندانی ماوەی نێوان دەوڵەت و تاك، بەدوو شێوە هێنایە پێشیٚ:

لەلایەکەوە تاکەکان مافە سروشتیەکانی خۆیان دەپارێزن و کارکردنی دەوڵەت کۆنترۆڵ دەکەن و لەلایەکی دیەوە بواری تایبەتی چیدی وەك سپینۆزا بیری لێدەکردەوە، بۆ بیرکردنەوە کورت نابێتەوە، بەڵکو موڵکایەتی و دینیش دەگرێتەوە.

ئاشکرایە ئەم تێڕوانینە لە چاو تێڕوانینی هۆبزدا، تازەیە. لێرەوە دەکریٚ لۆك بە سەرچاوەی مافەکانی مرۆۋ بزانرێت. چونکە ئازادی بیرورا و ویژدان و مەزهەب و دین، ماڤی موڵکایەتی و ماڤ بەرەنگاری ستەمیان، ڕاگەیاند. نیو سەدە پاش لۆك، مۆنتیسیکۆش بە گرتنی ڕێگەگەلێکی دی، دەستی کرد بە زەمینە خۆشکردن بۆ مۆدێرنەی سیاسی.

## 3ـ مۆنتسیکۆ :

مۆنتسیکۆ بە پێچەوانەی سپینۆزا و لۆکەوە، پرسیار لە بنەمای کۆمەڵگا ناکات و نامۆیە بە تیورەی پەیمانی کۆمەڵایەتی و تیورەی سپاردنی مافەکانی تاك بە کۆمەڵگا. لەبارەی پاراستنی مافە فەردیەکان پەیوەندیداری بە بیرکردنەوە و دینەوە نیگەران نیە و هێندەش سەرقاڵی تاك بەناوی تاکەوە نیە. مۆنتسیکۆ لە کتێبی "ڕۆحی یاساکاندا" (1748) لەراستیدا بەنیازە تاکو دەوری یاسا لە ڕێکخستنی ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری و دینیدا تاقیبکاتەوە. لێرەوە گەرچی واقعی هەبوو بەشێوەیەکی مەنهەجی شیدەکاتەوە، بەڵام بەدوای سەقامگیری بوارێکی سەربەخۆ لە دەوڵەت ناگەڕێت. سەرەڕای ئەمە بیر لە جیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا ناکاتەوە و تەنانەت دەوڵەت بە "کۆمەڵگایەك" پێناس دەکات کە "تیایدا یاسا بوونی هەیە" .

بەڵیٚ مۆنتسیکۆ لەبنەڕەتدا گرنگی بە ئازادی سیاسی دەدات، نەك بە ئازادی فەردی و تەماشای مرۆۋ وەك هاوڵاتی یان ئەندامی دەوڵەت دەکات، نەك وەك تاکێکی سەربەخۆ. مۆنتسیکۆ ئازادی تاکەکەسی بەدوو شێوەی جیاواز وێنا دەکات: لەلایەکەوە لە پەیوەندیدا بە ڕژێمی حکومەتی یان حکومەتەوە و لێرەوە باس، باسی ئازادی ڕزێمی حکومەتی یان حکومەتە، لەلایەکی دیەوە لە پەیوەندیدا بە هاوڵاتیەوە و لێرەوە باس، باسی ئازادی هاوڵاتیە. ئەم دوو ئازادیە لەیەك جیاوازن و دەکریٚ یەکێکیان بەجیا لەوی دیان هەبێت: "ڕەنگە وابێتە پێشیٚ کە ڕژێمی حکومەتی ئازاد بێت، بەڵام هاوڵاتی ئازاد نەبێت (و بەپێچەوانەوە) ڕەنگە هاوڵاتی ئازاد بێت، بەڵام ڕژێمی حکومەتی ئازاد نەبێت". لەراستیدا ئەم

دوو ئازادیە نە بەیەك شێوە پێناس دەکرێن و نە بــە ئــامرازی چــونیەك دەســتەبەر دەکــرێن. بەمشێوەیە مونتسیکۆ لە نێوان "یاساگەلێك کە ئــازادی سیاســی لــە پەیوەندیــدا بــە رژێمــی حکومەتیەوە دروستدەکات و یاساگەلێك کە ئەم ئازادیــە لـــە پەیوەندیـــدا بـــە هاوڵاتیـــەوە دروستدەکات" جیاوازی دەکات. مۆنتسیکۆ بۆ هــەر یــەك لــەم کۆمەڵــە یاسـایانە، بەشـێك لــە کتێبەکانی خۆی تەرخانکردوە (7.6).

ئــازادی رژێمــی حکومــەتی. یــا "ئــازادی سیاسی لە پەیوەندیدا بە رژێمی حکومەتیەوە". هــەمان ئــازادی حکومــەت یــان ئــازادی دەوڵــەت دیاریدەکات و پەیوەستە بە رێکخستنی رژێمی سیاسیەوە. ئەم ئازادیە بەشێوەیەکی پراکتیکی پەیوەندی بە ئازادی گشتی سەردەمی دێرینــەوە هەیــە: "ئــازادی رژێمــی حکومــەتی بەشــێوەی دابەشــکردنی ســێ دەســەڵاتی (تەشــریعی و تــەنفیزی و دادوەری) دێتــە دی". بە قسەیەکی دی "ئەم ئازادیە لە جیاکردنەوە و دابەشکردنی ئــەم ســێ دەســەڵاتە لەیەکــدی دروســتدەبێت و دواجــار یاســا و بەتایبــەتی دەســتور زامــنی دەکــات. لەبەرئەمــە مۆنتــسیکۆ پەیوەندیــەك لـــــەنێوان ئـــــازادی سیاســـــی و یاســـــادا دروســـــتدەکات و یەکـــــەم لـــــە پەیوەندیـــــدا بەدوهەمــەوە پێناســدەکات: "ئــازادی بریتیــە لــە مافی ئەنجامدانی هــەموو ئــەو شـتانەی کــە یاسا رێگەی پێداوە" .

ئــازادی سیاســی لــە "ئــازادی سروشــتی" و ســـەربەخۆی تاکەکەســـی -کەلەســـەر بناغـــەی ئەنجامــدانی هەرچــیەك کــە ویــسترا، دامــەزراوە. جیــاوازە. چــونکە پێویــستی بــە ملکەچــی بــۆ یاســاکان (و تــەنها یاســاکان) هەیــە. ئــازادی سیاســـــی بـــــە پێـــــچەوانەی ئـــــازادی سروشــتیەوە"لەســەر بناغــەی ئەنجامــدانی هەرچیەك کــە ویــستمان، دانەمــەزراوە"، بــەڵکو "تــەنها دەتوانێــت لەســەر بناغــەی توانــای ئەنجامـــدانی ئـــەوەی دەبـــێ بیخـــوازین و ناچـــارنەبوون بەئەنجامـــدانی ئـــەوەی نـــابێ بمانــەوێت، دامــەزراوە". بەقسەیەکی تــر نــاکرێ هیچ کەسێك بە ئەنجامدانی کارێك ناچار بکرێت کە یاسا ناچار بەئەنجامدانی نەکردووە و ناکرێ هیچ کەس لە ئەنجامدانی کارێك قەدەغە بکرێت کە یاسا رێگەی پێداوە.

بەمــشێوەیە ئــازادی سیاســی بەتونــدی بەســتراوە بــە دەســتورەکانەوە کــە دابەشــکردنی سێ دەسەڵاتەکەی دیاریکردووە. لێرەوە ئازادی سیاســی "تــەنها لــە حکومەتــە هاوســەنگەکاندا دەبینرێتــەوە". واتــە لــەو حکومەتانــەدا کــە ســێ دەســـــەڵاتەکە لەیـــــەك جیـــــان و لەدەســـــتی جیاوازدان. بەڵێ ئەم ئازادیە تەنها لەجێگەیەکدا دەدۆزرێتــــەوە "کــــە دەســــەڵات خــــراپ بــەکارناهێنرێت" واتــە کاتێــك ئــەو مەرجانــەی گوتمـــان، هاتبنـــە دی. بـــەڵام لەبەرئـــەوەی مرۆڤەکان ئاراستەیان بەرەو خراپ بەکارهێنانی دەســەڵاتە، کــەوابوو دەبێــت ســنورگەلێك بەســەر دەسەڵاتدا بسەپێنرێ، بۆئەوەی ئازادی سیاسی مــومکین بێــت: "بۆئــەوەی کــەس نــەتوانێت دەســەڵات خــراپ بــەکار بهێنێــت، دەبــێ کارێــك بکرێت کە دەسەڵات رێگە لە دەسەڵات بگرێت". مۆنتسیکۆ حاڵەتی ئینگلتەرا بە نمونە دەزانێت، چــونکە رژێمــی حکومــەتی ئــەم وڵاتــە "ئــازادی سیاســی "..." کردووە بە ئامانجی راستەوخۆی

خۆی". مۆنتسیکۆ بەگشتی وابیردەکاتەوە کە ئازادی سیاسی. واتە ئازادی حکومەت. جیابونەوەی دەسەڵاتەکان ناچار دەکات. بەپێچەوانەوە گەر دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی یەکێك بن، یان گەر دەسەڵاتی داوەری لەو دوانە جیا نەبێت، ئازادی سیاسیش بوونی نابێت.

گەرچی ئازادی رژێمی حکومەتی یان حکومەت بیرهێنەرەوەی ئازادی گشتی دەوڵەتشاری دێرینە، بەڵام ئەم ئازادیە گشتیە لەو روەوە نمونە نیە کە مۆنتسیکۆ رەگەزێکی بێگانە لەگەڵیدا واتە نوێنەرایەتی، دەهێنێتە پێشێ. لە دیدی مۆنتسیکۆدا لەراستیدا ئەستەمە و تەنانەت مومکین نیە خودی خەڵکی کاری دەسەڵاتی تەشریعی ئەنجامبدەن، کەوابوو دەبێت " ئەوەی کە خۆیان ناتوانن، بەدەستی نوێنەرەکانیان ئەنجامبدرێت". هەروەها لەبەرئەوەی خەڵك ناتوانن وەك دەوڵەتشاری دێرین، خۆیان کاری دەسەڵاتی تەنفیزی ئەنجامبدەن، کەوابوو بۆ حکومەتکردن ناچارن پەنا بۆ نوێنەرەکانیان بەرن. لەبەرئەمە مۆنتسیکۆ پەنجەی خستە سەر ئەو خاڵەی کە نوێنەرایەتی دەبێت بە تازەگەریەکی ریشەیی، سەبارەت بە دەوڵەتشاری دێرین دابنرێت: "کەموکوڕی گەورەی کۆماریەکانی پێشمۆدێرن ئەوەبوو خەڵکی خاوەن ماف بڕیاردانی بڕاوە و کارگەر بوون. ئاشکرایە بڕیارەکان دەبێ جێبەجێ بکرێن و ئەمەش کارێکە کە خەڵکی بەهیچ شێوەیەك توانای ئەنجامدانیان نیە. لێرەوە خەڵکی دەبێ تەنها بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان، بێنە ناو بواری حکومەتەوە.

ئەمە کارێکە کە دەتوانن ئەنجامیبدەن". لێرەوە نوێنەرایەتی، رەگەزی جیاکەرەوەی دەوڵەتی مۆنتسیکۆ و دەوڵەتشاری دێرینە.

وەك بینیمان لەپاڵ ئازادی حکومەتدا، ئازادیەکی تری جیاواز هەیە کە ئازادی هاوڵاتی یان "ئازادی سیاسی لەپەیوەندیدا بە هاوڵاتیە"وەیە. بە دەربڕینێکی راستر ئەم ئازادیە پەیوەندی بە مرۆڤێکەوە هەیە کە چ وەك هاوڵاتی و چ وەك تاك وێنا کراوە. لە بنەڕەتدا ئازادی هاوڵاتی بە ئاسایشی شەخسی یان لانیکەم بە هەستکردن بە ئاسایشی شەخسی پێناسەدەکرێت: "ئەم ئازادیە لەسەر بناغەی ئاسایش یان ئەو تێڕوانینەی مرۆڤەکان بۆ ئاسایش هەیانە راوەستاوە". لێرەوە داب و نەریتەکان، رەفتارە کۆمەڵایەتیەکان، "هەندێك یاسای مەدەنی" و بەتایبەتی یاساکانی تاوان، ئەم ئازادیە زامندەکەن. بەڵام بۆئەوەی ئازادی فەردی هەبێت "حکومەت دەبێت بەشێوەیەك دروستببێت کە هیچ هاوڵاتیەك لە هاوڵاتیەکی دی. تەنانەت گەر ئەم هاوڵاتیە میر یان بەرپرسیارێکیش بێت. نەترسێت". بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت سێ دەسەڵاتەکە لەیەکدی جیاببنەوە. جگە لەمەش لەو روەوە کە تۆمەتە گشتی یان تایبەتیەکان هەڕەشە لە ئاسایش دەکەن، کەوابوو یاساکانی تاوان گەلێك گرنگن، چونکە "ئازادی هاوڵاتی لە بنەڕەتەوە پەیوەندی بە خەسڵەتی باشی ئەوانەوە هەیە" .

شایانی باسکردنە مۆنتسیکۆ ئازادی هاوڵاتی یان ئاسایشی شەخسی کورتدەکاتەوە بۆ نەترسان لە دەسەڵاتی سیاسی. ئەم تێڕوانینە نێگەتیڤە ئەو نیگەرانیە تەفسیری

دەکات کە بەرامبەر خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات هەیەتی. لەراستیدا قسە لەسەر ئازادی سیاسیە کە یاساکان و جیابونەوەی دەسەڵاتەکان، زامنی دەکەن و پشتی بە رزگاربوونی هاولاتی لە ستەمکاری دەسەلات بەستووە. بەلام ئەم تیروانینە لەبەرئەوەی لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئازادی هاولاتی (بەشداریکردن لە دەسەلاتدا، کۆنترۆلی کارکردنی حکومەت و گۆرانی حکومەتەکان) لەبەرچاو ناگرێت، سنورداره.

جگە لەمەش مۆنتسیکۆ باسی ئازادی هاولاتی دەکات نەك ئازادی فەرد. لێرەوە بەگشتی زۆرتر باسی هاولاتی دەکات تا تاك: لە بەرهەمەکانیدا زۆر وشەی هاولاتی دەبینین (*280* جار تەنها لەکتێبی رۆحی یاساکاندا) لەکاتێکدا بەدەگمەن چاومان بە وشەی تاك دەکەوێت (تەنها چوار جار لەو کتێبەدا و *7*جار لەسەرجەم بەرهەمەکانیدا). ئاشکرایە مۆنتسیکۆ بەر لەتاك، گرنگی بە هاولاتی دەدات. بەلێ هاولاتی جێگەیەکی تایبەتی لە بیرکردنەوەکانیدا هەیە، لەکاتێکدا تاك ئەوەندە گرنگی نیە و بەکردەوە نادیارە. لێرەوە هەندێك راستیان گوتووە کە دەلێن "ئامادەبوونی بەرچاوی هاولاتی، رونکەرەوەی ونبوونی تاکە "لەراستیدا ئەو دەورە سەرەکیەی بە هاولاتی ـ واتە بە ئەندامی دەولەت ـ بەخشراوە، سەرنج نەدان لەتاك وەك تاك، روندەکاتەوە.

لەگەل هەموو ئەمانەشدا مۆنتسیکۆ جیاوازی کۆمەلگا و ئەو مرۆڤانەی دروستی دەکەن، فەرامۆش ناکات. چونکە دەشێت کۆمەلگا لەناوبچێت، بێئەوەی ئەو مرۆڤانەی دروستیان کردووە لەناو بچن: "کۆمەلگا بریتیە لە کۆبونەوەی مرۆڤە دیارنەکراوەکان، نەك دیارکراوەکان. دەشێت هاولاتی لەناوبچێت و مرۆڤ بمێنێتەوە". هەروەها جیاوازی نێوان هاولاتی وەك ئەندامێکی دەولەت و "مرۆڤ" وەك تاك، فەرامۆشناکات و بروای وایە هاولاتی پتر یاسا و تاك پتر داب و نەریتەکان رێنمایی دەکەن: "یاساکان زۆرتر کردارەکانی هاولاتی رێکدەخەن" لەکاتێکدا "داب و نەریتەکان زۆرتر کرداری مرۆڤەکان رێکدەخەن". بەلام مۆنتسیکۆ پێ لەسەر ئەم جیاوازیە داناگرێت و دەرئەنجامی پراکتیکی بۆ ئازادیە فەردیەکان لێوە بەدەست ناهینێت. لێرەوە لەبارەی دینەوە. بەپێچەوانەی لۆکەوە. بەدوای بەرگریکردن لە ئازادی بیروڕا و ویژدان و مەزهەب و دینەوە نیە، بەلکو نیگەرانی ئاشتی و ئارامی کۆمەلایەتی و رێکخستنی گشتیە.

بەپێچەوانەوە لەبارەی مولکایەتیە بەروونی جەخت لە مافەکانی مرۆڤ لەبەرامبە دەولەتدا دەکات و بروای وایە کە "وتنی ئەوەی دارایی تایبەتی دەبێت تەسلیمی دارایی گشتی بێت، سەفسەتەیە". مۆنتسیکۆ بناغەی مولکایەتی لەسەر یاسا دادەنێت، نەك وەك لۆك لەسەر بناغەی کارکردن. لێرەوە لەم خالەدا پێدەچێت لە هۆبزەوە نزیك بێت. بە دەربرینێکی وردتر تازەگەری مۆنتسیکۆ لەوەدایە کە بونیادی مولکایەتی نەك لەسەر بناغەی دەستور، بەلکو لەسەر بناغەی یاسا مەدەنیەکان، دادەرێژێ. کەوابوو مۆلکایەتی بەستراوە بە مافێکی مەدەنیەوە کە پەیوەندی نێوان هاولاتیان رێکدەخات، نەك بە مافی سیاسیەوە کە

پەیوەندی بە پەیوەندییەکانی نێوان فەرمانبەران و فەرمانڕەوایەنەوە هەیە. یاسا سیاسییەکان، ئازادی و یاسا مەدەنییەکان و موڵکایەتی بۆ مرۆڤەکان بەرهەمدێنێت. لە دەرئەنجامدا موڵکایەتی تەنها پەیوەندی بە یاسا مەدەنیەکانەوە هەیە کە زامنی "موڵکایەتین"و یاسا سیاسییەکان ناتوانن کاریان تێبکەن. بە دەربڕینێکی دی موڵکایەتی فەردی بە ڕەوا دەژمێرێت و "دارایی گشتیش بەردەوام بەشێوەیەکە هەرکەس بتوانێت بەشێوەیەکی نەگۆڕ ئەو موڵکایەتیانەی یاسا مەدەنییەکان پێی بەخشیووە، بپارێزێ". کەوابوو دەسەڵاتی سیاسی ناتوانێت بە یارمەتی یاسای سیاسی، دەست بەسەر موڵکایەتی تاکی ئاساییدا بگرێت، چونکە یاسا مەدەنیەکان پارێزگاری لەم موڵکایەتیە دەکەن. دیارە لە حاڵەتی پێویستدا دەسەڵاتی سیاسی دەتوانێت هاوڵاتییەك ناچار بە بەخشینی داراییەکەی بکات، بەڵام لەم حاڵەتەدا دەبێت قەرەبووی بکاتەوە. سەرنج لەوە بدەین کە ئەم مەرجە بەخواستێکی تازە دەژمێرێت. بەمشێوەیە مۆنتسیکۆ بەروونی مافی موڵکایەتی و لێرەوە بوونی بوارێکی سەربەخۆ لە دەوڵەت دەسەلمێنێ. دەکرێ بگوترێت مۆنتسیکۆ بەشێوەیەکی گشتی جیاوازی لەنێوان مافی سیاسی و مافی مەدەنیدا دەکات و بڕوای وایە نابێت ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە مافی مەدەنییەوە، بە مافی سیاسی ڕێکبخرێت. بەمشێوەیە مۆنتسیکۆ بنەمای جیابونەوەی مەسەلەی سیاسی لە مەسەلەی مەدەنی، واتە جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای هێنایە پێشێ.

مۆنتسیکۆ بەو نیگرانیەی کە بۆ ئازادی هاوڵاتی پێشانیدا، پێشکەوتنێکی هەستپێکراوی بەدیهێنا. دیارە مۆنتسیکۆ ئازادی هاوڵاتی لەگەڵ ئاسایشی شەخسیدا بەیەك شت دەزانی. بەڵێ لەپاڵ ئازادی گشتی دەوڵەتدا، ئازادیەکی تازە واتە ئازادی هاوڵاتی پەیدابوو کە ناوەڕۆکەکەی هەمان ئاسایشی هاوڵاتی بوو لەبەرامبەر دەسەڵاتی سیاسیدا. هەرچەندە ئەم ئازادیە خەسڵەتێکی سیاسی هەیە، بەڵام پەیوەندی بە تاکیشەوە هەیە و پارێزگاری لە بەرامبەر دەسەڵاتدا لێدەکات. بەمشێوەیە مۆنتسیکۆ تەنها بە ئازادی گشتی دەوڵەت وازی نەهێنا، بەڵکو ئازادی شەخسی هاوڵاتیشی سەلماندو مافی موڵکایەتی بۆ تاك بە فەرمی ناسی. هەروەها جیاکاری لەنێوان هاوڵاتی و دەوڵەت و نێوان مرۆڤ و دەسەڵاتدا کرد. هەر ئەم خاڵەش ڕێگەی بۆ دروستبوونی بوارێکی تایبەتی لە دەرەوەی باڵادەستی دەسەڵات کە خاوەن سەربەخۆی خۆیەتی، خۆشکرد. کەوابوو مۆنتسیکۆ یەکەم هەنگاوی بۆ بەدیهێنانی جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا نا و بەشێوەی خۆی ڕێگەی بۆ مۆدێرنەی سیاسی کردەوە. چەند ساڵێك دوای ئەوە لە ڕاگەیاندنی ساڵی *1789*دا ئاسایش و موڵکایەتی وەك ئازادی شەخسی، لەناو مافەکانی مرۆڤدا دەرکەوتن (بەندی*2*.) بەڵێ بەم تێکستە شۆڕشگێرانەیە بوو کە مۆدێرنەی سیاسی لە فەرەنسادا، دەرکەوت.

**سەرچاوە:**

فەسڵی یەکەمی کتێبی: (مۆریس بارییە، مدرنیتەی سیاسی، و: عبدالوهاب احمدی. تهران/اگه. *1383*)

# خێزانە حیزبییە گەورەكانی ئەوروپا

د. ئەحمد نەقیب زادە

لە فارسییەوە: ئیسماعیل شێخ موراد

دوو هۆكـار هەیـە كـە وامـان لێـدەكات قسە لەسەر حیزبە گەورەكان بكەین:

یەكەمیان، مێژوو فەرهەنگی هاوبەشی وڵاتە ئەوروپاییەكانە كە بووە بەهۆی دروست بوونی حیزبی هاوچەشن لەم وڵاتانەدا.

دووەمیشیان: گەشەكردنی ئەو لایانانەیە كە پەیوەندی نێوان ئەم جۆرە حیزبانەی ئاسانترو عەمەلی كردووەتەوە.

هەندێك لەم خێزانە حیزبیانە، وەكو خێزانی سۆسیالیستەكان، توانیویانە بە جۆرێك پەیوەندی لەنێوان خۆیاندا بهێننە ئاراوە كە هێزێكی فراوانو نێودەوڵەتی دروست بكەن كە هێزی ئەنتەرناسیونالی سۆسیالیست، یان (بین میللی دووەمە). ئەم هۆكارەش بە تایبەتی دوای ئەوە دێت كە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەوروپادا لە ساڵی 1979دا بە شێوەی راپرسی گرنگی تایبەتی پەیداكرد چونكە حیزبە هاوچەشنەكانی وڵاتە جیاوازەكانی ئەوروپا، لە توانایاندا بوو كە فراكسیۆنێكی سەربەخۆ لە پەرلەمانی ئەوروپادا بۆ خۆیان دروست بكەن.

ئەم خێزانانە، دەتوانرێ لەسەرهەمان چوار نیزاعی ناسراوی لای(رككان) دابەش بكرێت. شۆڕشی نەتەوەیی، كە دروستكەری دوو ناكۆكی(دینو دەوڵەت) لەلایەكو (ناوەندو دەوروبەر) لەلایەكی ترەوە، بوو بەهۆی ئەوەی كە چوار خێزانی حیزبی دروست بێت. كە حیزبە دیموكرات مەسیحییەكان(دینی)و حیزبە كۆماری خوازەكان (لایك یان عەلمانی)و حیزبە ناوەندگەراكانو فیدراڵەكان بوون.

شۆڕشی پیشەسازی كە لەلایەك شارولادێو لەلایەكی ترەوە كاروسەرمایەی لە بەرامبەر یەك دانا، بوو بەهۆی دروست بوونی حیزبی كرێكاری بۆرژوازی لەشارداو حیزبی كشتوكاڵی لە لادێدا.[1] بەڵام مەبەستی ئێمە لێرەدا، ئەو دەستە حیزبانەیە كە لەزۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا بەرنامەو بناغەی هاوچەشنیان هەیە. كە ریزبەندی خستنە ڕویان

بەپێی مێژووی دروست بوونیانە، بۆ نموونە شۆڕشی نەتەوەیی لەسەدەی شانزدەو حەڤدەهەمدا دروست بوو، بەڵام حیزبی دیموکرات مەسیحیی زۆربەیان لەسەدەی بیستەمدا پەیدابوون.

**1ـ حیزبە لیبراڵەکان:**

حیزبە لیبراڵەکان، لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەوڵاتە ئەوروپاییەکاندا هاتنە مەیدان و دەرکەوتن. کە حیزبی لیبرال لە بەریتانیادا بەهەمان ناوەوە، یەکێك لە دوو حیزبە سەرەکییەکەی بەریتانیای پێکهێنا و ئەمرۆش لەگەڵ ئەوەشدا کە جێگەی خۆی لە سەرەتای بیستەمدا بە حیزبی کرێکار لە نیزامی دوو حیزبیدا داوە، بەڵام دوورنەکەوتووەتەوە لە گۆڕەپانی سیاسی ئەم وڵاتەدا.

ئامانجی لیبرالیزم، بە هەمان شێوەی ئایدیۆلۆژیای باڵەڕاستەکان ماوەتەوە، هەروەها لەسەر بنەمای هەمان ڕێبازی حیزبی لیبرالی بەریتانیایە، واتە لایەنگری لە کۆمەڵگای لیبرال، لیبرالیزمی ئابوری و بازاڕی ئازاد لەسەر بنەمای سود. بەڵام حیزبە لیبرالەکانی تری ئەوروپا، هەرچەندی لەچاو بەریتانیادا دواتر دەرکەوتن، بەڵام ئامادەبونیان هەیە. لیبرالە ڕاسترەوەکانی فەرەنسا، لە شۆڕشی ساڵی 1830دا سەرکەوتنێکی ڕێژەییان بەدەست هێنا و ئەشرافە ڕاستەکانیان کەنارخست. بەڵام لە شۆڕشەکانی 1848دا، زۆرینەی سەرکەوتنەکان بۆ چەپی لیبرال و دیموکرات بوو کە دواترو لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی ناپلیۆنی سێهەمدا، ئەشرافە ڕاستەکان گەیشتن بە سەرکەوتن.

ئەم ڕوداوە بووە هۆی دابەش بوونی مەیلی چەپ و ڕاست لە فەرەنسادا و ململانێی نێوان کۆماریخوازو پاشایی خوازەکان برەوی کێشاو بەردەوام بوو تا دوای کەوتنی ناپلیۆنی سێهەم لە ساڵی 1870دا. لەم ڕووەوەو دوای لەناوچونی پاشایی خوازەکان لە گۆڕەپانی سیاسیداو لەدەیەی 1890دا، باڵەڕاستەکان توانیان ڕەوتی سروشتی و ڕەسەنی خۆیان بەدەست بهێنن. لە ساڵی 1902دا لیبرالی جەماوەری دروست بوو کە دواتر بە ناوی کۆماریخوازی کۆنەپارێز (*conserv watef*) یان فیدراسیۆنی کۆماریخوازەکانەوە (1903) درێژەی بە ژیانی خۆیدا.

هەمان گروپ لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە، گرنگترین ڕێکخراوی لیبرالی ڕاستیان بە سەرۆکایەتی لوئین مارین (*marin*) دامەزراند. هەر هەمان گروپ لە هەڵبژاردنی ساڵی 1945دا، واتە بە تەواوی لەدوای شەڕی جیهانی دووەمەوە بە ڕێژەی 15٪ ی دەنگەکان دەرکەوت و بیری خۆی تازەکردەوە. لە دەیەی ساڵی 1960دا لیبرالەکان دوای هەورازو نشێوێکی زۆر، بە سەرۆکایەتی(ڤالری ژسکاردوستن) و لەگەڵ ئیئتلافی گروپە هاوچەشنەکانیدا، بە شێوەی ڕێکخراوێکی چالاك لەسەر گۆڕەپانی سیاسی فەرەنسادا لەپێشبڕکێدا بوون.

لە ساڵی1978دا لیبرالە ڕاستەکان، بریتی بوون لەچوار حیزبی ناوەندی نەتەوەیی سەربەخۆ (*CNI*)، حیزبی کۆماریخواز، ناوەندە

دیموکراتەکانی کۆمەڵگا (*CDS*)، رادیکاڵەکان. کە سێ گروپی کۆتاییان لە هەڵبژاردنی ئەمساڵدا لەگەڵ یەکتریدا ئیئتلافیان کردووەو یەکێتی دیموکراسی فەرەنسا (*UDF*) یان دامەزراندوە، کە هەڵبژێراوەکەیان بۆ سەرۆك کۆمار خودی(ژسکاردستن) بوو.[2]

لە ئەڵمانیاشدا، لیبراڵەکان کە لەساڵی 1815دا لە (پرۆس)و ولایەتەکانی ئەڵمانیادا لەچوارچێوەی بزوتنەوەی لیبرالی گشتیدا چالاکییان هەبووەو هەروەکو حیزبەکانی تری سەردەمی کۆماری وایمار، بە شێوەیەکی چالاك دەرکەوتن. هەڵبەتە دەتوانین بڵێین کە بنەمای بیرکردنەوەی لیبرال، لە ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیادا بە ناوی (حیزبی بیرکردنەوەی ئازاد) ەوە خۆی نواند. بەڵام لەکاتی کۆماری وایماردا، بە چەند ناوێکی وەك (حیزبی دیموکراتی ئەڵمانیا) (حیزبی نەتەوەیی لیبرال) (حیزبی جەماوەریی ئەڵمان)ەوە دەرکەوت، کە کەسانێکی وەك(شتەرزەمەن) (حیزبی جەماوەری ئەڵمان)ی وەزیری دەرەوەو (تیۆدۆرهیس . *Hess*)ی یەکەمین سەرۆك کۆماری فیدراڵ لە(حیزبی دیموکراتی ئەڵمان) لەوانە بوون کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە بە ناوی حیزبی لیبرال و بە ئیئتلاف کردن لەگەڵ دیموکرات مەسیحیدا، لەیەکەمین حکومەتی ئەڵمانیای فیدراڵیدا بەشداربوون. ئەگەرچی ئەم حیزبە لەنێوان ساڵەکانی 1952تا ساڵی 1957دا لەنێوان باڵی ناوەندگەراو باڵی راستدا، دابەش بوو، بەڵام ئەمڕۆ یەکێکە لەحیزبە بەناوبانگەکان و دەتوانێت لەسیستەمی دوو حیزب ونیوی ئەڵمانیادا، چارەنووسی هەڵبژاردنی ئەم وڵاتە بگۆڕێت.

لەئیتاڵیاشدا، لیبراڵەکان لە ساڵی 1861دا، کاتێ پەرلەمانی نەتەوەیی یەکەمین دانیشتنی خۆی لە (تۆرین) دەست پێکرد، تا ساڵی 1913 زۆرینەی کورسییەکانی ئەم پەرلەمانەیان بەدەستەوە بوو بەڵام دوای جەنگی دووەمی جیهانی، بە شێوەی حیزبێکی پەراوێزکراو لەکاردابوون. بە هەمان شێوەش خێزانە لیبرالەکان هەرچەندە کە حیزبێکی گەورە نەبوون، بەڵام لە هەموو وڵاتانی ئەوروپادا بەشێوەی حیزبێکی چالاك یان نیمچە چالاك ئامادەییان هەبووەو تا ئێستاش ئەگەری بە دەسەڵات گەیشتنیان لەدەست نەداوە.

**2ـ خێزانی سۆسیالیست:**

سۆسیالیستەکان دوای لیبراڵەکان کۆنترین و دەسەڵاتدارترین خێزانی سیاسی ئەوروپان. گروپە جیاوازەکانی سۆسیالیست، لە دەیەی 1830دا و 1840دا، بە جۆرێکی نارێك و پەرش و بڵاو دەرکەوتن، ئەم گروپە جیاوازانە لە سەرەتاوە بانگەشەی نێودەوڵەتی بوونی خۆیانیان دەرکرد. نێودەوڵەتی یەکەمی کرێکاری، کە بەسەرۆکایەتی (کارل مارکس) لەساڵی 1864دا پێکهات و لەدەیەی 1870دا، بێ ئاژاوە کۆتایی پێهات، شتێك نەبوو جگە لە کۆمەڵێك کەسایەتی سۆسیالیستی وڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپا.

دوای ئەم ئەزمونە، مەیلی سۆسیالیستەکان بۆ کۆبونەوەو یەکگرتنێکی زیاتر هاتە ئاراوە، لێرەوە تایبەتمەندی گروپە کرێکارییەکان بۆ

کۆبونەوەی هەرچی زیاتری کرێکاران و دەستەی جەماوەری بەردەوام بوو، ئەو کۆمەڵانەی کە پەیــــدابوون بــــە خێرایــــی گەواهیــــدەری گەشەسەندنی چەندایەتی خۆیان بوون. لەسەر هــــەمان بنــــەما، حیزبــــە سۆسیالیــــستەکان تایبەتمەندێتی بە کۆمەڵ و ناوەندی ئیداری و ڕێکخراوەیی تایبەتیان هەبوو کە ئەمانی پێ جیادەکرایەوە لە حیزبە کادێرە بۆرژوازەکان و ئەشرافییەکان.

لە فەرەنسادا، ڕەوتی چەپ لە شۆڕشەکانی 1848دا زیاتر خۆی خستەڕوو، بەڵام هاتنی ناپلیۆنی سێهەم ڕێکخراوێتی چەپی دواخست و دوای ڕوخاندنی ناپلیۆن، کۆماری خوازەکان تا ساڵی 1879 لە بەرامبەر پاشایی خوازەکاندا گەیشتن بە جۆرە یەکێتییەك، بەڵام خۆیان لە دوو باڵی ڕاست و چەپ پێك دەهاتن. ڕوداوی وەکو بابەتی(دریفوس) و گەندەڵی دارایی (نۆکەندی پەنەما) لەنێوان ئەم دوو گروپەدا، جیاوازییەکی زۆری خستە نێوانیانەوە.

گروپــی چــەپ، لــە ســاڵی 1901دا بــە ســـەرۆکایەتی (والــدك رۆســـۆ) (یـــەکێتی کۆماریخوازە دیموکراتەکان)ی پێکهێنا. بەڵام بزاوتێکی چەپی تری زیادەڕەو دروست بوو کە لــە ســاڵی 1884دا لەچوارچــێوەی دەســتەی ســەندیکایدا چالاکیان بە ئەنجام دەگەیاند، لـــەنێوان ســـاڵانی 1895 و 1902دا لـــە کۆنفیداسیۆنی گشتی کاردا(*CGT*) چەسپین و تا ئەمڕۆش بە بەردەوامی درێژە بە ژیانی خۆیان دەدەن و بە یەکێك لە یەککگرتووترین حیزبە سۆسیالیستەکانی فەرەنسا دەژمێردرێن. بەڵام سۆسیالیزمی سیاسی بە سەرۆکایەتی (ژول بازیل) و(ژول گد) لە ساڵی 1879دا واتە لــە کــۆنگرەی کرێکــاریی مارســێدا، چالاکی سیاسی خۆی دەستپێکرد. (ژول گد) نوێنەری بیری مارکسیستی بوو لە فەرەنساداو لەساڵی 1883دا حیزبی کرێکاری فەرەنسی دامەزراند، بــەڵام بەشــداریيەکی وەهــای نــەبوو لـــە گۆڕەپانەکەدا. بەرامبەر بەم و بەهەمان شێواز، ئانارشیـــستەکان و بلانکیـــستەکان لەســـاڵی 1881دا، کۆمیتـــەی ناوەنـــدی شۆڕشـــیان کۆبویـــەوەو بــە ســەرۆکایەتی (ئیــدوارد وایــان *Vaillant*) حیزبــی سۆسیالیــستی شۆڕشـــی فەرەنسایان لە ساڵی 1889دا دامەزراند بە هاوبەشی لەگەڵ یەکێتی کۆمۆنیستەکاندا[3].

باڵی ڕاستە گدیستەکان کە دژی مارکسی بوون لەساڵی 1882دا "فیدراسیۆنی کرێکاری کۆمەڵایەتی"یان بە سەرۆکایەتی(پۆل بروس) پێکهێنا، لە کۆتاییدا زۆربەی ئەم گروپانە بە پێـــشنیاری نێودەوڵـــەتی سۆسیالیـــستی لـــە کۆنگرەی ئەمستردامدا، لە ساڵی 1904 هاتنە نـــاو ئـــەم یەکێتییـــەوەو بەشـــی فەرەنـــسی نێودەوڵـــەتی کرێکاریـــان (*s.f.l.o*) لـــە ســـاڵی 1905دا دروست کرد کە لە ساڵی 1908دا(ژان ژۆرۆس)ی سۆسیالیـــــست ی بـــــەناوبانگی فەرەنسی بە سەرۆکی هەڵبژێردرا، لەو کاتەدا ئەم دەستەیە نزیکەی 35 هەزار ئەندامی هەبوو، کە ئەمە ژمارەیەکی وەهایە کە دەریدەخات لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگدا نەبووە.[4]

لە بەریتانیاشدا، لە ساڵی 1906دا حیزبی کــار پێکهــات، کــە لەڕاســتیدا نــاوی نــوێی (کۆمیتــەی نوێنەرایــەتی کــار) بــوو. کــە لــە ساڵی1900دا لەکۆبونەوەی دەستەی کرێکاری

کۆمەڵـــــەی سۆسیالیـــــستو ســـــەندیکا کرێکارییەکان دروست ببوو. لەئەڵمانیاشدا، بە فراوانبـــوونی چـــەند دەســـتەیەکی تاڕادەیـــەك بەهێزی کرێکاریدا بەناوەکانی (کۆمەڵەی گشتی کرێکـــارانی ئـــەڵمان) لـــە ســـاڵی 1863دا بـــە ســـەرۆکایەتی (لاســـال)و (یـــەکێتی کۆمەڵـــەی کرێکـــاری ئـــەڵمانیا) بـــە ســـەرۆکایەتی(لیـــب کنخـــت)و(ببـــل) دروســـت بـــوون کـــە لـــە ســـەردەمی(بـسمارك)دا 1890ـ 1870 چالاکی کاریان لاوازبوو.

لاســـالییەکانو پەیڕەوکـــەرانی مـــارکس، لەســـاڵی 1875دا یـــەکیان گـــرتو حیزبـــی سۆسـیال دیموکراتیـــان دروســـت کـــرد. لەگـــەڵ کـــەوتنی بـــسمارکو هەڵوەشـاندنەوەی یاسـای دژی سۆسیالیـــستیدا، سۆســـیال دیمـــوکراتی ئـەڵمانیا بـە شـێوەی بزووتنەوەیـەکی بـەهێزی ڕۆشـنبیری خـۆی دەرخـست، بـەڵام لـەکۆتایی سـەدەکەدا، دوو بزووتنـەوەی بـەهێز لـەنێوان سۆسیال دیموکراتەکانی ئەڵمانیادا پەیدابوو کە لەگەڵ دەرکەوتنی کتێبی (ئەدوارد بنشتاین)دا . کـە یەکێکـە لەسـەرۆکە دیارەکـانی سۆسـیال دیمـــــوکرات بـــــەناوی (پێویـــــستییەکانی سۆسیالیزمو ئەرکەکانی سۆسیال دیموکراسی) لەســـاڵی 1899دا بـــە شـــێوەیەکی فـــەرمی کەوتـــەڕوو. گۆشـــەنیگای (برنیـشتاین) لـەلای کەسـانێکی وەکـو (کـارل کائۆتـسکی)و (ڕۆزا لۆکسەمبۆرگ) وابەسـتە بـوو بـە سـەرنجێکی نوێـوەو بـوو بـەهۆی بۆشـاییەك کـە لـەدوای جەنگـــــدا بـــــە جیابونـــــەوەی گرووپـــــە ئیسپارتاکیستەکانی ڕۆزا لۆکسەمبۆرگو کارل لیب کنخت لەساڵی 1918دا هاتە ئاراوە، تا بە ئیئتلاف کردن لەگەڵ گروپەکانی تردا حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیایان دروست کرد[5].

لە ئیتالیادا، حیزبی سۆسیالیست زیاتر بە شـێوەی دەسـتەیەکی ڕۆشـنبیری دەرکـەوت. (باکۆنین) لە ساڵەکانی نێوان 1864تا 1876دا لـەئیتاڵیا دەژیـا و بەشـی نێودەوڵـەتی یەکـەمی لەوێ دروست کرد، بەڵام هێزێکی زۆری نەبوو لـــە ئیتاڵیـــادا. دوای ســـاڵی 1882 حیزبـــی کرێکـــاری ئیتاڵیـــا لەلایەنـــەکانی(لۆمبـــاردیو پیمۆن) دروست بوو، بەڵام حیزبی سەرانسەری لەئیتاڵیدا، حیزبی کرێکارانی ئیتاڵیا بوو کە لەســـاڵی 1892دا لەشـــاری ژان دامـــەزراو پەیوەست بوو بە نێودەوڵەتی دووەمەوە. بیری مارکسیستی کەمە کەمە لەڕێگای کەسانێکی وەکـو (ئـەنتۆنیۆ لابریـۆلا)وە بڵاوبویـەوەو دووبـاڵی سـەرەکی بەرامبـەر بـە یـەکتر دانـا کـە باڵەکانی شۆڕشگێڕانو ڕیفۆرم خوازەکان بوون.

لە کۆنگرەی (ڕۆما)دا، ساڵی 1900(توراتی) ڕیفۆرمخـــواز، کـــە ســـەرۆکایەتی حیزبـــی لەئەســـتۆدابوو، بەرنامـــەی هـــەردوو بـــاڵی لەدەستوری کـاری خۆیـدا، دانـا. لـە کۆتایـدا، بۆشـایی نێـوان ئـەم دووباڵـە بـوو بـەهۆی جیابونـــــەوەی کۆمۆنیـــــستەکان لـــــە سۆسیالیـستەکان لـە کـۆنگرەی(لیـۆرن)ی ساڵی 1921دا.

سۆسیالیـــستی نێودەوڵـــەتی، هـــەروەکو ئاماژەمـــان پێکـــرد، یەکـــەمین هـــەنگاوی بـــۆ یـەکگرتنی هێـزە پێـشڕەوە کرێکارییـەکان بـە دروستکردنی کۆمەڵـەی نێودەوڵـەتی کرێکـاری یـان نێودەوڵـەتی یەکـەم لـە سـاڵی 1864دا لـە(لەنـدەن) بـە سـەرۆکایەتی مـارکس پێکهێنـا.

ئەم دەستەیە بەرلەوەی سەرچاوەی بەرهەمی پراکتیکی بێت، ئەنجومەنێك بوو بۆ رەواج پێدانی بیری سۆسیالیزم و لێکۆڵینەوەی رۆشنبیری. سەرەنجام لەخۆبایی بوونی مارکس و دژایەتیەکانی لەگەڵ (باکۆنین)دا و گواستنەوەی شورای گشتی بۆ (نیۆرك)كە لە کۆنگرەی لاهای ساڵی 1872دا بڕیاری لەسەر درا، بە مەرگی لەسەرخۆی ئەم دەستەیە و بە هەڵوەشاندنەوەی فەرمی لە کۆنفرانسی ساڵی 1876 لە(فیلادفیا)دا راگەیەندرا.

لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، بزوتنەوەی کرێکاری، لەگەڵ فراوان بوونی پیشەسازیدا گەشەی کرد، بۆ نموونە لەنێوان ساڵەکانی 1882 تا 1895دا سەرژمێری رۆژانەی کرێکاران لە بەریتانیادا لە 7.3 ملیۆنەوە بۆ 10.2 ملیۆن زیادی کردو هاوشانی ئەمە سەندیکاکانی مەیلداری سۆسیال دیموکرات لە 50 هەزار کەسەوە بۆ 700 هەزار کەس زیادی کرد. بەڵام رێکخراوە کارایییەکان لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپادا، بونیادی جیاوازیان هێنایە ئاراوە. لە بەریتانیادا چاودێری کردنی چالاکییە سیاسی و رۆشنبیرییەکان زیاتر لە ئەستۆی بزوتنەوە سەندیکاییەکاندا بوو. هەر بەم هۆیەشەوە، هیچ حیزبێکی سیاسی کرێکاری تا ساڵی 1900 دروست نەبوو. لە ئەڵمانیادا، حیزبی سۆسیال دیموکرات لە یەکێتی لایەنگرانی (لاسال و مارکس) لە ساڵی 1875 دا دروست بوو، کە لەژێر چاودێری چالاکییە سەندیکاییەکاندا بوو. لە بەلجیکا و وڵاتە ئەسکەندەنافییەکاندا تێکەڵەیەك لەنێوان سێ جۆر رێکخراوی کرێکاریدا – واتە لەنێوان سەندیکاکان، حیزبەکان، تەعاونییەکان – دا پەیدا بوو.

لە فەرەنسادا، سەندیکا و حیزبەکان بەشێوەیەکی هاوتەریب بە یەکتری گەورە بوون و کە لەگەڵ یەکتریدا لە کێبڕکێدا بوون. ئەم حیزبانە کەمە کەمە دەگەیشتن بە سەرکەوتن، بۆ نموونە لە ئاڵمانیادا، حیزبی سۆسیال دیموکراسی لەساڵی 1872 دا پێنج سەد هەزار دەنگی تایبەت کرد بە خۆیەوە و لەساڵی 1898 دا گەیشتە دوو ملیۆن دەنگ کە دەیکردە پەنجا و شەش کورسی پەرلەمانی. رێکخراوی نێودەوڵەتی چینی کرێکار، لە دوای ئەوەی کە لە چەندین هەوڵدا رووبەرووی شکست بویەوە لە ساڵی 1889 دا (لە مەراسیمی سەدەمین ساڵڕۆژی شۆڕشی فەرەنسادا) توانی لە پاریسدا دوو کۆنگرە بە سەرکەوتویی بە ئەنجام بگەیەنێت.

دووەمین کۆنگرە کە بە داهێنراوی حیزبی کرێکاری فەرەنسا بە سەرۆکایەتی (جول گد) کەوتەوە، لە راستیدا بووە هۆی دارشتنی بونیادی نێودەوڵەتی دووەم، ئەم کۆنگرەیە بە بەشداری (ئەنگلس) لە مانگی (مارت)دا و لە ساڵی 1891 دا لە برۆکسل دەستی پێکرد و سەندیکاکانی بەریتانیا تیایدا بەشدار بوون، لە کاتێکدا کە ئانارشیستەکان دەرکران. سێهەمین کۆنگرە لەهەمان مانگدا و لەساڵی 1893 دا، لە (زوریخ) دەستی پێکرد کە (ئۆگۆست ببل) ی رابەری سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا، ئەم بڕیارنامەیەی جێبەجێ کرد کە تەنها سەندیکا پیشەییە کرێکارییەکان و ئەو حیزب و کۆمەڵە

سۆسیالیستیانەی کە بڕوایان بە کاری سیاسی و ڕێکخراوی کرێکاری هەیە دەتوانن ببن بە ئەندامی نێودەوڵەتی دووەم، یان ببن بە ئەنتەرناسیونالیستی سۆسیالیستی... هەڵوێستی پەرلەمانی وەکو بنەڕەتێکی بەرزی سۆسیالیستی لەلایەن (ژول گێد) ەوە لە کۆنگرەی ساڵی 1896 ی لەندەندا پێشنیارو بڕیاری لەسەر درا[6] لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، سۆسیالیستی نێودەوڵەتی، وەکو دەستەیەکی نێودەوڵەتی کە یەکگرتنی حیزب و دەستە نەتەوەییەکانی سۆسیالیستیان دەخستە ڕوو، لەگەڵ ئەندامێتی نزیکەی تێکڕای حیزب و ویستی سۆسیالیست و سۆسیال دیموکراتەکاندا، لە گۆڕەپانی سیاسەتدا ئامادە بوون. هەر ئەمەشە کە وایکردووە وەك خێزانێکی سیاسی گرنگ، دەسەڵاتی خۆی لە ڕوانگەی نێودەوڵەتییەوە پیشان بدات.

### 3-خێزانە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپا (ئەوروٚکۆمۆنیست)

زۆربەی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لەنێوان ساڵەکانی 1919 و 1921 دا لەدایك بوون. ناوەندی یەکەمی ئەم حیزبانە، ئەندامانی هەمان خێزانی سۆسیالیست دروست دەکەن بەڵام لەدوای بڵاوبونەوەی جارنامەی 21 ماددەیی نێودەوڵەتی سێهەم کە لەساڵی 1919 دا لینین دەریکرد، لە سۆسیالیستەکان جیابونەوە. شۆڕشی بەلشەفیکی ساڵی 1917 درەوشانەوەیەکی تری لەنێوان کرێکاران و ڕێکخراوە کرێکاری و سۆسیالیستەکاندا دروستکرد کە بەرەنگار بوونەوەی ئاسان نەبوو.

ئەو بیست و یەك مەرجەی کە (لینین) بۆ کۆمۆنیست و مارکسیبوون دەستنیشانی کردبوو کاریگەرییەکی لەبەرچاوی هەبوو بۆ ئەندامانی لاوی حیزبە سۆسیالیسەکان. لەم ڕووەوە، زۆربەی حیزبە سۆسیالیسەکان خۆیان بەمەجبوری جۆرێك لە بۆچونی ئەندامەکانی خۆیان دەزانی.

***SFIO*** لە فەرەنسادا، هەژدەهەمین کۆنگرەی خۆی، لە دیسەمبەری ساڵی 1920 دا لە شاری (تۆرا) بەست و دوای سێ ڕۆژ لە لێکۆڵینەوە و ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا لەسەر چوار خاڵ کە دوانیان پەیوەندی بە نێودەوڵەتی سێهەم و دوانەکەی تریشیان پەیوەندی بە بەردەوامێتی ڕابردووەوە هەبوو، دەستیان کرد بە هەڵبژاردن، سەرەنجام لە کۆی 68/7 لە سەدای دەنگەکان، لە سوودی نێودەوڵەتی سێهەم کەوتەوە و لە 180 هەزار بەشدار بوو تەنها 40 هەزاریان بە وەفاداری بۆ ***SFIO*** دەنگیان دا[7].

حیزبی سۆسیالیستی ئیتالیا: لە کۆنگرەی (لیۆرن)دا لەگەڵ هەمان کەرت بوندا ڕووبەڕووبوویەوە، لێرەوە سێ گروپی ڕیفۆرمخوازی (توراتی) (***tauati***) کە کەمینە بوون، لە سەدا هەشت و کۆمۆنیستە یەکێتی خوازەکان بە سەرۆکایەتی (سەرراتی) (***Serrati***) کە لەگەڵ بیست و یەك مەرجەکەی (لینین)دا، نەدەهاتنەوە و لینینستەکانیش بە سەرۆکایەتی (بوردیگا) (***Bordiga***) و گرامشی لە بەرامبەر یەك وەستانەوە. لێرەوە باڵی (سەرراتی) بە ڕێژەی لە سەدا 57٪ بەسەر باڵی (گرامشی) دا سەرکەوتوو بوو. بەڵام لینینستەکان بەجیابونەوە لەگەڵ سۆسیالیستەکان و وەلانانی

حیزبی کۆمۆنیست، ڕێگەی گومانکردنیان بەخۆیان نەدەدا. ئەم حیزبە لەسەر لاشەی سۆسیالیزمی ئیتاڵیا گران بوو، کە بووە هۆی لەدەستدانی دوو لەسەر سێی ئەندامەکانی و بەردەوام بوون لەسەر ڕەوتی خۆیان تاوەکو ببنە قوربانی فاشیزمی مۆسۆلینی. حیزبی سۆسیالیست و حیزبی کۆمۆنیستی ئیتاڵیا هاوڕا لەگەڵ حیزبی دیموکرات مەسیحیدا، دوای جەنگی دووەمی جیهانی بەهێزێکی زیاترەوە خۆی خستە ڕوو.

حیزبە کۆمۆنیستەکانی فەرەنسا و ئیتالیا، بە بەناوبانگترین حیزبەکانی ئەوروکۆمۆنیست دەژمێردرێن.

بەڵام لە وڵاتانی تریشدا، حیزبە کۆمۆنیستەکان چالاکیان هەیە. حیزبی کۆمۆنیستی هۆڵەندا لە ساڵی 1946 دا، لە سەدا 10/6 ی دەنگەکانی بۆخۆی مسۆگەر کرد، بەڵام دواتر بەردەوام ژمارەی دەنگەکانی کەم دەبویەوە، تاوەکو لەساڵی 1982 دا ڕێژەی دەنگەکانی نزم بویەوە بۆ لەسەدا یەك. حیزبی کۆمۆنیستی بەلجیکاش کە لەنێوان هەمان ساڵانی سەرەوەدا، دەنگەکانی لە ڕێژەی لە سەدا 12/3وە نزم بویەوە بۆ لەسەدا 2/3. بەهەرحاڵ لایەنی چەپی کۆمۆنیست، لە سەرانسەری ئەوروپادا خێزانێکی لەگەڵ یەکدابوو بوون، کە ئەم لەگەڵ یەکبونە، بوو بەهۆی سەروەری و ڕێنمایی دەرکردنی حیزبی کۆمۆنیستی شورەوی.

وابەستەبوونی ئەم حیزبانە لەگەڵ یەکتریدا و بەحیزبی کۆمۆنیستی شورەوییەوە، بوو بەهۆی خستنەڕووی ئەم حیزبانە بەشێوەیەکی یەکسان لەهەموو وڵاتەکاندا. دوای ڕووخاندنی شورەویش ناتوانین بڵێین ئەم بیرە لەبیر چووەتەوە، ئەگەرچی ئەم حیزبانە ناوی خۆیان گۆڕیوە، بەڵام مەرگی ئایدۆلۆژییەکان لەمێژەوە دوای تێکچوونی مەرجی کۆمەڵایەتی و عەینی، یان بەقسەی مارکسیستەکان "ژێرخان" ئەنجام دەگرێت.

### 4ـ خێزانی دیموکراسی مەسیحی

جەنگی سی ساڵەی مەزهەبی 1618-1648 نیشانەی گرنگی و ڕۆڵی مەزهەبە لە بابەتی سیاسی لە ئەوروپادا، کۆتایی ئەم جەنگانە، مانای ئەوە نەبوو کە ئیتر جەنگ کۆتایی هاتووە، بەڵکو ناکۆکی نێوان دین و دەوڵەت تا سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو. بە هەمان شێوەش وەك لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی (رککان) دا، بینیمان، لە هەندێ کۆمەڵدا، کەنیسەی پرۆتستان لەگەڵ دەوڵەتدا هاوڕابوون و ئەگەر کەمینەی کاسۆلیکەکان هێزێکی چەندێتیان نەخستبێتە ڕوو، ئەوا ئەو فکرەیە دروست ببوو کە ناکۆکی ئەم دەوڵەتە دوایی پێهاتووە، بەڵام بەو شێوەیە نا هەروەکو ئەوەی کە مێژووی ئەڵمانیا نیشانی دەدات. دوای یەکێتی نەتەوەیی ئەم وڵاتە لە ساڵی 1870 دا، ناکۆکی کاسۆلیك و پرۆتستانەکانیش، تاسەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو. بەڵام کەمەکەمە شێوەی سیاسی خۆی لەدەست دا و جیهانیبوون زاڵ بوو بەسەر بیری جەماوەردا. بەڵام لەڕاستیدا دامەزراوە ڕەسمییەکانی دینی کاسۆلیك، هیچ کات بێدەنگ نەبوون لە بەرامبەر هەر هەڕەشەیەکدا

کە لەخۆیاندا یان لە بەرپەرچ دانەوەیاندا دەکرایە سەری. هەروەکو لە مێژووی ئیتاڵیادا دەبینرێت کە کەنیسەی کاسۆلیك، حکومەتی رۆمای بەزاڵم لەقەڵەم دەداو نەیدەهێشت کە خەڵکی بەشداری بکەن لە کاری سیاسیداو ئەم کارە تا ساڵی 1911 کە دامەزراوەی دینی لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە مەترسیدار بوو، بەردەوامی هەبوو.

ئەم کورتە قسەکردنە بۆ شیکردنەوەی ژیانو چالاکی کۆمەڵەی مەزهەبی، بەو ئامانجە کۆتایی هات کە بڵێین لە سەردەمی فراوانبونی مافی دەنگدانو رۆیشتنی خەڵك بۆ گۆڕەپانی سیاسەت، سروشتی بوو کە سەرۆکە مەزهەبیەکان یان سیاسەت مەدارە کاتخوازەکان لە بیری دروستکردنی دەستەی سیاسیدابن بە سەرپۆشێکی مەزهەبیەوە. لێرەوە دەبێت دوو شێوە حیزبی مەزهەبی بهێنینە بەرچاو.

**یەکەم:** حیزبێك کە ناوەرۆکی مەسیحییەتیان لەسەر بنەمای رێنماییە گشتییەکانی مەسیح یان فەرمانەکانی ڤاتیکان بەشێوەیەکی فەرمی پەسەند کردووە.

**دووەم:** حیزبێك کە لە خەڵکانێکی باوەڕپێکراو دروست بوون، بێئەوەی کە ناوەرۆکێکی مەزهەبیان بە رێنمایکاری خۆیان دانابێت.

حیزبی کاسۆلیکی "سویسرا" کە لەساڵی 1845 پێکهات، یان حیزبە کاسۆلیکەکان کە بەدرێژایی ساڵانی 1880 و 1890 دروست بوون، نموونەی ئەو حیزبانەن کە ئەندامەکانیان کەسانێکی باوەڕپێکراو بوون. حیزبی ناوەندی ئاڵمان کە لەهەڵبژاردنی ساڵی 1871 دا لە پشتگیری کردنی تەواوی کاسۆلیکەکان سودمەند بوون، نموونەیەکە کە ناوەرۆکی مەزهەبی بۆ رێنمایکردنی کاریان دانەنراوە.

بەڵام فتواکانی (پاپا لیۆن) ی سیازدەیەم، لەساڵی 1891 دا، لەبارەی بابەتە کۆمەڵایەتیەکانەوە مۆڵەتی دروستکردنی سەندیکا مەسیحییەکانی دەرکرد، کە سەرەتایەك بوو بۆ ئەو حیزبانەی کە لەڕیزی پێشەوەن. تەنانەت لە هەندێ وڵاتی وەك: بەلجیکا، ئەڵمانیا، سویسرا، کۆبونەوەی کرێکاری مەسیحییان پێکهێنا. لەوکاتەدا پایە بۆ حیزبی دیموکرات مەسیحییەکان بوو "لەنزیك ساڵانی 1900 دا، دیموکرات مەسیحی، هێزی سیاسی لەبەرچاوی دروستکرد، لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا.

بەڵام گۆڕانی کاسۆلیزمی سیاسی بەلای ریفۆرمی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا، بەبێ گۆڕانی خودی کەنیسە نابێت"[8].

لیۆنی سیازدەیەم لە بەردەوامی فتواکانی خۆیدا، دیموکرات مەسیحی بە "کاری خێری مەسیحیەکان لەناو خەڵکدا" وەسفکرد، ئەو خۆیو جێگرەکەی "پاپای دەیەم" لادانی ئەم چەمکەی لەرێگەی تێکەڵکردنی کاری خێرو سیاسەت لەگەڵ یەکتردا، رەتکردەوەو لەئەنجامدا، دیموکرات مەسیحی بەناوی هێزێکی خێرخوازانەوە گوزارشتی لێدەکرا کە نەدەبوو کاری بەسەر سیاسەتەوە هەبێت.

لەم رووەوە زۆربەی حیزبەکان بەچەند ناوێکی جیاوازەوە سەرگەرمی چالاکیەکانیان بوون، لەو ناوانە "حیزبی دیموکراتی گشتی. فەرەنسا" "حیزبی گەلی ئیتالیا" "حیزبی

سۆسیالی جەماوەری. ئیسپانیا" "حیزبی گشتی چکسلۆفاکیا" "حیزبی ناوەند لە ئەلمانیا" "حیزبی کاسۆلیك لە بەلجیکا... لە ساڵی 1943دا بوو کە (کاسپری) سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ڕەزامەندی وەرگرتن و سەرنج ڕاکێشانی پاپای دوازدەیەم و لەم ڕووەوە ناوی دیموکرات مەسیحی هەڵبژارد بۆ ناولێنانی حیزبەکەی. دوای ساڵی 1945 چەندین گروپی دیموکرات مەسیحی لە ئەڵمانیادا دروست بوو، کە لە کۆتاییدا لە "یەکێتی دیموکرات مەسیحییەکاندا" کۆبونەوە. لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتینیشدا کە مەیلی مەزهەبی تیایدا بەهێز بوو، چەند حیزبێك بەهەمان ناوەوە پەیدابوو.[9]

ئەمڕۆ حیزبی دیموکرات مەسیحی لە ئاڵمانیا و ئیتاڵیادا، لەهەر شوێنێکی تر بەهێزترە، تەنانەت لە ئیتاڵیادا، هەروەکو کە بینیمان بەشێوەی حیزبێکی لێهاتوو نزیکەی سی ساڵ حکومەتی بەدەستەوە بوو.

لە فەرەنساشدا، حیزبی *MRP* . یان بزوتنەوەی کۆماریخوازی خەڵك کە لەساڵی 1946 دا، لە گۆڕەپانی سیاسەت دا دەرکەوت، لەڕاستیدا هەمان دیموکرات مەسیحی فەرەنسە بوو کە بەهەمان ناوەوە چالاکی خۆی دەکرد، بەڵام ئەمڕۆ نەئەم حیزبە لە فەرەنسا بوونی هەیە و نە دەستەیەکیش هەیە کە نوێنەرو جێگە گرەوەی بێت.

لە وڵاتانی تری ئەورووپادا، دیموکرات مەسیحی بەهەمان ناو یان بەناوی هاوشێوەی ئەمەوە لەچالاکیدان. لە بەلجیکادا، حیزبی کاسۆلیك لەساڵی 1945 دا، ناوی خۆی گۆڕی بە حیزبی سۆسیال مەسیحی و پێکهاتەیەکی وای بۆخۆی هەڵبژارد کە تەبابێت لەگەڵ ئەندامێتی ڕاستەوخۆی تاکەکانیدا. ئەم حیزبە تا سەرەتای دەیەی 1960 زیاتر لە سەدا 40 ی دەنگەکانی بۆخۆی مسۆگەر کرد، بەڵام لەمکاتە بەدواوە، هەندێك لە دەنگەکانی خۆی لەدەست داو دەنگەکانی لەنێوان لەسەدا 30 تا 36 ی لە نەوەستاندا بوو.[10]

حیزبی کاسۆلیکی هۆڵەندە، کە لەساڵی 1904 دا دروست بوو، بەردەوام بوو لە کاری سیاسی خۆیدا، بەڵام لە ساڵانی دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا، دابەش بوو بەسەر سێ ڕەوتدا، کە لەناویاندا حیزبی کاسۆلیك بەهەمان ناوەوە، زۆرترین دەنگی کاسۆلیکەکانی بۆخۆی مسۆگەر کرد. لە لۆکسامبۆرگدا، حیزبی مەسیحی کۆمەڵایەتی ببوو بە جێگرەوەی حیزبی ڕاست، کە کاسۆلیکەکان لەنێوان ساڵانی هەردوو جەنگەکەدا، تیایدا بەشدار بوون، لە حیزبە چالاکەکانی ئەم وڵاتەن و تا ساڵی 1974 بەردەوام شوێنی سەرۆك کۆماری بۆ خۆی مسۆگەر کردبوو حیزبی جەماوەری نەمساش، ئەگەرچی لەساڵانی نێوان هەر دوو جەنگەکەدا، دورکەوتەوە لە ئەندێشەی دیموکراسی، بەڵام دوای جەنگ ڕەوتی خۆی گۆڕی و بانگەشەی "ناوەندی پێشڕەوگەرا" ی تەواوی ڕەوتی مەزهەبی مەسیحییەکانی بۆخۆی ڕاکێشا. بەهەر شێوەیەك بێت دیموکرات مەسیحی کە بەهێز بوون و بەردەوام بوونی خۆی تا ئەندازەیەك لە تاکتیکی خێرخوازانەی لەکاتی جەنگدا بەدەست هێنابوو، ئەمڕۆ بەشێوەی هێزێکی نێودەوڵەتی دەرکەوتووە کە لە زۆرینەی وڵاتانی

ئەوروپادا ئەندامی هەیەو توانای ئەوەی هەیە کە لە پارلەمانی ئەوروپادا، فراکسیۆنێکی بەهێز پێکبهێنێت.

### پەراوێزەکان:

*1- Daniel Louis seiler, les parties politques en Europe, paris puf, 1978, pp 14 – 16.*

*2- Francois Borella, les parties politques en Europe, Paris, seuil,1979, pp, 117 – 140.*

*3- Jean – Paul Brunet, Histoire du socialism en France, p. v. f 1989 p, .20*

*4- F. Borella, op. cit, pp,113 - 122.*

*5- Michel rocard et als, Quest – Cequela sociale Democratie, seuil, 1979, pp, 75- 79:*

*6- Andre Donneur, L international Socialiste, Puf, 1983, pp, 10- 12.*

*7- J. P. Brunet, Histoire du Parti Communest Français, PUF, 1987, pp, 20 _ 23.*

*8- Pierre Letamendia, la Democratie Chrétiene, PUF, 1977, P, 23.*

*9- Ibid, P, 5.*

*10- Ibid, P, 67.*

### سەرچاوە:

سەرچاوەی ئەم باسە، بەشی پێنجەمە لە کتێبی (حزب سیاسی و عملکرد ان در جوامع امروز) لە نوسینی: د. احمد نقیب زادە، نشر دادگستر 1378. ص 115. 128.

# جان جاك رۆسۆ و ئەندێشەی دادپەروەری

بەهرام مەحی

لە فارسییەوە: رەزا مەنوچەهری

رۆسۆ لە دوو نوسراوی خۆیدا واتە "دووهەمین گوتار: دەربارەی پێگە و بنەما نایەکسانەکانی نێوان مرۆڤ" و بە تایبەتی لە "پەیمانی کۆمەلآیەتی"دا لەسەر بابەتی دادپەروەری رادەمێنێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات. رۆسۆ وەك هۆبز تێڕامانەکانی لەسەر نەریتی "پەیمان" بوو و لە "دوویەمین گوتاردا" کە لە ساڵی 1755دا نوسیویەتی شیکردنەوە لەسەر ناوەکیەکی و نادادپەروەری کۆمەلآیەتی دەکات. بەپێی بۆچوونەکانی رۆسۆ مرۆڤ لە "هەلومەرجی سروشتی" پێش بە کۆمەلآیەتی بووندا لە هەلومەرجێکی وەکیەکدا ژیاوەو ئازاد بووە. بەلآم بە زۆری و لە ئەنجامی خۆپەرستی و دروستبوونی موڵکیەتی تایبەتدا چوونەتە قۆناغی " هەلومەرجی کۆمەلآیەتی"یەوە، ئەو هەلومەرجە بۆ خۆی لەسەر بنەمای ناوەکیەکی و نەهێشتنی ئازادی دروست دەبێت. ئەو ناوەکییەکییە کۆمەلآیەتییە (لە توانایدایە) هەر مرۆڤێك لە خۆی نامۆ بکات.

رۆسۆ لەو بڕوایەدا بوو بە تێپەڕبوونی کات کەسانێك کە سامانی کەڵەکەبوویان بووە بۆ پاراستنی موڵکیەت و پێگەی خۆیان لەگەڵ مرۆڤە هەژارەکاندا لەسەر (هەندێك) یاسا رێککەوتوون کە لەسەر بنەمای بەستن یان دروستکردنی پەیمانی کۆمەلآیەتی نەبووە، واتە لەسەر ئەو بنەمایە رێکنەکەوتوون کە دەبوایە ببێت بە بناغەکانی کۆمەڵگایەکی کۆماریخوازانە.

ئەو دەوڵەتەی کە لە ئەنجامی ئلیناسیۆن (لە خۆ نامۆ بوونی) لە کۆمەڵگادا دروستبووە دەستکەوتێکە لە خزمەت جێگیرکردنی ناکۆکی و ناوەکیەکیەکاندا و (لە ئەنجامدا) خزمەت بە لێکهەڵوەشاندنەوەی ئازادی سروشتی و چەسپاندنی خۆپەرستی و سەرەڕۆیی دەکات. لەم نوسینەی رۆسۆدا ئەوە رووندەبێتەوە کە لە بۆچوونەکانی رۆسۆدا "مرۆڤی سروشتی" واتە ئەو مرۆڤەی کە لە "هەلومەرجێکی سروشتی"دایە و ژیاندەکات بە چ شێوەیەك

وێناکراوە. لە سەرەتادا مرۆڤێکی لەمشێوەیە موڵکیەتی تایبەتی نییە و بوونی لێوانلێوە لە خۆشەویستی و بەزەیی بەرانبەر بە خودی خۆی و هاورەگەزەکانی. ئەو مرۆڤە مرۆڤێکی قانعە و لە رووی هەستەوە لە تێگەیشتنێکی بێ ناوبژیواندا لەگەڵ مرۆڤەکانی دیدا ژیان دەکات. لە روانگەی رۆسۆوە دابەشکردنی کار رۆڵێکی گرنگی بووە لە پێکهێنانی ناوەکیەکی کۆمەڵایەتیدا، ئەوە لە کاتێکدایە کە دەبێت کار لە بنەڕەتدا ناوەکیەکی دروست نەکات و ئازادی سنوردار نەکات. وێڕای ئەوەی رۆسۆ رەخنە لەو کۆمەڵگایە دەگرێت کە لەسەر بنەمای موڵکیەتی تایبەت بنیاتنراوە، بەڵام ئەنجامی شۆڕشگێڕانە پێشکەش ناکات یان نایخاتە ڕوو و باس لە هەڵگرتنەوەی موڵکیەت یان لەناوبردنی سامان ناکات و تەنها دەیەوێت پێش بە زۆربوونی جیاوازی لە (سامان) و موڵکیەتدا بگرێت.

لە دوایدا رۆسۆ لە گرنگترین نوسینی خۆیدا واتە "پەیمانی کۆمەڵایەتی" کە لە (1762)دا بڵاوکرایەوە هەندێك گۆڕانکاری لە روانگەکانیدا دروستکرد. گۆڕانکاریەکان لە بواری هاتنە دەرەوەی مرۆڤ لە "هەلومەرجی سروشتی" و تێپەڕ بوون بۆ "هەلومەرجی یاسایی" بوون. بۆ نمونە ئاماژە بەو بابەتە دەکات کە سروشت بەڕادەیەك بەرگری بەهێز لە بەرانبەر "مانەوەی خود"ی تاکەکاندا پێشکەش دەکات کە دەبێتە هۆی ناهاوسەنگی لە نێوان پێویستیەکانی مرۆڤ و هێزە سروشتیەکاندا. رۆسۆ هەندێکجار "پەیمانی کۆمەڵایەتی" وەك هەنگاوێکی مێژوویی و هەندێکجاریش وەك تیۆریەکی هزری وەسفیکردووە. سەنتەری سەرەکی ئەو بۆچوونە هەڵگری ناوەرۆکێکی لەمجۆرەیە، تاکەکان دەستبەرداری وەکیەکی و ئازادی یەکەم و سەرەتایی سروشتی خۆیان دەبن تاکو بیگوێزنەوە بۆ کۆمەڵگایەکی سیاسی، چونکە دەتوانن ئەو ئازادی و وەکیەکیە لە دەستدراوەیان لە قۆناغێکی شکۆدارتردا بەدەست بهێننەوە. پەیمانی کۆمەڵایەتی رۆسۆ ئەڵتەرناتیڤێکە بۆ کۆمەڵگای ئلیناسیۆن و دەوڵەتی سەرەڕۆ و تاکڕەو و لە دوایدا دەبێتە دەرەنجامی "ویستی گشتی". کەواتە دەتوانین مۆدێلەکەی رۆسۆ بە مۆدێلێکی ویستگەرایانە بناسێنین. دەبێت ویستی (ئازاد)ی هاولاتی بتوانێت وشیارانە کۆمەڵگا، دەوڵەت و سیاسەت لە خۆیدا قبوڵ بکات و بۆ پەیوەندی لەگەڵ ویستی وشیارانەی تاکەکانی دیکەدا بچێتە ئەودیو ویستی گشتییەوە.

جیاوازی "پەیمانی دەوڵەت"ی هۆبز لەگەڵ "پەیمانی کۆمەڵایەتی" رۆسۆ لەوەدایە کە لە "پەیمانی دەوڵەتدا" تاکەکان خۆیان پەیوەست و گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکان دەکەن کە خاوەنی دەسەلاتی بێسنورن، بەلام لە پەیمانی کۆمەلایەتیدا ویستی گشتی و گەل یان کۆمار بۆ خۆیان دەبنە بەرزترین فەرمانڕەوا. بە پێی بۆچوونەکانی رۆسۆ پاڵپشتی هەر دەوڵەتێك لەسەر یاسای کۆمارێکەو لەم نێوانەدا پێکهاتەی حکومەت رۆڵی نییە.

رۆسۆ لە هەمان سەرەتای "پەیمانی کۆمەلایەتی"دا پەنجە دەخاتە سەر بابەتی دادپەروەری و ئاماژە بەوە دەکات کە ئامانجی ئەو هەڵسەنگاندنی سیستمێکی مەدەنییە بۆ دیتنەوەی رێسا یاساییە گشتی و

مسۆگەرەکانی حکومەت. رۆسۆ هەوڵدەدات لە هەڵسەنگاندنەکەیدا ئەوەی کە بە مافێکی رەوای دەزانێت لەگەڵ ئەو شتەدا کە هەمیشە بەرژەوەندی رەچاوی دەکات پەیوەندی دروستبکات تاکو لە نێوان دادپەروەر و سوددا جیاوازی دروست نەبێت. لە روانگەی رۆسۆوە تێپەڕبوونی مرۆڤ لە هەلومەرجی سروشتی بۆ هەلومەرجی مەدەنی، گۆڕانکاری سەرنجڕاکێش (گرنگ) دەبن بۆ نمونە دادپەروەری جێگای غەریزە دەگرێتەوە.

رۆسۆ لە بەشی دووەمی هەمان نوسیندا و لە باسی "دەربارەی یاسا" بە شێوەیەکی وردتر لە بابەتی دادپەروەری دەکۆڵێتەوە. رۆسۆ یاساکان وەك هەڵخرێنەر و ویستی سیستمی کۆمەڵایەتی راڤە دەکات و باس لەوە دەکات ئەگەرچی بەرێگای پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە پێکهاتەی سیاسی بوون پەیدا دەکات و ژیان دەستپێدەکات، بەڵام دەبێت بە یارمەتی یاسا جوڵە و ویستی پێببەخشین تاکو ئەو پێکهاتەیە تەیار بکرێت بە کەرەستەو ئامراز بۆ مانەوەی خۆی. بابەتی دادپەروەری لە سەنتەری ئەم بەشە لە تێڕامانەکانی رۆسۆدایە و ئەو پێکهاتە سیاسییە کە لە ویستی گشتییەوە هاتبێت لەلای رۆسۆ دەبێتە سەرچاوە و یاسای دادپەروەری.

رۆسۆ ئاماژە بەوە دەکات ئەوەی کە چاکە و لەگەڵ سیستمدا دێتەوە سەرچاوەی لە سروشتی خودی کەرەستەکاندایە و پەیوەندی بە رێککەوتنە مرۆییەکانەوە نییە. (دەڵێن) هەموو دادپەروەرییەکان لە خوداوەندەوە هاتووەو بە تەنها خوداوەند سەرچاوەی هەموو دادپەروەرییەکانە، بەڵام ئەگەر ئێمە بمانتوانیبا دادپەروەری لە پێگەی بەرزی لەمجۆرە قبوڵ بکەین ئیدی پێویستمان بە حکومەت و یاسا نەدەبوو. بێگومان لە روانگەی رۆسۆدا دادپەروەری گشتگیر بوونی هەیە و ئەویش لە ئاوەزەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام گەر دادپەروەرییەکی لەمجۆرە بیەوێت متمانە بۆ خۆی دەستەبەر بکات دەبێت دادپەروەری بەرامبەری بێت. یاساکانی دادپەروەری بەهۆی ئامادەنەبوونی دەرەنجامە سروشتیەکان لە نێو مرۆڤەکاندا پەیدا نابن. ئەوەی کە دەمێنێتەوە تەنها لە بەرژەوەندی مرۆڤی زۆرداردایە و بە زیانی مرۆڤی دادپەروەر دەبێت، چونکە مرۆڤی دادپەروەر دادپەروەری بۆ هەمووان رەچاو دەکات، بەڵام ئەوە لە کاتێکدایە کە مرۆڤی زۆردار (زاڵم) دادپەروەری بۆ هیچ کەسێك رەچاو ناکات. رۆسۆ بەو ئەنجامە دەگات، چونکە ئێمە پێویستمان بە پەیمان و یاسایە دەبێت ئەرك و یاساکان پەیوەندیداری یەکدی بن تاکو روویەکی ئۆبژەکتیڤ بە دادپەروەری بدەن. بەمجۆرە روون دەبێتەوە کە لە روانگەی رۆسۆدا دادپەروەری تەنها بە رێگەی یاساکانەوە بەئەنجام دەگات. بەپێی بۆچوونەکانی رۆسۆ لە هەلومەرجی سروشتیدا کە هەموو شتێك هاوبەشە و مرۆڤەکان وەکیەکن کەس بەرانبەر بە کەس ئەرکی لە ئەستۆدا نییە، چونکە بەڵێن و پابەندی بەرانبەر بە کەسانی دی قبوڵ نەکردووە. هەر ئەوەندە بەسە ئەو شتەی کە بۆ ئەو سودی نییە وەك موڵکی کەسانی دی قبوڵی بکات. بەڵام لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتیدا دۆخەکە بەمجۆرە نییە، چونکە هەموو مافەکان لەلایەن یاساوە جێگیر کراون.

ڕۆسۆ لە بابەتی گشتی بوونی بابەتی یاساکان بەمجۆرە تێدەگات، یاسای حوکمڕانان وەك بابەتێکی هەمەکی و هەڵسوکەوتیان ئینتزاعی لەبەرچاو دەگرێت و قەت وەك تاکی مرۆیی و هەڵسوکەوتی تاك ناجوڵێنەوە. لەمڕووەوەیە یاسا دەتوانێت مافە سەرەتاییەکان دەستنیشان بکات، بەڵام لەسەر ناوی کەسێکی دیاریکراو نانوسرێت یان دەستنیشان ناکرێت. یاسا دەتوانێت توێژی جۆراوجۆر لە نێو هاولاتیاندا دروستبکات یان تەنانەت هەندێك تایبەتمەندی دروستبکات کە بە مافی ئەو توێژانە بژمێردرێت، بەڵام ناتوانێت ئەوە بچەسپێنێت کە ئەم کەسە یان ئەو کەسە لە نێو توێژێکدا قبوڵ بکرێت یان قبوڵ نەکرێت. ڕۆسۆ بەو ئەنجامە دەگات کە ئیدی پێویست ناکات بپرسین یاسا لەلایەن چ کەسێکەوە دەنوسرێت، چونکە ئەوانە لە ویستی گشتییەوە سەرچاوەیان گرتووە. پێویست ناکات پرسیار بکەین میر بانترە لە یاسا یان نا، چونکە ئەو ئەندامێکە لە ئەندامەکانی دەوڵەت. پێویست ناکات بپرسین ئایا یاسا دەتوانێت نادادپەروەرانە بێت یان نا، چونکە کەسێك نییە بەرانبەر بە خۆی نادادپەروەر بێت. ئەو پرسیارەش بێمانایە گەر بپرسین ئایا مرۆڤ دەتوانێت هەم ئازاد و هەم گوێڕایەڵی یاسا بێت، چونکە بە تەنها یاسا دەرکەوتی ویستەکانمانە. کەواتە ئەوەی کە تاك چاوپۆشی لە پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی دەکات و بەسەر ویستی خۆیدا دەیسەپێنێت یاسا نییە. تەنانەت ئەوەی کە فەرمانڕەوا بیەوێت لە بابەتێکی تایبەتدا ڕەچاوکردنێك بچەسپێنێت ئەوەش یاسا نییە، چونکە یاسا بڕیاری ویستی گشتییە دەربارەی بابەتێك. ڕۆسۆ پاش ئەم تێڕاماندنە لە بەشی سێیەمی "پەیمانی کۆمەڵایەتیدا" دادپەروەری وەك پێوەرێك بۆ دیاریکردنی ڕەوابوونی حکومەت بەکار دەهێنێت. ڕۆسۆ لە هەڵسەنگاندنیدا بۆ خراپ بەکارهێنانی دەوڵەت لەلایەن حکومەتەوە دەڵێت: زۆردار لە مانا ئاساییەکەیدا پادشایەکە کە بەدڕەوشتی و قورسگرتنەوە دەسەلات دەکات و سەرنج ناداتە سەر یاسا و دادپەروەری، بەڵام لە مانایەکی دیاریکراوتردا زۆردار ئەو کەسەیە کە بەبێ ئەوەی دەسەلاتی پادشاهی مافی ئەو بێت ئەو دەسەلاتەی گرتۆتە دەست. یۆنانییەکانیش زۆرداریان (زاڵمیان) بەو مانایە بەکاردەهێنا. یۆنانییەکان زۆردارەکانیان بە پادشایەکی چاك یان خراپ دەزانی کە دەسەلاتەکەیان یاسای نییە، کەواتە لە ڕوانگەی یۆنانییەکانەوە زۆردار و داگیرکەر بە تەواوەتی یەك مانایان بووە، بەڵام بۆئەوەی ناوی جیاواز بۆ ئەو شتە جیاوازانە دابنێین من دەڵێم زۆردار داگیرکەری دەسەلاتی پادشایە و زۆردار داگیرکەری دەسەلاتی فەرمانڕەوایە، کەواتە زۆردار ئەو کەسەیە کە بەشێوەیەکی نایاسایی هاتۆتە سەر کار و دەسەلاتی گرتۆتە دەست بۆ ئەوەی بەپێی یاسا دەسەلات بکات. کەواتە ئەگەری ئەوە هەیە زۆردار ملهوڕ نەبێت، بەڵام هەمیشە ملهوڕ زۆردارە.

سەرچاوە:

دوێچە ڤێلە

# ڕووناكبیرانو مۆدێرنیته

ڕامین جەهانبەگلوو

لە فارسییەوە: سامان كۆنەپۆشی

قزلـــــسوفلا. دەمــــەویٚ وتووێژەكـــــە بـــــە پرســــیارێكی بنـــــەڕەتی دەســـــت پێبكــــەم: "ڕووناكبیر كێیە؟" ئەوانەی كە توژینەوەیان لە سـەر ئـەم چـەمكەو پرسـیارگەلێ لـە مـەڕ ئـەم چەمكە كردوە، و ڕەنگە خۆیشیان جۆرێك بن لە توێـژی ڕووناكبیر، لـە سـەر ئـەم بـاوەڕەن كـە ڕوونـــاكبیر ســـیمای ســـەرەكی ســـەردەمی نوێخوازییـــە. ئـــەو لـــە جێگـــا هاوولاتییـــەكی مودێرندایـــە كـــە هاوكـــات لەگـــەڵ بـــەرگری لـــە بـــەها بنەرەتییـــەكانی پێكهێنـــەری فـــەزای سیاسیو كولتووری مۆدێرنەدا، دەیانخەنە بەر تـــــــەوژمی بـــــــەردەوامی ڕەخنـــــــەوە. ئەو"ئینتلیجنتسیا" یەكە كە ناتوانێ بەرگەی كۆمــەڵگای نەشــیاوو بــێ نــۆرمی سیاســی، كولتــووری و كۆمەلایەتییــەكانی بگرێــت. هــەر بۆیــە لــە هەمبــەر نابەرابــەری گــەلێكی لــەم چەشــنەدا پەرچــەكردارێكی جیــددی لــەخۆی نیــشان دەدا تــا كۆمــەڵگای نەشــیاوی خــۆی، سەرلەنوێ بنیات بنێتەوە. كەواتە، كەسێك كە ناڕازییـە لـە كۆمەڵگایـەكی نەشـیاوو لەگەڵیـدا دژایـــەتی دەكـــاو ناســـێنەری ڕووناكبیرێكـــە، دەتـوانێ تەنانـەت لـە بـارودۆخێكی پـێش لـە نوێخوازیشدا بوونی هەبووبێ. هەر بۆیە باسی ڕووناكبیری دەتوانێ لە سێ سیمای نەریتی، مۆدێرنو پۆستمۆدێرندا دەركەوێ، ڕووناكبیری حەقیقـــەتخوازی ترانـــسدێنتاڵو یۆتۆپیـــایی ســەردەمی دێــرین، ڕوونـاكبیری سەرچـڵیكاری ســـەردەمی ڕۆشـــنگەری، وەك ڤـــۆڵتێر، دیـــدرۆ، كانتو گۆتەو...، و دواجار ڕووناكبیرانی نەوەی سـێیەم لـە سـەردەمی پوسـت مۆدێرنـدا، كـە هێــرش دەكەنــە ســەر داڕشــتەكانی قۆنــاغی مـۆدێرنو پێـشوازی لـە پێكهاتـە شـكێنی هـەر شـتێكو هـەر دەقێـك دەكـەن. كەسـانێكی وەك فوكـۆ، دێریـداو بۆدریـار دەكەونـە نێـو ئـەم نەوەیـــــە. كـــــەوابوو دەتـــــوانین لـــــەڕووی مەعریفەناســـــــــــیو هایدنناســـــــــــییەوە (ئەبـستمۆلۆجیو ئەنتۆلۆجیـەوە)، جیـاوازی بكەین لە نێوان سێ جۆر ڕووناكبیریدا.

**جەهانبەگلو:** پاش بەرابیەك کە باست کرد، دەمەویٚ بڵێم ئێمە لە قۆناغی پێش لە مۆدێرنەدا رووناکبیرو شێوەی لە تێگەیشتنی خۆمان بۆ دیاردەی رووناکبیری، بەو واتایەی کە لە مۆدێرنەدا لێی تێگەیشتوین، نادۆزینەوە. رووناکبیری قۆناغی مۆدێرن، نموونەیەکە لە کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتیو هاوکات، مرۆڤێکە باوەڕی بە هەندیٚ بنەماو پرەنسیپ هەیە کە ناچاری دەکا دەست وەربداتە نێو کاروباری سیاسی، کۆمەڵایەتیو کولتووری کۆمەڵگا. رووناکبیری بە واتا ئەمڕۆییەکەی، واتە ئەو شتەی کە فەرەنسییەکان بە"ئینتلکتوێل" ناوی دەبەن، کەسایەتییەکە بە کێشەی"دریفوس"و راگەیاندننامەیەکی بەناوبانگ کە رووناکبیرەکان لە ژانویەی ساڵی 1898 دا دەریانکرد، سەریهەڵدا. بەڵام لە سەردەمی سەدەکانی ناوەراستیشدا، کە چاخی زاڵییەتی باوکانی کلێسا بوو بەسەر دەسەڵاتداریەتی خەڵکدا، زاناگەلێك دەبینین کە بەناو رۆڵی رووناکبیریان دەگێڕا، دیارە نەك بە واتای مۆدێرنی وشە، چونکە یەکێك لە جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان رووناکبیرانی چاخی سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ سەردەمی مودێرندا، لە تێڕوانینی ئەواندایە بۆ جیهانو مرۆڤ. زاناکانی کلێساو پێش ئەوان، خەریکی شرۆڤەو راڤەدەبوونو رستەکانی "عەهدی نویٚ"یان راڤە دەکرد. بۆ نموونە، ئێکویناسی قەدیس کە لەو کاتەدا مامۆستای گەورەی سوربۆن بوو، لەو فەیلەسوفە دینییە رووناکبیرانە بوو کە راڤەو شرۆڤەی نەریتی مەسیحی، زۆرینەی کارەکانی پێکدێنا.

ـ گوایە پێش لە سەردەمی کلێساش کە ئاگۆستین بە قۆناغی نمایشی رێژەی خوا بە سەر زەویدا دەزانی، واتە لە یونانی دێریندا، دەتوانین بە دوای رووناکبیردا بگەڕێین، واتە لە ترۆپکی بیرە فەلسەفییەکانی دەوڵەت.

شارەکانی یونانـدا. دەتوانین سوکرات بە نموونە بێنینەوە کە بە هۆی رەخنەگرتنەکانی لە بیٚ نۆرمییەکانی ئەسینا ناوی"بشێوێن"ی کۆمەڵگای لە خۆی نابوو. ئەرکی سەرەکی ئەو بریتی بوو لە هوشیارکردنەوە لە مەترسییە هەبووەکان لە هەلومەرجی ئەو سەردەمەدا. رۆڵی ئەو بریتی بوو لە گۆڕینی تێڕوانینی مرۆڤ بۆ ئاکامی ژیان.

ـ بە پێی ئەم روانگەیە، پێویستیمان بە پێناسەیەکی بەربڵاو لە دیاردەی رووناکبیری هەیە. بە هەمان نموونەی سوکرات ئەم پێناسە دەردەبڕم. راستە سوکرات فەیلەسووفێکی هاووڵاتی ئەسینا بوو کە دەستی وەردەدایە کاری دەوڵەتشارەوەو لە ئاکامدا هەر بەم هۆیەش مەحکووم بەمردن کرا، بەڵام ئەوەی کە قەبووڵی بکەین سوقرات هەندێك (ناوکی) رووناکبیرانی قۆناغی مۆدێرنی هەبووە، شتێکی نەگونجاوە. هەرچەند رەنگە رووناکبیرێکی مۆدێرن نموونەیەکی رووناکبیری لە سوکرات بۆ خۆی دروست بکا، چونکە سوکرات هەمووکات نیگەرانی بارودۆخی کۆمەڵگاکەی خۆی بوو. سوکرات بیری لەوە دەکردەوە کە لە دیموکراسی ئەسینایدا کە لافی لۆگۆسی راستەوخۆی هاووڵاتییانی لێدەدا، دەستەیەك لە سۆفستاییەکان یان تەنانەت دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگا، ببنە هۆی قەیرانو گەندەڵی کۆمەڵگا،

کەواتە بە ئەرکی خۆی دەزانی رووبەرووی ئەو هەلومەرجە نالەبارە بێتەوە، هەرچەند لە ئاکامدا بە گەندەڵکردن و بە لارێدا بردنی لاوەکانی ئەسینا تاوانبار کرا.

ــ کەواتە بە پێچەوانەی زاناکان و تیولۆژییەکان و رووناکبیرە ئاساکانی قۆناغی کڵێسا، کە باوەڕیان بە هاتنە خوارەوەی ئادەم هەبوو و هەموو شتێکیان سپاردبوو بە شاری خوا، سوکرات مۆدێرن بیری دەکردەوە. بیری ئەو نزیکییەکی زۆری لەگەڵ رەوتی سیاسیی سەردەمدا هەبوو و زیندووتر لە زاناکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەیئاخاوت.

ــ بەم لێڕوانینە فەلسەفییەوە دەتوانین سوکرات بە هاوشێوەی رووناکبیرانی ئەمڕۆ بزانین کە دەستەو یەخەی قەیرانەکانی کۆمەڵگاکان دەبنەوە، چ لە قۆناغی نوێخوازیدا و چ لە سەردەمێکدا کە هەندێك کەس لافی کۆتایی بەرپرسیارێتی رووناکبیر لێدەدەن.

. دیارە هاوکات رووناکبیرێکی وەك سوکرات هەمووکات ئاگادارە لەوەی کە نەکەوێتە داوی چەقبەستراوی و دۆگماخوازی کۆمەڵگاکان و ئایدۆلۆژیاکان. مەبەستی من لە ئاماژەکردن بە سوکرات ، بە هەموو لێکچونێکەوە کە رەنگە لەگەڵ رووناکبیرێکی ئەمرۆییدا هەیبێ، جۆرە بالاتربوونێکی لە رووناکبیری پۆستمۆدێرن هەیە. واتە بەپێی فەلسەفەی تیۆری ئەفلاتوون، دەبێ جیاوازییەك بکەین لە نێوان هابرماسی بانگەشەکەری پرۆژەی ناتەواوی مۆدێرنەو ئەپستیمەی فۆکۆییدا، کە هێڵی سووری دەکێشا بە سەر نوێخوازیدا.

ــ پێم وایە دەبێ پێشەکی جیاوازی جەوهەری نێوان وشەی"ئینتلیجنتسیا"، کە لە بنەڕەتدا وشەیەکی رووسییە، و وشەی "ئینتلکتوێل"ی فەرەنسی دیاری بکەین. دەزانن کە هەردوو ئەم وتەزایە بۆ پێناسەی رووناکبیر بەکارهاتوون. ئینتلیجنتسیا، بەوشێوەیەی کە لە سەدەی 19ی رووسیەدا ببوو بە مۆد، جیاوازە لە ئینتلکتوێلی فەرەنسای پاش دریفوس. رووناکبیر لە رووسیەدا پێشتر بە کاری گروپێك لە رووناکبیران و هونەرمەندان دەگوترا کە هێڵێکی فکری تایبەتیان پەیڕەو دەکرد. بیرو ئامانجی ئەم گروپە بە شێوەی گشتی ئایدۆلۆژی بوو تا رووناکبیری. رووناکبیری ئینتلکتوێلی رۆژئاوایی، پەراوێزنشینتر بوو بەلام نەك ئەوەی کە بە تەواوەتی لە کۆمەڵگا دابڕابێت. ئەو هەوڵی دەدا کاری خۆی لەتەك کۆمەڵگادا یەکلایی بکاتەوە، لێرەدا چیدی ئایدۆلۆژیا دروست نابێ.

رەنگە رووناکبیر هێڵێکی ئایدۆلۆژی پەیڕەو بکا، بەڵام رووناکبیرێکی لەم چەشنە، کەسێکی وەك ئەمیل زولایە کە بە کتێبی "من تاوانبار دەکەم" چووە شەڕی سوپا سیاسەتی ئەوکاتی فەرەنسا. ئامانجی ئەو رزگارکردنی کەسێکی چارەڕەشی بێتاوان بوو بە ناوی"دریفوس". بەم روونکردنەوەیە دەتوانین رووناکبیری پۆست مودێرنیش بناسین. پێم وایە بەو جۆرەی کە هەندێ کەس بیری لێدەکەنەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆو بنەڕەتی لە نێوان رووناکبیری مودێرن و پۆست مۆدێرندا بوونی نەبێ. لەوانەیە لەگەڵمدا هاوڕا بن کە رووناکبیری جۆری پۆست مودێرن بەبێ رووناکبیری مودێرن واتایەکی نیە. پۆست

مودێرنـەكان ڕەخنەگـەلێ ئاراسـتەی مودێرنـەو هەندێ لە لایەنەكانی دەكەن، بەڵام بە تێپەڕبوون بە خودی مۆدێرنـەدا ڕەخنەگەلێكی لـەم چەشنە دێننـە گـۆڕێ. كەواتـە بـە ئـەزموونێكی لـەم چەشـــنەوەیە كـــە ڕەخنـــە لـــە وتـــەزای ناسـكار(سـوژە)و بكـەری سیاسـی لافلێـدەری نوێخـــوازی دەگـــرن، بـــە بۆچـــوونی پۆستمۆدێرنەكان، پـاش ڕەخنـەكانی مـاركس، نیـچەو فرۆیـدو دواتـر هایـدگێرو بیریـارانی قوتابخانـەی فرانكفـۆرت، ئـەو ناسـكارە نابـە هێگلی و كانتیە لە نێو چووە.

. مەبەستتان ئەوەیە كە لە ئاكامی هێرشێكی لـەم چەشـنەدا، پۆسـت مۆدێرنـەكان بانگەشـەی ئاوەزی مێژوویی دەبەنە ژێر پرسیارەوە. ئـەوان ناسـكارەكان بـە زمـانی فۆكـۆ، وەك زیخـە ڕەوانـەكانی قـەراخی دەریـا دەبیـنن كـە لەگـەڵ شەپۆلەكانی ئاودا، واتە هـەمان بونیادەكـان، ون دەبـن و لـە نێـو دەچـن، بـە دەربڕینێكـی دیكـە ناسكاری بكەر، تەسلیمی بونیادەكان بووە.

ـ دیـارە بـە شـێوەیەكی تـەواوتر لـەوەی كـە ئێـوە دەیڵـێن. واتـە تـەنیا خـۆی نەشـاردۆتەوە، بـەڵكو دەبـێ بڵـێین كـە ئـەو وێنـە ناڕاسـتەی ئـاوەزی مێـژوویی مەبەسـتی هێگـڵ و ناسـكاری ترانسدێنتاڵی كانت، لە سـەردەمی ئاوەزگـەرایی دیمـــوكراتیكی ڕۆژئاواییـــدا دەرناكـــەون. بـــۆ نموونــە بودریــاری پۆســت مــۆدێرن دەڵێــت، "بكـەری سیاسـی" بـەو واتایـەی كـە لـە قونـاغی سەرەتای مۆدێرنیتەدا هەبووە، ئامادەیی نییە.

. تەنانەت لە قۆناغی سارتەری شۆڕشگێردا؟

لـەم قۆناغـەدا، بەشـێك لـە خوێنـدكارانی دەیـەی شەسـت بـۆ ئـەوەی ڕایبگەیـەنن كـە هێـشتا "ناسكار" زیندووە، دەیانگوت:"گەمژەكان، خۆ بونیادەكان ناڕژێنە نێو شەقام!".

ـ بـەڵێ! تەنانـەت لـە كـاتی سـارتەرو هـەمان خوێنـــدكارانی 68دا، كـــە ڕەنگـــە ترۆپكـــی ناسكارو بكەر بوون. كەواتە پۆست مۆدێرنەكان پــتر ســەرقاڵی نیگەرانییــە تاكەكەســییەكانن. بكـــەرێك كـــە هەنووكـــە پـــتر بەكارهێنـــەرەو سیاسـەتی بـۆ ئـەو ڕۆژ، واتـا كلاسـیكەكەی لەدەست داوەو چیدی شتێكی گشتی نییە.

ـ بارودۆخێـك كـە پۆسـت مودێرنـەكان وەك بۆشاییەكی ناشرین لێی دەدەوێن. لەو بۆشاییە ناشرینەدا، چونكە تابۆیەك بوونی نیە، بە ناچار هێـرش كردنـە سـەر هـەر شـتێك دەلوویـت. بـەم واتایە، لەگەڵ ڕووناكبیرێكدا كە لە پێبەندبوون بە نوێخوازی، ڕێزێكی تایبـەتی بۆ نۆرمـەكان و تابۆكـان دادەنـا، جیـاوازە. ڕەنگـە ڕوونـاكبیری پۆست مۆدێرن وەك"سەلمان روشدی" یە كە بە هـۆی خۆپەرستییە تاكەكەسییەكان، یـان لـەژێر هـــەر نـــاوێكی دیكـــەدا، كـــە مـــافی مـــرۆڤیش لافلێـدەری داكۆكیكردنـە لـە ئـازادی ڕادەبڕینـی ئەو، هێرش دەكاتە سەر بوارە پیرۆزەكـان، یـان وەك ئـەمبرتۆ ئیكـۆ كـە لـە ڕۆمـانی "نـاوی گـوڵی سـوور" دا هێـرش دەكاتـە سـەر بـواری كڵێـسا. ئـەو دەڵێـت چـیدی پاڵپـشتێكی هەتاهـەتایی و دڵنیاكـار بـوونی نیـە. كـەوابوو ڕوونـاكبیر هـەوڵ دەدا تاكوو خۆی بپارێزی. هەر ئەو شتەی كە بە بۆچـــوونی ئێـــوە بەشـــێكە لـــە خۆپەرســـتیی تاكەكەسی. لەم بارەوە لە سەر چ باوەڕێكن؟

ــ دیـــارە ڕوونـــاكبیرانی قونـــاغی ســـەرەتای مودێرنیتـــەش هێرشـــیان دەكـــردە ســـەر كۆڵەكەكانی كۆمـەڵگای مـۆدێرن، واتـە پـێش لـە

زاناكـانى خـاوەن ئینسایكلۆپیدیا لـە سـەدەى هەژدەیەمو لەو كاتە بە دواوە.

ــ بــەڵام هێرشــى رووناكبیرە پۆســت مودێرنـەكان هێرشـێكى نـەرمو نیـان(لطیـف)ە. ئـەو رووناكبیرێكـە كـە پـتر بـە شـوێن گەیـشتن بـە"بـەجێماوە زەمینــى"یەكانەوەیــە، و لــە تـەكنیكێك كـە پێكهاتەشـكێنى بـۆى بـە دیـارى هێناوە، پتر كەڵك وەردەگرێ.

ـ بـەڵێ، بـەڵام ئـەو بابەتـە سـەرەكییەى كـە رووناكبیرى پۆست مۆدێرن رووبەڕووى بۆتـەوە، بابەتى پۆست ـ مێتافیزیكە، واتە قۆنـاغى پـاش هایدگـەر. هـەروەها كـە دەزانـن، هایدگـەر لافـى ئـەوەى لێـدەدا كـە مێتافیزیـك لەگـەڵ نیـچەدا كۆتــایى هـــاتووە. كــۆى بیركردنـــەوەكانى رووناكبیرانو تەنانـەت هەنـدێك لـە جۆرەكـانى رووناكبیرى لە ئێراندا، وەكو فەرید( مەبەست لە ئەحمــەدى فەریــدە)، گەیــشتن بــە جۆرێــك لــە توتالیتـاریزمى بـە كۆمـەڵو ئایـدۆلۆژیا. بـەڵام پەژارەى هاوبەشى رووناكبیرانى ئێستا ئەوەیە كە چۆن لـە قۆنـاغى پـاش مێتافیزیكدا، بیر لـە بكــەرى مافــە سیاســـىو كۆمەڵایەتییـــەكان بكەنـەوە. لـەم بـارەوە هـەر كـام لـە جۆرەكـانى رووناكبیرى رۆژئاوایى، بە شـێوەى جیاواز بیر دەكەنەوە. بۆ نموونە بیریارە نیۆكانتییەكان هەر لـەم هەڵوێستەوە ئیـدعاكانى خۆیـان لـە هەمبـەر پۆست مۆدێرنەكاندا دێننە گۆڕێ.

ـــ واتــــە كەســــانێكى وەك لوفــــور، كاستۆریادیس، لۆك فێرىو هابرماسو تەنانەت راوێڵز...

. بەڵێ. نیۆكانتییەكان دەڵێن، ئەو ناسكارە یاســاییەى قونــاغى رۆشـــنگەرى ئێـــستاش زیندووەو دەسكەوتەكانى ئەگەرى بەردەوامىو مانـەوەیان هەیـە. بـە بۆچـوونى ئـەوان، ئـەو ناسـكارە ترانـسدێنتاڵو جیهانییـە هێـشتا مــاوەو دەتـــوانین پرســـیار لـــە ســـەر چەندوچۆنییەكەى بكەین. هاوكات لە سیستمى رەخنـەكانى مـاركسو فرۆیـدو نیـچە، كـە لـەو كاتـەدا هاتنە گۆڕێ، تێدەگەنو لە روانگەكانى خۆیاندا بایەخ بەم رەخنانە دەدەن.

هەڵێنجاندنى ئەوان لەم بۆچوونە، كە منیش دەكەومــە ســەر ئـەم هێڵــە، ئەوەیــە كــە چــۆن دەتوانین پـێ بنێینـە "هیومانستیەكى نۆى"وە. بــە هــەمان رادە كــە پۆســت مودێرنــەكان(وەك فۆكــو، دێریـــداو دیلـــۆزو... ) رەخنـــە لـــە هیومانستى رۆشنگەرى دەگرن، گروپـى نـوێى رووناكبیرانیش بە سەرنجدان لە رەخنەگەلێكى لـەم چەشـنە، بـەدواى فۆرمەلـەكردنى جۆرێـك هیومـانیزمى بـە دوور لـەم رەخنەگەلـەدان. لـە ئێرانیشدا ئەگەر بمانەوێ كارێكى رووناكبیرى بكەین، دەبێ ئاگاییـەكى تـەواومان لەسـەر بنـەما فكرییەكەى هەبێ.

من وەك گەلێ لـەو كەسانەى كە لـە چەمكى مـۆدێرنو پۆسـت مـۆدێرن ئاگـان، لـە سـەر ئـەم باوەڕە نیم كە ئـەو شتەى لـە رەخنـەكارى بـوارى پۆسـت مۆدێرندایـە، راسـتەوخۆ بهێنرێتـە نێـو تانوپۆى بیرى رووناكبیرى لە وڵاتى ئێمەدا.

ـ واتـە دەڵـێن كـە دەبـێ هێـشتا چـاومان لـە دەسكەوتەكانى رۆشنگەرى بێت.

. بەڵێ، هێشتا دەتوانین لە ناسكارى مـۆدێرن بدوێین. ناسكارێك كە بابەتى مافو سیاسـەتەو مــافى مــرۆڤو بەدەســتهێنانى هەلومــەرجى گونجــاوى سیاســـى. كۆمەڵایـــەتى، خـــاوەن

گرنگییەکی ژیانەکییە بۆ ئەو. هەر ئەو ناسکارەی کە عەقلانییە هاوکات دیموکراتیکیشە. ئەگەر ئێمە ئەم بارودۆخە روناکبیرییە وەلابنێین و یان لەبەرچاوی نەگرین، سروشتییە ئەوەی لێی دەمێنێتەوە هەر ئەو بارودۆخەیە کە بودریار باسی لێوە دەکا، واتە ساویرەکان (توهمات)، کە هیچ دەرفەتێك بۆ هزری فەلسەفی و رەخنەکاری فەلسەفی ناهێڵنەوە.

. کە بیرکردنەوەو فەلسەفاندن بە شێوەیەکی پاشین کاتی(أخرالزمانی) یان ئاپۆکالپتیکە.

. بەڵێ. هاوشێوەی بارودۆخێك کە ناتوانین لەگەڵ هیچ جۆرێکی فەلسەفیدا هەڵسوکەوتێکی دروستمان هەبێ. تەنیا کاری ئێمە ئەوە دەبێ کە دەقە ئامادەکان بە دڵخوازو توانا و ئاستی فەلسەفی راڤە بکەین و سەرقاڵیان بین.

ـ هەر لەم هەلومەرجەی بێ توانایی رامانی فەلسەفیەدایە کە باڵێك لە روناکبیرانی لە کارکەوتووی دژەنوێخوازی نیشتمانی دەڵێن، چونکە لە هەمبەر دەیان دەهلیزداین، هەرکات ویستمان ئەو دەهلیزەی کە پێشتر دیاریمان کردبوو، هەڵدەبژێرین و بەوتەی کوهن، هەر لەو پارادیمەدا دەمێنینەوەو پێویستییەك بە مامەڵەکردن لەگەڵ دەهلیزەکانی دیکەدا، کە یەکیشیان دەهلیزی بیرکردنەوەی رۆژئاواییە، نییە. بەڵام لە بژاردەیەکی مۆزاییکی ئەم چەشنەی دەهلیزەکاندا، سروشتییە کە ئەگەری دیالۆگ و تووێژ لەتەك کولتوورەکانی دیکەدا بۆ ئێمە مومکین نەبێت.

–ئێستا باشترە بەر لە هاتنە نێو باسی روناکبیری ئێرانی، هەندێ لە نەگوتراوەکان لە سەر روناکبیری رۆژئاوایی باس بکەین. روناکبیرانی دەیەی50و60و سەرەتاکانی دەیەی 70 لە رۆژئاوا، شایەتی شەپۆلی سەربەخۆیی خوازی لە کۆمەڵگا ئاسیایی و ئافریقاییەکاندا بوون.

روناکبیرانی ئەوکات لە ژێر کاریگەری بەریانە مارکسیستی و ئیگزیستانسیالیستییەکاندا، پشتیوانیان لە جۆرێك توندوتیژی شۆڕشگێڕانە دەکرد. توندوتیژییەك کە هەوڵی دەدا بەستێنەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن تێك بدا. لە بەستێنێکی لەم چەشنەدا بوو، کە سەرجەم روناکبیرانی جیهانی سێیەمی سەربەخۆیخواز، وەك پەیڕەوانی فانون کە دەیانویست تێڕوانینە شۆڕشگێڕانەکانی ئەوان، هەرس بکەن. مەبەستم دروشمخوازانێکی وەك"شەریعەتی"یە. کەوابوو دەتوانین نەوەی سارتەر، بە هۆی پشتیوانی لە توندوتیژییەکی شۆڕشگێڕانە کە هەڕمێن پێدەری بوون، بە گوناهکار بزانین.

ــ وەك خۆم وشەی گوناه بە وشەیەکی گونجاو نازانم. چونکە گوناه، هەڵگری بارێکی تیۆلۆژیك و دینی پڕڕەنگە. کەسانێك کە خاوەن هزرێکی مارکسیستی بوون، وەك سارتەرو تەنانەت لە قۆناغێکیشدا کامۆ، لەگەڵ زۆرێك لە روناکبیرانی نێوان دەیەی20 تا دەیەی 60و70، بیرکردنەوەیان ئایدۆلۆژیایی بوو.

بە بۆچوونی من، روناکبیرە ئایدۆلۆژیایەکان، تا رادەیەك خیانەتیان بە دەروەستی روناکبیری کرد. چونکە روناکبیر ویژدانی بەئاگای کۆمەڵگایە. ئەم ویژدانە بەئاگایە، دەبێ هەمیشە بە شوێن حەقیقەتەوە

بیٚ و نەیشارێتەوە. لەم بارودۆخەدا، ئەو دەبیٚ بە شوێن پرسیارکردن لە دەرەوەو تەنانەت لە خۆی بێت. ئەمە بە واتای مرۆڤی ناسەقامگرتووش نیە. کەواتە رووناکبیرە حیزبی و ئایدۆلۆژی، لایەنگرانی جۆرە بیرکردنەوەیەکن کە من ناوی دەنێم بیرکردنەوەی پرۆکرۆستی. ئەمانە لەبەر بە دەسەڵات گەیاندنی ئایدۆلۆژی تایبەت بە خۆیان، گرنگی پێویست نادەنە بیرەکان و بەرهەمەکانی رووناکبیرەکانی دیکەی سەردەمی خۆیان. بۆ نموونە خودی سارتەر هیچ گرنگی و سەرنجێکی جیدی نەدەدایە ریمۆن ئارۆن، کە یەکێك لە بیریارە بەرجەستەکانی سەردەمی خۆی بوو. و ئەمەش لە دروشمی بەناوبانگی مانگی مەی 68دا دەرکەوت: "باشترە لەگەڵ سارتەردا بە نادروستی بیر بکەینەوە تا ئەوەی کە لەگەڵ ئارۆندا دروست بیر بکەینەوە". بە بۆچوونی من ئەمە دەتوانیٚ دەرئەنجامی نەخوازراوی هەمان ئاراستەی ئایدۆلۆژی بیٚ کە بە فۆرمی"گوناه" هێناتە ئاراوە.

ـ کەواتە وەك (والێرشتاین) دەتوانین بە هۆی پڕکێشییەکی خوێندکاری لەم چەشنە، پیرۆزبایی لە هەزری 68بکەین، کە هاواریان دەکرد:" هەموو داهێنانەکانتان لەبیر بکەن و دەست بکەن بە خەون بینین. خەون خەریکە هەموو جیهان داگیر دەکات!".

. بەڵیٚ رووناکبیرێك کە بارودۆخی خۆی بە شێوەی ئایدۆلۆژی دەردەخا، سروشتییە کە لە روانگەی تایبەت بە خۆیەوە فەلسەفە راڤەو شرۆڤە بکات. لێرەشدا دۆزی توندوتیژی دێتەگۆڕیٚ. سروشتی بوو کە توندوتیژی بۆ رووناکبیرە شۆڕشگێڕەکانی دەیەی 50و60 شتێکی قبوڵکراو بیٚ، و بۆ رووناکبیرانی نەوەی سێیەمی ئێرانیش هەر بەو رادەیە گرنگ بیٚ، بە جۆرێك کە دەرئەنجامەکەی ببێتە کۆمەڵێك بیرکردنەوەی شۆڕشگێڕانە، کە هەوڵی دا تا گروپێك لە کۆمەڵانی خەڵك بە دژی کۆمەڵانی دیکەی خەڵك بخرۆشێنیٚ. کەواتە بە دیدێکی ئەرێنییەوە دەڕوانێتە دۆزی توندوتیژی. وەك چۆن بۆ نەوەی سارتەریش، توندوتیژی شتێکی پەسەندکراو و شایانی بە کارهێنان بوو. بەڵام هەر لەو ساڵەدا، جۆرێك لە رووناکبیرە رۆژئاواییەکان وەکو پۆل ریکۆر هەبوون، کە بە گوڕوتینەوە بەرگریان لە بنەمای نەبوونی توندوتیژی دەکرد. ریکۆر لە رووناکبیرە پرۆتستانییەکانە، کە لەتەك کۆمەڵێکی دیکە لە لایەنگرانی دژی توندوتیژی، لە گۆڤاری "ئیسپری" دا کارو چالاکییان دەکرد. ئەم کۆمەڵە کەسە پاش ئاوابوونی رووناکبیرە مارکسیستەکان لە رۆژئاوا، گرنگییان وەدەستهێنا، بە جۆرێك کە لە دوای سارتەر چیدی کەمتر رووناکبیرێکی رۆژئاوایی دەتوانن بدۆزنەوە کە داکۆکی لە توندوتیژی یان دروشمە شۆڕشگێڕانەکان بکات.

ـ ئێوە لە کتێبی "مۆدێرنە، دیموکراسی و رووناکبیراندا" وتەیەکی گەلیٚ جێی سەرنجتان هەر لەو ریکۆرەی کە ئاواتی دەخواست دوورەپەرێزی لە توندوتیژی هەموو رووبەری جیهان بگرێتەوە، هێناوەتەوە کە دەڵێت:" ئەگەر نەبوونی توندوتیژی پەیامی کۆمەڵە کەسێکە، کەواتە دەبیٚ وەك ئەرکێك بۆ هەمووان بژمێردرێت، بۆ کەسێك کە بینویەتی و چیدی

ئاوڕی لێ ناداتەوە، دوورەپەرێزی لە توندوتیژی دەیەوێ سەرتاپاکردار بێ، دەیەوێ مێژوو دروست بکات."

- بەڵام شەریعەتی لە نێو نەوەی سێهەمی رووناکبیرە ئێرانییەکاندا، بە تەواوەتی بەهۆی هەمان فەزای ئایدۆلۆژی و بەریانە مارکسیستییە شۆڕشگێڕانەکان، کەوتە ژێر کاریگەری مامۆستاکەی خۆی، گۆرڤیچ و بیریارێکی وەك سارتەر، کە لە بارودۆخی دژی کولتووردا، دژ بە بەهاکانی هەڵقوڵاو لە لیبرالیزمی ئەوروپای رۆژئاوایی و ئامریکای باکووریدا، خەباتیان دەکرد. شەریعەتی رووناکبیرێك بوو کە کۆمەڵناسی خوێندبوو، بەڵام بە هۆی بەرچاوتەنگی و بیرتەسکیەوە کۆمەڵناسیی ریمۆن ئارۆنی فەرامۆش کردبوو، لە کاتێکدا ئارۆن یەکێك لە کۆمەڵناسە هەرە گرنگەکانی سەردەمی شەریعەتی بووە، کە لە بەرچاو نەگیرا.

. رەنگە بتوانین بڵێین شەریعەتی هاوئاراستە لەگەڵ رووناکبیرە ئایدۆلۆژییەکانی نەوەی سارتەردا، بە شوێن مۆدی سەردەمێکەوە بوو کە لە هەلومەرجی ئەودا بیچمی گرتبوو، و گەلێ کەس بەبێ بیرکردنەوە لە بنەما و دەرئەنجامەکانی، شەیدای ببوون.

ـ بەڵێ. دەتوانین شێوەی خەبات دژی کۆلۆنیالیزم و داگیرکاری و ئیمپریالیزم، کە فانوون، ئومە سێزار و رێژیە دوبریە پێشرەوی بوون، بخەینە سەر ئەم مۆدە باوەی ئەوکات. شەریعەتیی بە سیاسی بوو، پتر بە لای داهێنانەکانی سارتەردا راکێشرا تا پۆل ریکۆر، کە هەر لەو سەردەمەدا کتێبگەلێکی بەکەڵکی دەنووسی و خاوەن بەریانێکی دژی توندوتیژی بوو. لە کاتێکدا هیچ هێمایەك لە بەریانێکی فەلسەفیی دژی توندوتیژی لەم چەشنە، لە نێوان ئەم نەوەیە لە رووناکبیرە ئێرانییەکاندا بەدی ناکەین.

ــ لە نێو نەوەی سێیەمی رووناکبیرە ئێرانییەکانی پێش لە شەریعەتیدا، کەسایەتییەکی وەك "جەلالی ئالی ئەحمەدیش" هەیە، کە خاوەن بۆچوونی تایبەت بە خۆی بوو. "ئالی ئەحمەد" لە کتێبی "خزمەت و خەیانەتی رووناکبیران" لافی ئەوەی لێدەدا کە دوو شەبەنگی رۆحانی و سەربازی ناتوانن رۆڵی رووناکبیر بگێڕن. دیارە ئەو بۆ ئەم وتەیەی خۆی لێکدانەوەو بەڵگە، و یان رەنگە پاساوگەلێکی هەبوو. لە شوێنی نەوەی نوێی رووناکبیرە ئێرانییەکانەوە، پێتان وا نیە کە لە هەمبەر بەڵگاندنە تایبەتەکەی"ئالی ئەحمەد" دا، دەکرێ بگوترێ کە رۆحانیش دەتوانی رۆڵی رووناکبیر بگێڕێ.

- بەڵێ، رۆحانیش دەتوانێ رووناکبیر بێ. بەڵام دەبێ بزانین کە روانگەی تیۆلۆژی و هزری رووناکبیری ئەو تا چ ئاستێك دەبنە لەمپەر لە هەمبەر یەکترداو پێکدا دەدەن. کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە رووناکبیر بەردەوام بەدوای هەقیقەتدا دەگەڕێ، بەڵام روانگەی ئایینی رۆحانییەك، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لافی ئەوە لێبدا کە حەقیقەتی ناسیوەو پێیگەیشتووە. ئەمە لە کاتێکدایە کە رووناکبیر بۆ هەتاهەتایە حەقیقەتێکی رەها قەبووڵ ناکا، بەڵکوو راست لە بەرامبەر ئەو روانگەیەدا رادەوەستێ. هەر بۆیە باشترە روحانییەکی رووناکبیر، بەشێك لە

باوەڕەکانی خۆی ، بۆ بەرجەستەکردنەوەی بەشەکانی دیکەی وەلابنێ.

. وادیارە کە ئەگەر ریفۆرمێکی لەم چەشنە نەکرێ، رۆحانی رووناکبیریش دەبێتە بەشێك لە هەژمونی حکوومەتێکی گریمانەکراو، کە باس لە حەقیقەتێکی رەها دەکا و بە شێوەی ناڕاستەوخۆ هەوڵ دەدا تا بە یارمەتی بەشە رووناکبیرییە تایبەتەکانی خۆی، رەهایی خوازی بسەپێنێ.

ـ بەڵێ. بەڵام کەسایەتییەکی رۆحانی کە لافی دەروەستی رووناکبیری لێدەدا، جۆرێك دەروەستی کۆمەڵایەتیشی هەیە، کە هاوکاتە لەتەك ئیماندا. ئەم رووناکبیرە هاوکات لەگەڵ ئیمانی تایبەت بە باوەڕێکی ئاییني، دەتوانێ کارو دەروەستی رووناکبیری خۆیشی بەجێبگەیێنێ. هەر پۆل ریکۆری پرۆتستان نموونەی بەرچاوی ئەم رەوتەیە لە رۆژئاوا. ئەو لە نووسراوەکانی خۆیدا هەمیشە وتوویەتی کە ئیمانی پرۆتستانی خۆی، لەگەڵ فەلسەفەو لێڕوانینە فەلسەفییەکانی تێکەڵ ناکا. پۆل ریکۆر دەیگوت:" کاتێك لەسەر دەقێك کار دەکەم، ئەگەر ئایدیای پرۆتستانی خۆمی لەگەڵ تێکەڵ بکەم، ناگەم بەو ئاکامە کە دیاریم کردبوو." گرووپە سەربازییەکانیش دەتوانن لەگەڵ ئەوەدا کە خاوەنی رۆڵی خۆیانن، هاوکات ئەکتەری گۆڕەپانی رووناکبیریش بن. بۆ نموونە کلاوز وتیزی ئاڵمانی، داهێنەری تیورەی جەنگ، هەروەها رووناکبیرێکیش بوو. ئەو بە پێچەوانەی ژنراڵ کۆتۆزۆف، لە رۆمانی جەنگ و ئاشتی تۆلستۆیدا، کەسێك بوو کە لە هونەر(فن) و بارودۆخی جەنگی دوورکەوتەوەو

هەوڵی دا بە شێوەیەکی ئەرێنی بیر بکاتەوە، هەڵسوکەوت بکا و جگە لە کاری سەربازی، کارێکی دیکەش ئەنجام بدا، بەڵام جەختی لە سەر دەکەمەوە کە دەبێ ئاستو سنووری دوو ئامانجەکە بناسین. کاری رووناکبیریی کارێکی لە کۆتایی نەهاتووە، بەڵام بەرپرسیارێتی سەربازی سیمایەکی روونو دیاریکراوی هەیە.

ـ وەبیرم دێ لە کتێبی کلاوزویتزو تیورەی جەنگدا بەرگریتان لە تیورەی جەنگی ئەقڵانی ئەو کردبوو، و گوتبووتان کە رووناکبیرێکی سەربازی رەفتاری وەك ئەو، بوو بە هۆی ئەوەی کە بە قووڵبوونەوەیەکی پترەوە بیر لەمێتافیزیکی نوێی جەنگ بکەینەوە. دەخوازم لێرەدا باسی رووناکبیری ببەینە بواری پاشینەوە، واتە جێگای رەخنەگر لە بارودۆخی بەجیهانیبووندا. هەندێك کەس لە سەر ئەم باوەڕەن کە کاپیتالیزمی دوایین و دیاردەی"بەجیهانیبوون" بەهۆی دەرئەنجامەکانی خۆیەوە، هەندێ لە رۆڵەکانی پێشتری رووناکبیریان پووچەڵ کردۆتەوە. لەم سۆنگەیەوە وادیارە بەجیهانیبوون دەخوازێ لە رۆڵی کلاسیکی رووناکبیری کەم بکاتەوە، و هەوڵ بدا تا رووناکبیریش ببێتە هاوشێوەی خەڵکی ئاسایی و رۆڵی قارەمانانەی خۆی وەلا بنێت.

. من بە هۆکارێکی گەلێ روون، لە نێوچوونی رووناکبیری قەبووڵ ناکەم. چونکە بابەتی پلۆرالیزم، بەهایی پتر لە جاران دەرکەوتووەو لایەنگری وەدەست هێناوە. لەم هەلومەرجەدا، هەوڵی رووناکبیری بۆ گەیشتن بەم پلۆراڵیزمە، گەلێ پڕ بایەخە. رۆڵی رووناکبیرەکانیش لەم

پەیوەندییــەدا، شــتێکی نکــۆڵی هەڵنــەگرە. هەروەها دەزانین، لە کۆمەڵگای جیهانیدا بەهاو روانگەی جۆراوجۆر بوونیان هەیە، تا کاتێك کە ئــەم بــەها جیاوازانــە ڕێزیــان لێ دەگــیرێ، بەرپرسـیارێتی ڕووناکبیریش دەمێنێتـەوە. بـە دەربڕینێکی دیکە، تا کاتێك کە مرۆڤەکان بیر دەکەنەوە، فەلسەفەش دەمێنێت.

. ئەم روانگەی ئێوە دەمخاتە بیری کورتیلە رسـتەکان لــە کۆتــایی کتێبــی سەرچـاوەی توتالیتـاریزمی هانـا ئارێنـت، کـە لـە سـەر زاری ئاگۆســـــتینی قودیـــــسەوە دەبێــــژێ: "بـە لـەدایکبوونی هـەر مرۆڤێك جیهانێکی نوێ دەدۆزرێتــەوەو فکرێکــی نــوێ دێتــە نێــو گۆڕەپانی کۆمەڵگا."

ـ قبـوڵکردن و ڕێـزی مـن بـۆ تاکگــەرایی دیمـوکراتیکیش ڕاسـت بـە هـۆی پلـۆرالیزمو بەهاو ڕێزە بۆ هزرەکانی ئەوانیتر.

ــ دەخـــوازم هەنـــدێك لـــە وێناکـــانو داهێنانەکانی چەمکی ڕووناکبیری لە رۆژئاوادا بگوێزینـەوە بـۆ ئەزموونـەکانی ڕووناکبیری لـە ئێرانــی هاوچــەرخدا، و لــە بەراوردکردنێکـدا بــزانین کــە نــەوە جیاوازەکــانی ڕوونــاکبیرە ئێرانییــەکان لــە راکێــشانو گواســتنەوەی داهێنانەکانی رۆژئاوا بـۆ ئێـران، یـان بە لۆکاڵی کردنـی ناسـیندا، تـا چ رادەیـەك سـەرکەوتوو بوون. بۆ نموونە نەوەی یەکەمو ڕووناکبیرێکی ئێرانــی وەك تــالبووف، ئاخونــدزادە، ملکــم خانو...تاد، کە پەرۆشی نەریتو نوێخوازییان هـەبوو، هـەوڵێکی زۆریـان دا بـۆ ئـەوەی کـە لـە ڕێگـای جۆراوجـۆرەوە ئـامرازو بیری نوێخـوازی لــە جێگــای نەریتــدا دابنــێن. عەباســی مــیرزا نموونـەی والای ئـەم نـەوە بـوو کـە دیـارە خـەمی سەرەکی ئەو سەرکەوتن بوو بەسەر رووسیەداو قەرەبووکردنـەوەی شکستە سـەربازییەکان. ئـەو لـە ژوبێـری فەرەنـسی دەپرسـیێ:" نـازانم ئـەم هێـزەی کـە ئێـوە ئەوروپییـەکانی زاڵ کـردوە بـە سـەر ئێمـەدا، چـیە، و هۆکـاری لاوازی ئێمـەو پێـشکەوتنی ئێـوە چـیە." فروغـی نموونــەی بیریــارێکی ئاکادمیــە، کــە دەســت دەداتــە وەرگێڕانــی بەرهــەمی هزرڤانــانی ســەردەمی رۆشنگەری. پاش ئەوە نەوەیەکی دووهەم دێتە کایـەوە، کـە بـیر لـە گەڕانـەوە بـۆ ئێرانـی کـۆن دەکاتەوەو هیدایەت نموونەیەکی ئەم نەوەیەیە.

ـ دەخـوازم هـەر لێرەدا هەڵوێستی خـۆم لـە ســەر هیدایــەت روون بکەمــەوە. هیدایــەت، سـەرەڕای بیرکردنەوەیـەکی لـەم چەشـنە، بـە بەراورد لەگەڵ هـەموو نـەوەکانی ڕووناکبیری لە ئێرانـی هاوچـەرخدا، دیاردەیـەکی نـاوازە بـووە. هیدایـەت تاقـە سـیمای ڕوونـاکبیری مـۆدێرنی ئێـران لـە سـەد سـاڵی رابـردوودا بـوو. هیدایـەت کەسـێك بـوو کـە پـشت ئەسـتوور بـوو بـەو ڕووناکبیرییەی کە دەخوازێ بە شێوەی جیهانی بـیر بکاتـەوە. ئـەو کـەڵکی لـە زمـانی فەرەنسی وەردەگــرتو نۆڤێلگەلێکیــشی بــەم زمانــە دەنووســی، چــونکە دەیویــست جیهــانی بیربکاتـەوە. ئـەو کـوڕی سـەردەمی خـۆی بـوو. تەنانــەت تــالبووفو ئاخونــدزادەش کــوڕی سـەردەمی خۆیـان نـەبوون، بەڵکوو ئـەم نەوەیە دەیانویست دەسکەوتەکانی سەدوپەنجا ساڵەی ئەوروپا بگوێزنەوە بۆ ئێران. وەك ڕووناکبیرانی وڵاتی دراوسێمان، تورکیە، کە بە تـەواوەتی ئـەم رۆڵــەیان دەگێــڕا. بــەڵام هیدایــەت رۆڵێکــی

دیکەشی دەگێرا. ئەو چووبووە فەرەنساو هەر لەو کاتەدا سەرنجێکی جیددی دەدا بە سینەما، شانۆو چیرۆکی ئەوروپا. ئەو کوڕی سەردەمی خۆی بوو. بەم واتایەی کە لەو کارەی کە دەبوایە لەو کاتەدا بیکا، تێدەگەیشت و دەیکرد. هیدایەت لەو قوناغەدا بە جۆرێك وتووێژێکی ژیاری لە روانگەیەکی رووناکبیرییەوە پەیرەو دەکرد. ئەو لەتەك کەسێك بە ناوی"لسکۆ" دا لە سەر ژیارەکان دەدوا. راستە کە بە وتەی فەرزانە، هیدایەت ئاکارێکی تایبەت بە خۆی هەبووو پەراوێزنشینیش بوو.

- یان لە قارەمانەکانی چیرۆکەکانی خۆی دەچوو، وەکو مرۆڤەکانی کوندەپەپوو، سەگی بەرەڵلاو تەنانەت بووکیلەی پشت پەردە..

. لە راستیدا هیدایەت وەك نەهەنگێك بوو لە پاڵ بۆقگەلێکدا کە ئەو تەحەمولیانی نەبوو. هیدایەت قەت لەوان نەدەچووو وەك ئەوان بیری نەدەکردەوە. هەر ئەم مۆدێرن بوونەی هیدایەت بووە هۆی ئەوەی کە هەستی خەمباری لە دۆخی نالەباری سەردەم، دەربخاو بدرکێنێ.

. هیدایەت هەر لە ئاکامی ئەم بارودۆخە بێ نورمە سیاسی . کۆمەڵایەتییە لە ئێران دایە کە دەڵێت: "ئەگەر مجەوری مزگەوتی" ئادیس ئابابا "بووینایە دۆخمان لەوە باشتر بوو کە لە ئێراندا هەمانبوو."

- بەڵی ئەو بە پێچەوانەی رووناکبیرانی سەردەمی خۆیەوە کە کەوتبوونە نێو گێژاوی ئایدۆلۆژیاوە، لە هەموو رەوتەکان دوور کەوتەوە. ئەو پێبەندی ئاوەزی رەخنەگرانەی مودێرنەش بوو. لە دۆخێکی لەم چەشنەدا، هیدایەت لە نەوەی دوای خۆی لە پێشتر بوو، کە هۆگری هەندێ لە بەهاکان ببوون و خوازیاری توندوتیژیش بوون. لە ساڵەکانی دواتردا،" سەمەدی بێهرەنگی " راڤەکاری راستەقینەی وتەکان و ئاواتەکانی هیدایەت بوو. بەڵام سەمەدی بێهرەنگی مۆدێلی راستەقینەی رووناکبیری ئایدۆلۆژیە.

بە بۆچوونی ئێوە، جیاوازی تێڕوانینی" بێهرەنگی "و" شایگان" لە چوارچێوەی نەریتی رووناکبیری لە ئێراندا، لە چیدایە؟

- بە بۆچوونی من، لە لایەکەوە ئەم دوو رووناکبیرە گەلێ لێك دوورن." سەمەدی بێهرەنگی" مۆدێلی راستەقینەی رووناکبیری ئایدۆلۆژیە. باشتر بڵێم کە ئەو هێمای شکستی هزر بوو لە ئێراندا. لە کاتێکدا "شایگان" رووناکبیرێکە کە وەك جێنشینی خودی هیدایەت، جیهانی بیر دەکاتەوەو دەنووسێ.

- بە وتەی ئێوە،"شایگان" رووناکبیرێکە لە"ژێر ئاسمانی جیهاندا"[1] دەژی بە دیدێکی پلۆراڵەوە تێڕوانینێکی جیهانی هەیە.

- "شایگان" کەسێکە سەرەتا رەخنەی لە هزرو روانگەی خۆی گرت(بۆ نموونە لە روانگەی ئاسیا لە هەمبەر رۆژئاوای خۆی)، و هەر لەو کاتەدا خۆی لە چەقبەستوویی و رەهاییگەری دوور دەگرت و ئەم دووریەی دەپاراست. بەڵام رووناکبیرێکی لە جۆری "بێهرەنگی"، بە سەرنجدان لە بەرهەمگەلێك کە لە خۆی بەجێهێشتووە، میراتی ئەو دەستە لە رووناکبیرانی پاش خەرمانانی بیست بوو، کە زۆرینەیان ئایدۆلۆژیانە بیریان دەکردوە. ئەمانە زۆربەیان رووناکبیرە"چریك"ییەکان بوون کە بەهۆی

گرنگیدان بە مەرامێکی ئایدۆلۆژییەوە، لە حەقیقەت خوازی رووناکبیریان وەستان.

ـ بەو باسگەلەی کە کران و بە بەراوردی کارنامەی رووناکبیرە ئێرانی و رۆژئاواییەکان، ئێستا دەتوانین لە ناوخۆی ئێران و دەرەوەی ولاتدا بە شوێن ئاماژەکانی رووناکبیرانێکی نوێ بە ئایدیاگەلێکی مۆدێرنەوە بگەڕێین، کە لە روانگەیەکی نوێترو باشترەوە، لە دۆزەکانی ئێستاو داهاتوو دەڕوانن. لەسەر ئەم نەوەیەو هزرەکانیان چ دەڵێن؟

ـ نەوەی نوێی رووناکبیری، لە ساڵەکانی پێش لە شۆرش و بە زۆری لەم چەند ساڵەی دواییدا هاتنە نێو گۆڕەپانی رووناکبیری. نەوەیەك کە پێکهاتووە لە لاوانی نێوان 25 تا 45 ساڵ، کە زۆرتر خاوەن ئایدیاگەلێکی دژە ئایدۆلۆژین. ئەم نەوەیە دەیەوێ جیهانی بیر بکاتەوەو لە وتووێژێکی بەردەوامدا بێ لەگەڵ رووناکبیرانی رۆژئاوادا. هاوکات لە گرنگی دەوڵەمەندی کولتووری ولاتەکەی خۆیشی تێگەیشتووە. ئەوان بە پێچەوانەی رووناکبیرە ئاوەز ئامرازەکانی سەردەمی رەزاشا، و بە پێچەوانەی رووناکبیرە ئایدۆلۆژییەکانی سەردەمی "فەردید" و "ئالی ئەحمەد"وە، کە ئاوەزی رەخنەگرانەیان سنووردار کردبوو، دەیانەوێ وێنەیەکی روون و ئاشکرا لە ئاوەزی پەیوەندیکاری نیشان بدەن. بۆ ئەم نەوەیە، تەکنۆلۆژیای مودێرن و ئاوەزی ئامرازیش، بەقەد بیرکردنەوە لە سەر ژانی مرۆڤ، گرنگی هەیە.

. کەواتە رووناکبیرێکی نوێ کە ئەمڕۆکە لە خەمی ناسینی لایەنە جیاوازەکانی سەدەی بیست و یەکەم دایە، پتر پێویستی بەوە هەیە کە کۆمەڵگای ئێرانی لە جێگا جۆراوجۆرەکانی خۆیدا سەر لە نوێ دروست بکاتەوە و ریفۆرمی تێدا بکات. کۆمەڵگا بە چاکسازی و پاککردنەوەی خۆی، بەدەر لە بەریانە ئایدۆلۆژییەکان، دەبێ لە بیری راکێشان و کەڵك وەرگرتن لە دۆزراوەو داهێنانەکانیاندا بێت. بە بۆچوونی ئێوە، کۆمەڵگای ئێستای ئێران دەبێ تا چ رادەیەك لەگەڵ جیهاندا پێشڕەو و هاوئاراستە بێ، تا بتوانێ رووناکبیری ئەمڕۆیی، بە لای خۆیدا راکێشێ.

ـ لەگەڵ ئەوەدا کە کۆمەڵگای ئێرانی لە لایەنی حکوومەت و دەوڵەتەوە پێویستی بە چاکسازی هەیە. رووناکبیرانیش دەبێ یارمەتیدەریان بن. منیش وا بیردەکەمەوە کە کۆمەڵگا ناتوانێ رووناکبیر بسڕێتەوە و کێشەکانی کۆمەڵگا، بەبێ کەڵك وەرگرتن و دەستێوەردانی فکری ئەوان، چارەسەر بکات. ئەمە کارێکی نەکردەیە، دەبینن کە کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان چۆن بە چاوی رێزەوە لە رووناکبیران دەڕوانن. رووناکبیرانی نەوەی نوێ پردێکی پەیوەندیکاری شیاو دەبن لە نێوان ئێران و کۆمەڵگا رۆئاواییەکان و ژیارەکانی دیکەدا. ئەوان پەیام هێنەرانی وتەو هزرگەلێکی نوێ دەبن. ئێمە ئێرانییەکان ئەگەر نەتوانین کولتوورەکانی دیکە بناسین یان خۆمان نەخەینە هەلومەرجی سەدەی بیست ویەکەمەوە، کولتووری خۆشمان دەدۆڕێنین و ئاکامەکەی دەبێتە گۆشەگیری لە جیهانێکی پێکەوە بەستراودا. ئەو کات دۆخی ئێمە دەبێتە هاوشێوەی بوونەوەرگەلێك لە ئاکواریۆمێکدا[2]

که له دەرەوە چاویان لێدەکەن. کاتێك چالاکیو زیندوویی خۆمان لە دەست بدەین، قەوم ناسە رۆژئاواییەکان وەك دوایین پاشماوەکانی ژیارێكو کولتوورێکی کۆن دەماننناسن. لە وتووێژ لەگەڵ رۆژئاوادا ئاسانتر دەتوانین لە فکری رۆژئاوایی بگەین.

دیارە ئەمە بە واتای بەتەواوەتی بوون بە (رۆژئاوایی) نیە، بەڵکوو کەڵك وەرگرتنە لە ئاوەزی رەخنەگرانە. لە نموونە سەرکەوتووەکانی کۆمەڵگا رۆژهەڵاتییەکان دەتوانین ئاماژە بە هیندستان بکەین، کە هاوکات لەگەڵ سەرنجدانی جیددی لە ئاوەزی رەخنەگرانە لە رۆژئاوادا، چالاکانە لە کولتووری جیهانیدا بەشدارە. هەر بۆیە بینیتان کە خەڵاتی نۆبلی ساڵی 1999 درا بە هیندییەك. نووسەرگەلێکی وەك"مایکێل ئاندانچی" لە نیمچە کیشوەری هیند، بە سانایی لە کولتووری جیهانیدا وەرگیراون. سروشتییە کە هەموو ئەمانەش دەبنە هۆی پێشکەوتنی کولتووری خۆشیان. بارودۆخێك کە ئێمە گیرۆدەی بوونین جێی سەرنجە، واتە هاوکات لەگەڵ بەهرەگرتن لە تەکنەلۆژیای مۆدێرنو ئاوەزی ئامرازی ( سی.ئێن.ئێن، کۆکاکۆلا، مەك دۆناڵدو..) ئاوەزی رەخنەگرانەی رۆژئاوایی لە خۆمان دوور دەکەینەوە: ئەم کێشەیە دەبێ لە رەوتی گەشەسەندنی سیاسیدا چارەسەر بکرێ. هەربۆیە لە دۆخی ئاوەز ئامرازی هەنووکەییدا، ئێمە بەبێ ئەوەی کە لە ئاوەزی رەخنەگرانەو ئامرازی تێپەربووبین، لە قەفەسی ئاسنینی ئەودا گیرمان کردوە. ئەمە دۆخێکی هاوشێوەی چیرۆکەکانی کافکایە. لە هەلو مەرجێکدا کە هەموو مێتافیزیكو فیزیکی رۆژئاوا هێرشیان کردۆتە سەرمان، ئێمە بەبێ ئەوەی کە گرنگییەکی پێبدەین چێژێکی لە رادەبەدەر لە دوایین دەسکەوتەکانی وەردەگرین، بەڵام لایەنی تەواوکاری ئەو کە لە بنەڕەتدا وێنەی بنەمایی مۆدێرنیتەیە، واتە ئاوەزی رەخنەگرانە، دەکەوێتە بەر نکۆڵی لێکردنو سووکایەتی پێکردن.

. کەواتە رووناکبیری نەوەی نوێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ کە بە فۆرمو رێگای جۆراوجۆر، جۆرەکانو وێنەکانی کولتووری رۆژئاوایی بە کۆمەڵگای خۆی بناسێنێ. ئەم نەوەیە ئەرکێکی مەزنی دیکەشی لەسەر شانە، ئەویش رووبەڕووبوونەوەی بەشی نەریتی و کۆنزەرڤاتیڤی رووناکبیری پێشینی ئێرانە، کە هێشتا باس لە مەترسییەکانی ئیمپریالیزم دەکاو لە نوێخوازی رۆژئاوایی تەنیا دڵی بە فوتباڵ خۆش کردوە. بەڵام لە کولتوورە زیندوو چالاکەکەی، کە زمانی هاوبەشی لێك تێگەیشتنی بۆ مرۆڤ بە دیاری هێناوە، ناڕازییەو بۆ فەزای ژیانی لۆکاڵی خۆی بە خراپی دەزانێ. لەم ئاراستەیەدا، دەروەستی راستەقینەی رووناکبیری ئێرانی، بریتیە لە ناساندنی ئاوەزی رەخنەگرانە لە ئێراندا.

**پەراوێزەکان:**

1-لە ژێر ئاسمانی جیهاندا ناوی کتێبی وتوێژی جهانبگلوە لەگەڵ داریوشی شایگاندا.

2-ئاکواریوم: ئەو شوشە پڕ ئاوەی ماسی تیا دادەنرێت.

**سەرچاوە:**

کتێبی موج چهارم. نووسینی رامین جەهانبەگلوو

## ئۆرهان پاموك

### سەبارەت بەو رازو ڕەمزانە قسە دەكات كە گەیاندیان بە نۆبڵ

محمد فهیمی

لە فارسییەوە: محەمەد كەریم

**"رازی كاركردن، بریتییە لە توانای نووسین و دڕاندن"**

ئەم دەقەی خوارەوە لەو گفتوگۆیە وەرگیراوە كە چەند ساڵێ بەر لە ئێستا ئۆرهان پاموك لەگەڵ یەكێ لە كەناڵە تەلەفزیۆنییەكاندا لە ژوورەكەی خۆیدا ئەنجامیداوە، كە بەبۆنەی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵەوە، لەم ماوەیەدا لەرۆژنامەی "میلیەت"ی توركیادا بۆ یەكەمجار بڵاوبۆتەوە. پاموك لەم گفتو گۆیەدا سەبارەت بەشێوازەكانی نووسینی خۆی قسە دەكات.

پێشان شەوان دەمنووسی، كاتێ هەموو شار لەخەودا بوون. هەتا سەعات چواری بەیانی، رێك سەعات چوار دەخەوتم. بەمشێوەیە شانزە ساڵ تێپەڕی. باشترین لاپەڕەكانی زۆربەی رۆمانەكانم بەرهەمی بێدەنگیی نیوەشەون. تا ئەوەی رۆژێ لەرۆژان بووم بەخاوەنی كچێك و تەواوی ژیانم گۆڕانی بەسەردا هات. كە كاتی چوون بۆ قوتابخانەی كچەكەم هات هەموو رۆژێ سەعات حەوت پێكەوە لەخەو هەڵدەساین و دەچووین بۆ قوتابخانە.

"وەكو كەرێك وام لە دوورگەیەكی بچووكدا"

لەژووری كاركردنەكەمەوە تا قوتابخانەی كچەكەم تەقریبەن پانزە دەقە رێیە. لە كۆڵانەكانی پشت" بیگ ئۆغلۆ" وە*- واتە جوانترین ناوچەی ئەستانبول- تێدەپەڕین. بەناو تەلارەكانی رۆمی كۆندا كە كەش و هەوای لە هی جنێف دەچوو و ئاوێتەی بایەك بوو كە بۆنی كۆچەرە ئەوروپاییەكانی لێدەهات. لە بەرامبەر ئەو خانووانەی كە وەستا ئەرمەنییەكان دروستیان كردبوو. لە كاتێكدا خۆشحاڵ بووم بەوەی كە بەیانی زوو لەخەو

هەڵساوم بیرم لە ئیشی رۆژانەم دەكردەوە. بێدەنگیی بەرە بەیان لەگەڵ ئەو بۆنانەدا كە لە یەكەم قۆناغی بڵاوبوونەوەدان بە شارداو ئەو هەتاوەی كە هێشتا توانای گەرمكردنی نەبوو، ئاوێتەدەبوو. لاقەكانم كە شارەزای رێگای كۆڵانەكەن، وەكو كەرێك لە دوورگەیەكی بچووكدا كە لەگەڵ رێگەی رۆژانەدا راهاتووە، تا ژووری كارەكەم دەمبەن.

"كازیوە بەسەر رۆمانەكانمدا زاڵبوو"

پێشان لەبەرئەوەی بەشەو دەمنووسی، تاریكی و شەوانی شارم چاك دەناسی. زۆرجار نیوەشەو دەستم لە نووسین هەڵدەگرت. لە"نیشان تاش"** لەو سەندەویچانەی كە بە شەویش كراوە بوون چەند شتێكم دەكڕی. ئاشنای هەموو شتێكی شەو بووم. سۆزانییەكان، ئوتومبیلەكان، بێكەس و كارەكان، ئوتومبیلەكانی ئاسایش و پۆلیس كە بەهات و هەراوە تێپەڕدەبوون و ئەو سەگانەی نیوەشەو پەیدا دەبوون. شەوانی ئەستانبول بە بێدەنگیی خۆیەوە، ئاشنای برسكە بریسكی ئەو گڵۆپە شیریانەی كە تەنها شەوان دەتوانرێ دەست نیشان بكرێن و ئەو تەنەكە خۆڵەش بووم كە پشیلەیەك رشتوویەتی و خۆڵەكەی بەدەوری خۆیدا بڵاوكردۆتەوە، ئاشنای ئەو غەوارانە بووم كە بەرۆژ بەرچاو ناكەون. سەراپای ئەم شتانە جێگایەكی زۆریان لە رۆمانەكانمدا داگیركردووە، كە هۆیەكەی تەنها بەشەو نووسین و پیاسەی شەوانە بوو. بەلام لەگەڵ لەدایكبوونی كچەكەمدا، دەرگاكانی دنیای شەوانی ئەستانبول داخران. كازیوە بەسەر رۆمانەكانمدا زاڵبوو: ئەو پاس و ئوتومبیلانەی كە تاك و تەرا تێپەڕدەبوون، ئەو كولیچە فرۆش و "سالیب"*** فرۆشانەی كە سینییەكانیان لەسەر شۆستەكان دادەناو هەڵیان دەگرت، دەنگی فیكەی پۆلیسی هاتوچۆ لە وێستگە قەرەباڵغەكاندا...

"كاتێ دەچمە ژووری ئیشكردنم"

بەر لە هەر شتێ، دەچم بەلای قاوەوە. بەیانیان زۆر رۆژنامە، ناخوێنمەوە. چاوێكیان پێدا دەخشێنم و بەس، قەت حەزم لە كات كوشتن نییە لەناو جێگادا، حەزدەكەم وەكو سەربازێكی غافڵگیركراو، وەكو پشیلەیەكی ناومال كە ماق بەسەرماڵەكەوە هەیە، هەشت دەقە لەسەر سفرەی نانخواردن بم. لەماوەی شانزە دەقەدا لەماڵ دەچمەدەرێ. رۆژنامە ناخوێنمەوە، چونكە لە ریتمی وزەو توانام كەمدەكاتەوە. رۆژنامە رۆحیەتی نووسەرێ تێكدەدات، كە لەگەڵ كێشەكانی ولاتەكەیدا رووبەروو بۆتەوە. دەبێتە هۆی ئەوەی كە رۆژەكەی خراپ دەستپێبكات.

"دەبێ سەدان یاسات هەبێت"

وەكو ئامێرێكی بەرمەجەكراو دەچمەوە سەر نووسینەكانم، هەندێ یاساو رێو رەسم و عادەتم رێكیان خستووم. خوێنەرانم هەمیشە دەپرسن: "چۆن دەتوانیت باش بنووسیت؟" وەلامی من ئەوەیە: نووسەریی كارێكە كە رێسای زۆری دەوێت. دەبێت بۆخۆت سەدان یاسات هەبێت بۆ ئەوەی بەرەو كاركردن پاڵت پێوەبنێن. دێیت، قاوەكەت دروست دەكەیت، و رێورەسمی بچووك دەست پێدەكات. ریورەسمی بچووك چییە؟ قاوەی سەرمێزەكە، كاغەزی بچووكی نووسینی تێبینی، داخستنی تەلەفۆن،

پیاسەکردن، دانیشتن لە تەنیشت مێزەکەوە، لە بەئەنجامدانی ئەو کارانەدا کە ناچارت دەکەن بنووسیت هەست بە رەزامەندی دەکەی. دەبێت باوەڕت بەوە هەبێت کە بەختەوەریی ئەوەیە. رەنگە بەلای کەسانی ترەوە بە قەشمەریی بێتە بەرچاو. بەڵام ملدان بەم یاسایانە، لەخودی یاساکان گرنگترە. یاساکانی نووسین، یان لەراستیدا عادەتەکانم، بە رێزەوە بەرەو کاغەز پەلکێشم دەکەن، هەرچەندە لە روانگەی کەسانی ترەوە بە قەشمەریی دێتە بەرچاو.

"خۆم دارکاریی کردو بووم بە نووسەر"

بە کورتی بە یاساکانی خۆم دارکاریی و مشت و ماڵ و پەروەردە کردو بووم بە نووسەر. بەمشێوەیە دەتوانی ببی بە نووسەر. ئەگەر پێتوایە نووسین بریتییە لەچەند جووڵەیەکی نمایشی و بوونی ژیانێکی پڕ کارەسات و بەشکۆ، دەبێت بەر لەهەر شتێ ئەم گریمانە توور بدەی. لە ژوورێکی بچووکدا، بە تاقی تەنیا، بە یاساو نەریتەکان، بە هەڵکۆڵینی رۆح، بەعەشق بۆ کارەکەت، و لە راستیدا بەچاوتێبڕین لە کاغەز بە درێژایی کاتەکە و تەماشاکردنی ژیان لە کلاورۆژنەی خەیاڵەوە، دەتوانیت بچیتە ناو حیکایەتی نووسینەوە.

"لەگەڵ گیرۆدەبوونی زەینمدا، پیاسە دەکەم"

ئامۆژگارییەکەی هەمەنگوای، یەکەم هەنگاوی کارکردنمە: واتە خوێندنەوەی ئەوەی رۆژی پێشوو نووسیوومە. ئەم کارە، لەگەڵ ئەوەدا کە دەمگەڕێنێتەوە بۆ فەزای رۆمانەکەم، چانسی چاککردنی نووسینەکانیشم دەداتێ.

سەبارەت بەچاکی و خراپییان یەك بڕیار دەدەم: ئەگەر رۆژی بێڕەحمیم بێت زوو دەیاندڕێنم و تووڕیان دەدەم. هەر بۆیە لە دەفتەری تەلداردا دەنووسم. دەستم بە ترسنۆکی رانەهێناوە. گەورەترین رەخنە، لەتو پەتکردن و دڕاندنە. لەدوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکانمان، رەخنەگرەکان زۆرترین پارچە لە گۆشەو کەناری کتێبەکە دەکەنەوە، بەڵام ئێمەی نووسەران بۆ بەرگرتن لە کوشتنی کتێبەکانمان، هەر لە دەسپێکی کارەکەوە شتە زیادەکان دەدڕێنین. یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی نووسین، بریتییە لە دڕاندن و تووڕدانی کاغەزەکان، ئەگەر لە کاغەزێکی باشتردا بنووسیت بریتییە لە سڕینەوەو چاککردن.

"رستەی جوان هەڵگرە بۆ بەیانی"

تەواوی مەسەلەکە بریتییە: لە توانای دەستپێکردنی یەکەم رستەو باش دەستپێکردنی ئەو رۆژەو توانای نووسینی یەکەم رستە لەیەکەم ساتدا. دیسان مامۆستای بەرێزمان هەمەنگوای لەم بارەیەوە پەندێکی جوانی هەیە کەدەڵێ " لە کۆتایی ئەو رۆژەدا کە نووسیووتە ئەگەر رستەیەکی جوانت لە هەگبەدایە مەینووسە، هەڵیگرە بۆ رۆژی دوای ئەوە بۆ ئەوەی سبەی بتوانیت بەبێ هیچ وەستانێ دەست بە نووسین بکەیتەوە." واتە ئەگەر رستەیەکی وەك "ئەحمەد دەرگاکەی کردەوە، دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو. دەترسا"ت لەمێشکدایە، مەینووسەو هەڵیگرە بۆ بەیانی، سبەی کە نووسینەکەی رۆژی پێشوو دەخوێنیتەوە، خێرا ئەو رستەیە لەشوێنی خۆیدا دابنێ.

"زۆرم نووســیووه بــەڵام بێگومــان بــاش دەرنەچوون"

دوای نووســینی یەکــەم رســتە، دووەم و سێیەمیش دێتە مێشکتەوە، دەڵێی رستەکان بەرەو خۆیان بەکێشت دەکەن. هاوار دەکەن:" بامنیــشی تێــدا بم، بامنیــشی تێــدابم" دەپارێنــەوە: " بیەڵــە بــامنیش دەرکــەوم." ئەگەرچی چەندین مانگ وساڵ بیرت لە تەواوی کەش و هەواو کارەکتەرەکان کردۆتەوە، بەڵام بە رستە ژیانیان پێدەبەخشیت، بەگشتی دوای نووسینی پێنج شەش رستە دەکەومە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، چونکە ئەم برە بەلامەوە زۆرە، زۆرم نووسیووە بەڵام بێگومان باش دەرنەچوون، بە خۆم دەڵێم " پەلە مەکە سەرلەنوێ بیخوێنەرەوە" دەیخوێنمەوە. لە سەرسامی و لە خۆشیدا هەڵدەسم و دەستدەکەم بە پیاسە، پیاسە، واتە ئەوکارەی ئیشی هەموو رۆژێکمە. راستە تا ئێستا زیندانی نەکراوم بەڵام ئەمە لە ئەدەب و فیلمە تورکییەکانەوە فێر بووم. نووسەرانی تورک کە زیندانی بوون، زیاتر بە پیاسەکردن گەشەیان کردووەو کاریان کردووە. زۆرترین کاتی نووسین بە پیاسەکردن بەسەردەبەم نەك بە چاوبڕین لە کاغەزەکان. لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی تری ماڵەکە. ڕاڕەوێکی درێژو هۆڵێکی کورتم هەیە بۆ پیاسەکردن. لەکاتی پیاسەکردن بەو شوێنانەدا بیر لەو ناوانە دەکەمەوە کەدوای ئەوە دێنە ناو رۆمانەکەمەوە. واهەست دەکەم بەلایاندا دەڕۆم. لەناخەوە هەست بە رستەکان دەکەم و بۆ نووسینیان، لەناخمدا ئارەزوویەکی زۆر دروست دەبێت.

"هەڵقووڵانی رستەکان"

"ئەگەر رۆحم بێجووڵە بێت نەخۆش و پەرێشان دەبێت، دەڵێی بەلەقە لێی دەدرێ. لەم کاتانەدا ئەگەر رۆحیشم جووڵەیەك بەخۆی نەدات، بەدەنم دەست بەجووڵە دەکات و پیاسەکانم دەست پێدەکەن. بەرێدا دەڕۆم... بەرێدا دەڕۆم و واهەستدەکەم بە دەوری رستەکاندا دەخولێمەوەو بیر لەپاش و پێشی هەموو رستەیەك دەکەمەوە. دواجار ئەو رستەیە دێتە مێشکمەوەو دەینووسم. بەڵام نەك تەنیا رستەیەك: وەکو لقی دارهەمێیەکت شۆڕکردبێتەوەو لەجیاتی هەرمێیەك، چەندان هەرمێی لێبەردەبێتەوە، لەناکاو چەندان رستە بەدوای یەکدا لە زەینمەوە هەڵدەقوڵێن و دێنە دەرەوە. بە قایلبوون و ماندووبوونەوە لەجێگایەکدا کۆیان دەکەمەوەو پیاسە دەکەم... رێك وەکو قوتابییەك کە خەریکە مەسەلەیەکی بیرکاری حەلدەکات. دەچم بۆ لای سەلاجەکە و لە کاتێکدا کە سەلاجەکە دەگەڕێم، نووسینەکەش دەخوێنمەوە، مێشکم ئیسراحەت دەکات، پاشان دووبارە لەشکری مێشکم ریز دەبێت. دووبارە لقێك شۆڕدەبێتەوەو دووبارە پیاسە دەکەمەوە. کاتی نووسینم ئاوا دەگوزەرێ. ئەو کاتەی بۆ نووسین تەرخانی دەکەم زۆر کەمە. زیاتر کاتەکە لە بیرکردنەوە و رێکخستنەوەی لەشکری مێشکمدا بەسەردەبەم.

"باوکە، کتێبەکەتم بینی، چاپ بووە"

بەداخەوە ئیتر وەکو جاران ناهەژێم. ئەوسا، بۆنموونە کاتێ کە بۆ یەکەمجار یەکەم رۆمانم " جەودەت بەگ و کوڕەکانی" م لە دوکانی کتێبفرۆشی بینی نە پێشان ئاگام لە دیزاینی

بەرگەکەی بوو نە لە شێوازی ڕێکخستنی چاپکردنی. بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئێستا دەست لە هەموو شتێکی کتێبەکەم وەردەدەم. هەم لە دیزاینی بەرگەکەو لە ناوەوەی کتێبەکە. هەر بۆیە کاتێ لەدوای چاپ، کتێبەکە دەگرم بەدەستەوە سەرم لە هیچ ناسوڕمێ. ئەمجارە ئەوەی کە سەری سوڕما کچەکەم بوو. ڕۆمانی "ناوم سوورەیە" م پێشکەش کردبوو بە کچەکەم و پاڵەوانەکەشم بەناوی ئەوەوە ناو نابوو. ڕۆژێ لە کتێب فرۆشییەك، ئاگادارییەکی دەستنووسی دیبوو بەم شێوەیە" کتێبە تازەکەی ئورهان پاموك کەوتە بازاڕەوە". یەکسەر تەلەفۆنی بۆکردم و وتی" باوکە، کتێبەکەتم بینی، چاپبووە". لەخۆشحاڵیدا هەڵدەبەزییەوە. ئێستا ئیدی حاڵەتی کتوپڕی خۆشی کتێبە تازەکانم بەکچەکەم سپاردووە.

"پێویستییەکان: قاوەو دەرمانی ماعیدە"

کاتێ نووسینی ڕۆمانی" ناوم سوورەیە" تەواو بوو، زۆر ماندوو ببووم. لە هەلومەرجێکی وادا بچووکترین کێشە وەکو کایەك وایە کە دەبێت بە کێو. کەم حەوسەڵە ببووم و زوو زویر دەبووم، پێموابوو هەرکەسێ بمبینێ دەڵێت" ئەم قسە قۆڕانە چییە نووسیووتە" لەسەر ڕێکخستنی کۆتایی ڕۆمانەکە زۆرم کارکردبوو، بەدوای سەرگەرمییەکدا دەگەڕام. نەمدەزانی چییە. لەگەڵ یەکێ لە هاوڕێیانمدا چووین بۆ سەیری فیلمی" ڕزگارکارکرنی ڕایانی سەرباز" ستیڤان سپێلبێرگ. هۆڵی سینەماکە هەتا سەرەوە پڕ ببوو و ناچاربووین لەسەر کورسییەکانی ڕیزی پێشەوە دابنیشین. سەرئەنجام شاشەی سینەماکە گەمارۆیدام. سینەمای دالبی هەژاندمی. مۆسیقا سەراپای ناخمی داگیر کردبوو. دەتوت منیش لەناو فیلمەکەدام. لەناو جەرگەی ئەو جەنگەدا، لەناو ئەو ترسە گەورەیەدا. ئەو ترسە زۆر جوانبوو. ئاگام لەخۆم نەمابوو. ئەوەندە خۆشحاڵبووم کە سەرەنجام خۆشییەکەم گۆڕا بە ناخۆشی، چونکە گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە هونەری سینەما لە ڕۆمان بالاترە، لەبەرئەوەی سینەما دەتوانێت لە کاتی ئەوپەڕی ماندوو بوونیشماندا بەلای خۆیدا بەکێشمان بکات. دەتوانێت دڵخۆشیمان بداتەوە و دەتوانێت کارێکی وابکات کەجیهان لەبیری خۆمان ببەینەوە.

"دەرمان و قاوەو جگەرە"

حەبی مەعیدەکەم لەسەر مێزەکەیە، ئەمە یەکێکە لە ڕێو ڕەسمە بچووکەکەکانی نووسینی من. لەکاتی نووسیندا، جار بە جارێ یەکێ لەو حەبانە دەخەمە دەممەوە، لەبەرئەوەی ڕستەکان بەدڵم نەبن ڕژانی ئەسیدی مەعیدەم زۆر زیاد دەکات. لەوانەیە حەبەکان بەکەڵکی مەعیدەم نەیەن بەڵام بەکەڵکی مێشکم دێن. ساڵانێك جگەرەم دەکێشاو لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا جەگەرەکێشانەکەم زیادی دەکرد، هەمیشە جگەرە بەدەستێکمەوەو قەڵەم بەدەستەکەی ترمەوە بوو، وردە وردە ترسم لێنیشت. بینیم خەریکە بە چوار ناڵە بەرەو مەرگ غاردەدەم. بە پشت بەستن بە ئیرادەی خۆم وازم لە جگەرەکێشان هێنا، بەڵام هێشتا لەسەر قاوەخواردنەوە بەردەوامم. ئەمەش بەشێکی ترە لە ڕێوڕەسمی نووسین. لەسەر مێزەکەم

هەڵدەستم و قاوە دروستدەکەم. ڕێك بەهەمان شـێوە کـە لـە ڕۆمـانی "کتێبـی ڕەش"دا نووسیوومە، وەکو کەسێکی کەم سەبر، بەبێ هیچ ئامانجێ سەلاجەکە دەگەڕێم، وەك ئەوەی یەکێك هاتبێ و شتێکی تازەی تێکردبێ. پاشان دوبـارە پیاسـەکردن و چـوونەوە بـۆلای قـاوە دەسـت پێدەکاتـەوە. هـەموو ئەمانـە نـەریت و ڕێـوڕەسمی ڕۆژانـەی نووسـەرن کـە نـاتوانێ دەستبەرداریان بێت.

"هەموودنیا هاوار دەکەن " بنووسە ئیتر"

هـاوینی ڕابـردوو لەدورگەیـەکی چـۆڵدا دەژیام و ڕۆژی دوانزە سەعات ئیشم دەکرد. زۆر خۆشـحاڵبووم. کـاتێ لـە دورگـەدابم جگـە لـە ڕۆمانەکەم بیر لەهیچ شتێکی تر ناکەمەوە. نە کەس تەلـەفۆنم بـۆ دەکات و نـە کەسیش دێتـە سـەردانم، یـەکێکی تـر وەڵامـی تەلەفۆنـەکان دەداتەوە. پەیوندیم لەگەڵ هەموو دنیادا دەبڕم. لـە هەلومـەرجێکی وادایـە کـە مێـشك و ڕۆحـی مـرۆڤ وەکـو کەللـەی شـەمەندەفەر دەکەوێتـە جووڵە. بیرۆکەی نوێ بەدوای یەکدا دێن و وەکو زنجیرێـك بەیەکـەوە دەبەسـترێن. دەڵێـی خۆشـم دەبم بەنووسین و کتێبەکە دەبێت بەمن. لەگەڵ بیرۆکەکانمدا دەبم بە یەك. بەیانی کە لە خەو هەڵدەسم دەچم خۆم بشۆم، لە هەموو گیانمەوە لەجیاتی ئاو خەیاڵاتم دەڕژێن. دەچمە کەناری دەریـاو رادەکـشێم، بیردەکەمـەوە، وەك ئـەوەی دەریاکە بەشێك بێت لە ڕۆمانەکەم. زیاتر لەهەر کاتێکی دیکە بە بەرهەم دەبم. شەوان سەعات 9:30 دەخـەوتم و بـەیانیان سـەعات 3:30 لەخەو هەڵدەسام. هەتا سەعات 10 ی بەیانی قاوەم دەخواردەوەو زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە دەمنووسـی. لـە شـوێنێکی وا بێدەنگـدا دەڵێـی هـەموو دنیا هـاوار دەکەن: "بنووسە، بنووسـە، ئـیتر" هاواردەکـەن: "دەبـینی ئـەو کـارەی کـە سـەروەختێ وابـیرت دەکـردەوە سـەختە چـەند ئاسـان بووە؟" ژیـان لـەناو سروشـتدا سـادەیە، هەموو شـتێ درۆیـە، هـەموو شـتێ لـە پێنـاوی ئەوەدایـە کـە تـۆ بنووسـیت و درێـژە بەنووسین بدەیت.

"فیشەی تەلەفۆنەکە دەردەهێنم"

زۆرجـار وەڵامـی تەلـەفۆن نادەمـەوە. فیشەکەی دەردەهێـنم. ئەگـەر کەسێك بیـەوێت پەیوەنـدیم پێوەبکـات، دەتوانێـت لەڕێگـەی فاکـسەوە پەیوەنـدیم پێوەبکـات. ماوەیـەك تەلـەفۆنی ڕیکـۆردەرم بـەکاردەهێنا. بـەڵام ئـەو لەگەنەی بەیاد دەهێنامەوە کە " گابریل گارسیا مـارکیز" لـە ڕۆمـانی "سـەد سـاڵ تـەنیایی"دا باسی دەکات. لەو ڕۆمانەدا خێزانێکی قەرەباڵغ هەبوون کە تەنیا یەك ئاودەستخانەیان هەبوو، شەوان کە دەیانەویست بچن بۆ سەرئاو دەبوو هەموویان ڕیز بن. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە بـۆ هەریـەکێکیان لەگـەنێکیان کـڕی. بـەڵام بـە قسەی مارکیز ئەمەش چارەسەر نەبوو. چونکە پاشـان بـەیانیان بـۆ بەتاڵکردنـەوەی لەگەنـەکان ڕیزیـان دەگـرت. مەسـەلەی تەلەفۆنـە ڕیکۆردەرەکەی منیش وەکو مەسەلەی لەگەنەکە وایە. هەوڵدەدەی پەیوەندی بەو کەسەوە بکەی کە پـەیامت بـۆ دانـاوە، بـەڵام زۆریانـت دەست ناکـەوێت تـا بڵێیـت " بمبەخـشە نـاتوانم پەیوەندیت پێوە بکەم، ویستبووت قسەم لەگەڵ بکەی بەڵام لەڕاستیدا قسەیەك لەئارادا نییە بۆ وتـن" دەبـێ بەشـوێنیاندا ڕابکـەی، ئەمـەش

کێشەکە دەکات بە دووئەوەندە. هەربۆیە ئیدی تەلەفۆنی ریکۆردەریش بەکارناهێنم.

"نووکە بەتاڵەکانی سۆفتەکەم هەڵدەگرم"

بەو سۆفتانە دەنووسم کە نووکەکەی دەگۆڕێ و نووکە بەتاڵەکان فڕێنادەم. رێك وەکو راوچییەك کە قەوانی فیشەکەکانی فڕێنادات. بەتاڵبوونەوەی هەر نووکێ بەلای منەوە مانای نووسینی زۆر و بەرەو پێشەوەچوون دەدات. دوای پێداچوونەوەو ئەو راستکردنەوانەی دەیکەم، نووسینەکەم وەکو کلافە دەزوویەکی سەر ونبووی لێدێت. بەهەمان شێوە دەینێرم بۆ چاپ و پەخش. دەستی هاوڕێیانی چاپ و پەخش خۆش بێت، ئێستاکە بووم بە کەسێکی بەناوبانگ نازم دەکێشن. حوسنی عەباس کە لە پێشبرکێی سەرپەرشتیاری چاپ "ئەدیتۆری" ئەوروپادا هەڵبژێردراوە، نووسینەکانم چاك دەکات. دەتوانێت ناخۆشترین دەستوخەتم بخوێنێتەوە و بە خێراییش بینووسێتەوە، هەندێ جار وام بەخەیاڵدا دێت کە ئەگەر منیش نەنووسم، حوسنی عەباس دەتوانێت بەباشی رۆمان بنووسێت.

"رۆمان چۆن دەست پێدەکات"

رۆمان بە بیرۆکەیەك دەست پێدەکات. لەبەرخۆمەوە دەڵێم" دەبێ سەبارەت بە وێنەکێش و وێنەکێشان رۆمانێ بنووسم"، ئەمە بیرۆکە گشتییەکەیە کە لەگەڵ فەزا دروستکردنی رووداوێك و شوێنێك و پاڵەوانێکدا، دەخەملێت. بەشێکیشی پەیوەندی بە هەلومەرجی ژیان و حاڵەتی دەروونییەوە هەیە. لەوانەیە ئەم دوانە رێك لەگەڵ یەکتریدا نەیەنەوە، بەلام کاتێ پاڵەوانەکەت هێنایە بەرچاوی خۆت لەکاتی هاتنە خوارەوەیدا بەقادرمەیەکدا، یان ئەو رستەیەی ئەمڕۆ بە زمانتدا هات بەلاتەوە بۆ شوێنی رۆمانەکەت گونجاو دەرچوو یان سەروەختێ توانیت وێنای وردەکارییەکان بکەی، ئەوکاتە دەست بە نووسین دەکەی. نووسینی رۆمان بەشێکی تری هەیە بەناوی کۆکردنەوەی زانیاری. بۆ نموونە بۆ نووسینی رۆمانی"ناوم سوورەیە" لەساڵی 1990 چوومە ناو کتێب فرۆشییەکەوە. لەلاپەڕەی یەکەمی دەفتەری یاداشتەکەمدا ئەمە هاتووە "... 1990/4/21 ... دەربارەی هونەری میناتۆری ئێران و تورکیا داوای چەند کتێبێکم کرد. کابرای کتێب فرۆش رۆیشت کتێبەکان بێنێ." ئەو کاتەی لەپشت مێزەکەوە دانیشتبووم و چاوەڕێم دەکرد، هەر لەخۆمەوە ئەم یاداشتەم بەخەیاڵدا هاتبوو. هەمان رۆژ دەستم کرد بەخوێندنەوەی کتێبەکان و 9 ساڵ دوای ئەوە رۆمانەکەم بلاوبۆوە.

"لەکاتی نووسیندا مۆسیقا قەدەغەیە"

لەگەڵ مۆسیقادا پەیوەندییەکی وەك عەشق و رق لێبوونەوەم هەیە. بەلای منەوە مۆسیقا مەکینەیەکی ئارامبەخشە. ئەو کاتانەی کە هیچم نەکردووە، غەمگینم، یان کە کارەکانم ناڕوات، گوێ لە مۆسیقا دەگرم، مۆسیقا لە کاغەزو دەفتەرەکانم دوورم دەخاتەوە، ئۆخژنم پێدەبەخشێت. سەبارەت بە مۆسیقا زۆر موحافیزەکارو بەرژەوەندیخوازم، بەلای منەوە ئیلهام بەخش و بزوێنەر نییە، ئەگەر واشبێت، ئیلهام ناگۆڕێ بۆ نووسین. هەربۆیە هەتا بۆم بکرێ مۆسیقا لەژیانم بەدوور دەگرم. پێویستی نووسین، ئارامی نییە، بەڵکو رۆحێکی

سـەركێش‌و ئازاربەخـشە. ڕۆحیەتێكـە كـە بتوانیـت سـەرزەمینێك داگیر بكـەی كـە كـەس ناوێرێـت پێـی تێبخـات، ڕۆحێكـی ئـاوا ئازاربەخش و سەركەش و تالانكەرو زۆردار كە گیانی مرۆڤ دەسووتێنێت، پێویستی بە مۆسیقا نییـە. بـە پێـچەوانەوە، پێموایـە ئـەو كەسـانە پێویستییان بە مۆسیقا هەیە كە نووسینەكانی مـن دەخوێننـەوە. ئەگـەر مـن گـوێ لـە مۆسیقا بگـرم نـاتوانم ئـەو پێویـستییە لەوانـدا دروست بكەم.

"ڕۆژی یەك لاپەڕە"

بیـست سـاڵە كـە دەنووسـم. ژمـارەی ئـەو لاپەڕانـەی نووسـیوومە، حـسابم كـردووە ، لێكمـداوەو دابـەشمكردووە. بەحـسابی مـن، لـە ساڵێكدا 300 ڕۆژ ئیش دەكەم و 170 بۆ 180 لاپـەڕە دەنووسـم. بەمپێیـە، دەبـێ بـە ڕۆژی لـە سـەدا 75 ی لاپەڕەیـەك. لەگـەڵ ئەوەشـدا كـە ناگاتە لاپەڕەیەك بەڵام تەواوی ڕۆژەكە لە ژووری كاركردنەكەمـدا بەسـەردەبەم. جـاری وایـە ئەنجامی پانزە ڕۆژ هەوڵدان دەبێتـە 10 لاپـەڕە، كـە هـەمووی لەتوپـەت دەكـەم و فڕێیدەدەمـە تەنەكەی خۆڵەكەوە.

"تـەواوكردنی ڕۆمانێـك وەكـو تـەواوكردنی سانەوی وایە"

ڕۆژی تـەواوكردنی ڕۆمانێـك. ڕێـك وەكـو تـەواوكردنی قۆنـاغی سـانەوی وایـە. لەیـەك سـاتدا، هەسـت دەكـەی جیهـان لەبەرامبـەرتا سـنووری نییـە، هـەم لـەرووی كاتـەوەو هـەم لـەرووی شـوێنەوە، ئـەو كارانـەی كـە دەبوایـە بیانكەی كراون. بیركردنەوە لـە ئەنجامدانی ئەو كارانـەی كـە بـە خۆتـت وتبـوو" لـەدوای تـەواوكردنی ڕۆمانەكـە دەیانكـەم" جـۆرێ سەرمەسـتیت تێدا دروسـت دەكـەن. ژیـان زۆر جوانە. لەوەی كە هەموو ئینسانەكان بزە نایەتە سـەرلێویان سـەرت دەسـوڕمێ. بـەڵام لـەماوەی سـێ ڕۆژدا دەبینیـت كـە لـەماوەی ئـەو چـەند ڕۆژەدا هیچ كارێكی بەسوودت نەكردووە. لەبەر ئـەوەی فـشارت نەخـستۆتە سـەر خـۆت لـە هەرشتێ تەنیا تۆسقاڵێكت چەشتووە.

**پەراوێزەكان:**

* *Beyoglu* یەكێكە لە گەڕەكە جوانەكانی ئەستانبول كەوتۆتە دەوری مەیدانی تەقسیمەوە.

** *Nishantash* یەكێكـە لـە گەڕەكـەكانی سـەرەوەی شاری ئەستانبول، كەوتۆتە ناوچەی عوسمان بیگەوە.

*** *Saleb* سالیب "گونە ڕێوی" گیایەكە كە ڕەگە كـوتراو و وردكراوەكـەی لەگـەڵ شـیرو شـەكردا دەكوڵێنرێ‌و دەخورێ. ئەم خواردنە لە توركیا زۆر باوە.

**سەرچاوە:**

www.1pezehk.com یك پزشك

# دەربارەی پێکدادانی کولتوورەکان

کارڵ پۆپەر

لە فارسییەوە: ئاریا ئەحمەدی

ئەم نوسراوەی خوارەوە وەرگێڕانی وتەکانی کاڕڵ پۆپەر، فەیلەسوفی بەڕەگەز نەمسایی – بەریتانیاییە کە لە بیست و پێنجەمین ساڵیادی پەیمانی دەوڵەتی نەمسا، ڤیەنای پایتەختی ئەو وڵاتە پێشکەشی کردووە و بۆ یەکەمین جار لە ساڵی 1981 بڵاو کراوەتەوە. ئەم پەیڤانە لە مەڕ بابەتی پێکدادان و کارتێکەری چەند لایەنەی کولتوورەکان دەدوێ و تیایدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کولتوورەکان لە کاتی پێکدادانیانــدا نابێت جەنگ و وێرانکارییان لێبکەوێتەوە، بەڵکو دەتوانن لە بەرانبەر یەکتردا شت فێربن و ببنە سەرچاوەی مەزنی لەدایکبوون و پەروەردەکردنی دەروونی و مەعنەوی. پۆپەر لەم ئاخافتنەدا، سەرەڕای ستایشکردنی دەسکەوتە مەزن و حاشاهەڵنەگرەکانی کولتووری ڕۆژئاوا بەتایبەتی کولتووری دیمۆکراسی و زانست و هەڵوێستەی هەڵسەنگێندراوانەی ئەقڵی، باس و لۆمەی شێوە جۆراوجۆرەکانی ناسیۆنالیزمی بەرچاو تەنگ و نەتەوەخوازی ئایدیۆلۆژیك دەکات و "خێڵگەرایی مۆدێرن" بە توندی ڕەت دەکاتەوە. پۆپەر لەو بڕوایەدایە کە دەبێت بیرۆکەی نەکردەو نەشیاوی نەتەوەخوازی ئایدیۆلۆژیك لابردرێ و لە شوێنیدا بیرۆکەی داکۆکیکردن لە مافی کەمینە فرە چەشنەکان و تایبەتمەندییە کولتوورییەکان جێگیر بکرێت. ڕوانگەکانی پۆپەر لەم ئاخافتنەدا، بە سەرنجدان بەو ئینتیما بناژۆخواز و توندڕەوانەی ئەمڕۆی جیهان و پەرەگرتنی ئەقڵکوژی لە پێوەندییە سیاسییە نێو نەتەوەییەکان، و هەروەها گەرم گوڕ بوونی بازاڕی بیرۆکەگەلێکی وەك (ڕوبەڕوبونەوەی شارستانیەتەکان)، (جەنگی کولتوورەکان)، و (جەنگە دینییەکان) کە دەتوانێت گشت دونیا و بنەماڵەی مرۆڤایەتی بەرەو هەڵدێرێکی مەترسیدار ببات، نرخ و جێگای تایبەتی خۆیان هەیە.

* * * * *

بانگێـشتکردنی مـن بـۆ ڤیـەنا جێگـای خۆشـحاڵییەکی گەورەیـە، هـەم لەبـەر بینـینی دۆستانی پێشوو و هەم بۆ پەیمان بەستن لەگەڵ دۆستـانی نوێـدا. هـەروەها شـانازییەکی مـەزن بوو بۆم کاتێك سەرۆکی نەمسایەکانی دەرەوەی ولات، داوای لێکـردم بـۆ ئـەوەی ئـەمرۆ لێـرەدا وتـارێکی کـورت پێـشکەش بکـەم. لـەم بانگێشتنەدا بۆ هەڵبـژاردنی بابـەتی وتارەکـەم، بـە تـەواوەتی سەربەسـت کرابـووم. بـەو جـۆرە بـەڕێزیان بەوپـەڕی خۆشەویـستییەوە، دژواری هەڵبژاردنی بابەتەکەیان بە من سپارد.

ئـازارێکی قـورس بـوو. وا دەردەکـەوت کـە چاوەڕوانن، بابـەتێك هەڵبـژێرم لـە چوارچێوەی مـەیل و زەوقـی شەخـسی خـۆم بێـت. بـەلام لەلایەکی ترەوە دەبوو بابەتێك هەڵبژێرم هەندێك لەگـەڵ ئـەم بۆنەیـەدا، واتـە کۆبوونـەوەی نەمـسایەکانی دەرەوەی ولات (لەمـەڕ جـەژنی بیست و پێنجەمین ساڵیادی پەیمانی تاقانەی دەوڵەتی نەمسا) بێتەوە.

بـە گومـانم لـەوەی ئـەم بابەتـە بتوانێـت لـە ئاست چاوەڕوانیەکاندا بێت. ئەم وتارە تایبەتە بـە یـادی پـەیمانی دەوڵـەت و دەرئەنجامـەکانی، واتـە "پێکـدادانی کولتوورەکـان". مـن هـەوڵ دەدەم بـــە دەســـتەواژەی " پێکــــدادانی کولتوورەکـان"، زاراوەی "*culture clash*" ی ئینگلیزی وەرگێرمە سەر زمانی ئەڵمانی.

هـۆگری مـن بـۆ پێکـدادانی کولتوورەکـان، پەیوەسـتە بـە هـۆگریم بـە مەسـەلەیەکی گەورەترەوە: مەسەلەی تایبەتمەندی و خواستی شارستانییەتی ئەوروپای ئێمە. وا دەردەکەوێ بەشـێك لـە وەلامـی پرسـیارەکە ئـەوە بـێ کـە شارسـتانییەتی رۆژئـاوایی ئێمـە لـە شارسـتانییەتی یۆنـان سەرچـاوەی گرتـووە. شارستانییەتی یۆنان کە دیاردەیەکی ناوازە و بێ هاوتایـە، لـە پێکدادانی کولتوورەکـان، واتـە کولتوورەکـانی رۆژهـەلاتی دەریـای ناوەڕاسـت پێکهـات. ئەمـە دەسـپێکی پێکـدادانی کولتوورەکان لە نێوان رۆژئاوا و رۆژهەلاتدا بوو هـەروەها وەك پێکـدادانی کولتـوری رۆژئـاوا و رۆژهـەلات تەماشـا دەکـرا. ئـەم پێکدادانـە کولتوورییـە لـە تـەك هـومر، بـوو بـە هانـدەرێکی ڕێنوێنیکـەر لـە نێـوان ئـەدەبیاتی یۆنـان و ئەدەبیاتی جیهانی رۆژئاوادا.

ناونیشانی بابەتەکەی من واتـە " پێکدادانی کولتوورەکان"، ئاماژە بە حەدس و گریمانێکی مێژوویی دەکات. حەدس و گریمانی ئەوەی کە پێکـدادانێکی وا بـۆ هەمیـشە نابێـت شـەڕو جـەنگی خـوێنین و وێرانکـاری لێبکەوێتـەوە، بـەڵکو دەتوانرێـت هانـدەرێك بـۆ داهێنـان و دۆزینـەوەی پرسـود و ژیانبـەخش بێـت. تەنانـەت دەتوانێـت ببێتە پوختە و کامڵکەری کولتورێکی ناوازەی وەك کولتـووری یۆنـان، کـە پاشـان لـە کـاتی هەڵـسوکەوت لەگـەڵ رۆمییەکانـدا، لەلایـەن ئەوانیـشەوە قبـووڵ کـرا. ئـەم کولتـوورە لـە پێکدادانـەکانی دیکەیـدا، بـە تایبـەت لەگـەڵ کولتـووری عـەرەبی و لـە سـەردەمی (ڕێنـسانس)دا، دووبـارە بووژایـەوە و بـوو بـە کولتـووری رۆژئـاواو شارسـتانییەتی ئـەوروپا و ئـەمریکا. سـەرئەنجام لـە پێکدادانـەکانی تـردا، ئـاڵوگۆڕی لـە گـشت کولتوورەکانی دونیادا پێکهێنا.

بەلام ئایا ئەم شارستانییەتەی رۆژئاوا شتێکی چاکە و شایەنی ئەوەیە بەخێرهاتنی بکرێ؟ ئەم پرسیارە (لانیکەم لە سەردەمی رۆسۆوە گەلاڵە کراوەو بە تایبەت بۆ ئەو مرۆڤە گەنجانەی کە مافی خۆیانە بەردەوام بە شوێن شتی چاکدا بگەڕێن) ئەم پرسیارە خەسڵەتنمای تایبەتمەندیەکانی شارستانییەتی ئەمڕۆی رۆژئاوایە، شارستانییەتێك کە خۆهەڵسەنگێنترین و ریفۆرمخوازترین شارستانییەتی جیهانە. بەر لە پێشکەشکردنی وتارەکەم حەز دەکەم وەلامی ئەو پرسیارە بدەمەوە.

من لەو بڕوایەدام کە شارستانییەتی رۆژئاوایی ئێمە، سەرەڕای هەموو ئەو رەخنانەی کە بە حەق دەتوانرێ لێی بگیردرێ، ئازادترین، یەکسانترین، مرۆڤانەترین و باشترین کولتوورە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئەم شارستانییەتە باشترینە، چونکە ریفۆرمخوازترین دونیایە.

مرۆڤەکان لەسەرتاسەری ئەم گۆی زەویە، دونیاگەلێکی کولتووری فرە جیاواز و نوێیان خوڵقاندووە: دونیای ئەفسانەیی، شیعر، هونەر، مۆسیقا. دونیای کەرەسە بەرهەمهێنەرەکان، ئامێری کار، تەکنیك و زانست. دنیاکانی ئەخلاق، حەق، داکۆکیکردن و یارمەتیدانی منداڵان، نەخۆشەکان و پەککەوتەو هەژارەکانی دیکە. بەلام تەنیا ئەوە لە شارستانییەتی رۆژئاوایی ئێمەدایە کە: خواستی ئەخلاقی بۆ ئازادی تاك، خواستی یەکسانی لە بەرامبەر یاساداو خوازی ئاشتی و ئەگەر بکرێت دووری لە توندوتیژی تا رادەیەك بە فەرمی ناسێندراوەو چووەتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە.

منیش لەبەر ئەم هۆیە شارستانییەتی رۆژئاوایی خۆمان بە باشترین شارستانیەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەزانم. بە دڵنیاییەوە ئەم شارستانیەتە پێویستی بە باشتربوون هەیە. ئەمە تەنیا شارستانییەتێکە کە نزیك بە گشت مرۆڤەکان، لە هەوڵدان بۆ ئەوەی تا پێیان دەکرێ باشتری بکەن.

دەبێت ددان بەو راستییە بنێین کە شارستانییەتی ئێمەش زۆر ناکامڵ و ناپوختەیە، ئەم مەسەلەیە بە تەواوەتی ئاشکرایە. ئێمە بە ئاسانی دەتوانین لەوە تێبگەین، کۆمەڵگای کامڵ ئیمکانی نییە. لە بەرامبەر نزیك بە هەموو ئەو بەهایانەی کە دەتوانن کۆمەڵگایەك پێکبهێنن، کۆمەڵێك بەهای دیکە هەن کە لەگەڵ ئەو بەهایانەدا بەریەکدەکەون. تەنانەت ئازادی کە ڕەنگە بالاترین بەهای کۆمەلایەتی و شەخسی بێت، پێویستە سنووردار بکرێ، چونکە ئازادی کەسێك لەگەڵ ئازادی کەسێکی دیکەدا دەتوانێت بەیەکدا بدات. هەروەکو وەلامی دادوەرێکی ئەمریکی بە تۆمەتبارێك کە بەڵگەی مافی ئازادی خۆی هێناوەتەوە. ئەو دادوەرە دەڵێت: (ئازادی جووڵانی مستی تۆ تا ئەو شوێنەیە کە لوتی دراوسێکەتی لێیە). بەم چەشنە دەگەین بە پۆلێنبەندیەکەی ئێمانوئیل کانت کە پێی وابوو یاسادارێژ ئەرکی ئەوەیە زۆرترین سنووری ئازادی کەسێك، لەگەڵ زۆرترین سنووری ئازادی کەسانی دیکەدا بگونجێنێت. بە واتایەکی تر، ئازادی بەداخەوە

دەبێت لە ڕێگای یاسا واتە ڕێکخستنەوە سنووردار بکرێت. ڕێکخستن، بەهایەکی پێویست، یاخود لۆژیکێکی پێویستە لە بەرامبەر ئازادیدا. ڕەوشەکە سەبارەت بە تەواوی بەهاکانی تر یاخود نزیکەی هەموو ئەو بەهایانەی کە ئێمە گەرەکمانە، هەر بەم چەشنەیە.

ئەمڕۆ بەم جۆرە تێدەگەین بیرۆکەی پیرۆزی "دەوڵەتی خۆشگوزەرانی"ش سنوری خۆی هەیە. دەبینین مەترسیدارە بەرپرسیاریی کەسێك بەرامبەر بە خۆی و خزمەکانی زەوت بکرێت، تەنانەت ڕەنگە لە زۆر ڕووەوە جێی نیگەرانیی بێ کە بەربەرەکانێی ژیان بۆ مرۆڤێکی گەنج زۆر ئاسان بکەین. وا دیارە ئاکامی لەناوچوونی بەرپرسیارێتی شەخسی راستەوخۆ، دەتوانێت ژیانی هەندێك مرۆڤ بێ مانا بکات.

مەسەلەیەکی تر، مەسەلەی ئاشتییە کە ئەمڕۆ زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە پێویستیمان پێی هەیە. ئێمە دەمانەوێ و دەبێت بۆ پێشگیری یاخود سنووردارکردنی بەربەرەکانی هەموو کارێك بکەین. لەلایەکی دیکەوە، کۆمەڵگایەکی بێ ناکۆکی و بێ بەربەرەکانی کۆمەڵگایەکی نامرۆییە. شتێکی وا کۆمەڵگای مرۆیی نییە، بەڵکو دەوڵەتی مێروولەکانە. نابێت لەبیرمان بچێت کە ئاشتیخوازە مەزنەکان، ململانێخوازانێکی گەورەش بوون. "مهاتما گاندی" ململانێخواز بوو: ململانێ بۆ دووری لە توندوتیژی.

کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێویستی بە ئاشتی هەیە، بەلاَم لە هەمان کاتدا پێویستیشی بە ململانێیەکی شێلگیرانەی هزرییە: ئایدیاو بەهاگەلێك کە بتوانین ململانێیان لە پێناودا بکەین. ئێمە لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوای خۆمان فێری بووین (لە یۆنانیەکان فێربووین) کە ئەم کارە بە شمشێر ناکرێت بەڵکو زۆر زیاتر و کارتێکەرتر دەتوانین لە ڕێگای وشەکان و بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵی ئەنجامی بدەین.

کەوابوو کۆمەڵگایەکی پوختە و کامڵ ئیمکانی نییە هەبێت. بەلاَم سیستەمی کۆمەلاَیەتی باشتر و خراپتر هەیە. شارستانییەتی ڕۆژئاوای ئێمە بە قازانجی دیمۆکراسی بڕیاری داوە، واتە فۆرمێکی کۆمەلاَیەتی کە دەتوانرێ وردە وردە بە وشەکان یاخود تەنانەت لە ڕێی بەڵگەهێنانەوەی لۆژیکییەوە بگۆڕدرێ. لۆژیکی نەك بە مانای تێرامانێکی ڕەخنەگرانەی تاکەکەسی، بەڵکو بە واتای ڕەخنەگرتنێکی بابەتیانە دێت کە ئاوێنەی بالاَنوێنی تایبەتمەندیە زانستیەکان و بە تایبەتی زانستە سروشتیەکانی سەردەمی یۆنانیەکانە. بەم چەشنە، من خۆم بە لایەنگری شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەزانم، لایەنگری زانست و دیمۆکراسی. ئەم چەمکانە دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنن کە بتوانین ڕێگر بین لە هەمبەر نەهامەتیە حاشا هەڵنەگرەکان، بۆ ئەوەی بتوانین زاراوگەلێکی وەك دەوڵەتی خۆشگوزەرانی تاقی بکەینەوە و هەڵیسەنگێنین و ئەگەر پێویست بکات باشتری بکەین. من هەروەها خۆم بە لایەنگری زانستێك دەزانم کە ئەمڕۆ کەوتووەتە بەر تانەو لۆمەوە، زانستێك کە خۆهەڵسەنگێنانە لە گەڕاندایە بە شوێن ڕاستی و هەقیقەتدا و بە دۆزینەوەی هەر

شتێکی نوێ بۆمان دەردەخا چەند کەمزانین و نەزانینەکەمان بێسنوورە. هەموو بیرمەندە سروشتییە مەزنەکان بە ئاگابوون لە نەزانین و هەڵەکردنی بێسنووری خۆیان. ئەوان لە رووی فکرییەوە خاکی بوون. ئەگەر گوتە دەڵێت: "تەنیا هەژارەکان نەزانن"، من دەمەوێ بڵێم: "تەنیا هەژارانی هزری نەزانن".

دوای لایەنگریم لە کولتووری رۆژئاواو زانست و بەتایبەتی زانستی سروشتی، پێم خۆشە (بەر لە درێژەپێدانی بابەتی پێکدادانی کولتوورەکان) ئاماژە بە تێزێکی لادەر و ترسناک کارانە بکەم. تێزێک کە بەداخەوە هێشتا بەشێکی گرنگە لە شارستانییەتی رۆژئاوا. مەبەستم تێزی لادەرانە و ترسناکی ناسیۆنالیزم یاخود راستر بڵێین ئایدۆلۆژیای دەوڵەتی نەتەوەییە: تێزێک کە هێشتا لایەنگریەکی فرەی هەیە و لەسەر ئەو خواستە وەستاوە کە سنوورەکانی دەوڵەت دەبێت لەگەڵ سنووری شوێنی نیشتەجێبوونی نەتەوە هاوسەنگ بێت. هەڵەی بنەڕەتی ئەم تێز و خواستە ئەوەیە کە پێی وایە: چونکە گەلان و نەتەوەکان لە پێشەوەی دەوڵەتان هاتوونەتە ئاراوە، ئەوە دەبێت (بۆ وێنە قەومەکان) وەك پەیکەرێکی سروشتی لەلایەن دەوڵەتانەوە پێناسە بکرێن. گشت ئەم فکرانە لە هەقیقەتدا بەرهەم و دروستکراوی خودی دەوڵەتەکانە.

پێویستە لە بەرامبەر ئەم خواستە نەشیاوو نەکردەیەدا، تێزی گرنگ و ئەخلاقی پارێزگاری لە کەمینەکان جێگیر بکەین: تێزێک کە کەمینەگەلی زمانی، دینی و کولتووری هەر وڵاتێك، لە بەرامبەر هێرشی زۆرینەی ئەو وڵاتە بپارێزێ. هەروەها داکۆکیکەری مافی ئەو کەمینانە بێت کە بە هۆی ڕەنگی پێست، چاو و قژەوە لە زۆرینە جیاکراونەتەوە.

بنەمای پارێزگاری کردن لە کەمینەکان ئەگەرچی بە ئاسانی جێبەجێ نابێت، بەڵام پراکتیکتر و کردەیی تر دەردەکەوێ لە هەمبەر بنەمای نەکردەی دەوڵەتی نەتەوەییدا. ئەو پێشکەوتنانەی کە من لەم بوارە لە سەردانە جۆراوجۆرەکانم لە ئەمریکا بینیم (ساڵی 1950 بە دواوە)، گەورەتر بوو لەوەی کە چاوەڕوانی بووم. رێسای پارێزگاری لە کەمینەکان، بە پێچەوانەی رێسای نەتەوەکان، بنەمایەکی ئەخلاقییە.. راست وەك بنەمای پارێزگاریکردن لە منداڵان.

بەڵام با بزانین بۆچی بنەمای دەوڵەتی نەتەوەیی لە دونیا بە تایبەت لە ئەورووپا نەکردەو تەنانەت دێوانە ئاسایە؟ بەم پرسیارە دەگەڕێمەوە سەر بابەتەکەمان واتە پێکدادانی کولتوورەکان. گشت کەسێك دەزانێت کە سەرزمێری ئەورووپا ئاکامی کۆچکردنی نەتەوەکانە. لەو سەردەمەی کە ئینسانەکان لە بیریان ماوە، شەپۆلی مرۆیی یەك لە دوای یەك لە پێدەشتەکانی ناوەڕاستی ئاسیا کەوتنە رێگا بۆ ناوچەکانی باشوور، باشووری رۆژئاوا و زیاتر لە هەموویان بۆ نیوە دوورگەی رۆژئاوای ئاسیا کە ئێمە پێی دەڵێین ئەورووپا، پاشان لە تەك کۆچبەرانی پێشووتردا پێکیان داو پرژو بڵاوبوون. ئەنجامی ئەم کارە موزاییکێکی زمانی، قەومی و کولتووری لێکەوتەوە: تێکەڵاوی و پێکەوەنووسانێك کە جیاکردنەوەی دووبارەی لەیەك مومکین نیە.

زمانەکان تا ڕێژەیەك باشترین ڕێنوێنیکەر و پردی پێوەندیین لە نێوان ئەم تێکەڵاویانەدا. بەڵام بەو هۆیەی کەم تا زۆر شێوە زاری ناوچەیی و سروشتی و زمانگەلی هێڵی گشتگرتر لە ئارادایە کە لە بنەڕەتدا شێوە زارگەلێکی جێی ستایشن ئەم مەسەلەیە لە زمانی هۆڵەندیەکاندا بە جوانی دەردەکەوێت.

زمانەکانی دیکەی وەك فەرەنسی، ئیسپانی، ڕۆمانی و پورتگالی بەرهەمی داگیرکاریە توندوتیژەکانی ڕۆمیەکانە. بەم پێیە، بەتەواوەتی دەردەکەویٚ کە تێکەڵاوبوون و پێکەوە نووسانی زمانەکان، لە ڕاستیدا ناتوانێت ڕێنوێنیکەرێکی دڵنیابەخش بۆ تێپەڕبوون لەم تێکەڵ و پێکەڵییەی نەتەوەکان بێت. ئەم مەسەلەیە لە کاتی وردبوونەوەو سەرنجدان بە نازناوی خێزانەکاندا بە روونی دەردەکەوێت. هەرچەندە زۆرێك لە ناوەکان لە نەمسا و ئەڵمانیا بوونەتە سلۆڤاکی – ئەڵمانیایی و شوێنەواریان سڕاوەتەوە، بەڵام بەو حاڵەش دەتوانریٚ لە زۆر مەسەلە و بواردا شوێنەواری سلۆڤاکی – ئەڵمانیایی دەستنیشان بکرێت. بە تایبەت زۆرێك لەو نازناوە خێزانیانەی ئەشرافی ئەڵمانیا کە بە *ow, of* کۆتاییان پێدێت بە جۆرێك لە جۆرەکان سلۆڤاکین، بەڵام ناتوانرێت سەرچاوەکانی بە وردی بدۆزرێتەوە. چونکە بنەماڵە ئەشرافیەکان (بە پێچەوانەی وەرزێرەکان) لەگەڵ کەسانێك ژیانی هاوسەرێتیان پێك دەهێنا کە لە بنەماڵەی ئەوان زۆر دوور بوون.

ڕاست لە نێو ئەم تێکەڵ و پێکەڵبوونەی ئەورووپادا بوو کە ئایدیا یاخود بیرۆکەی دێوانەئاسای بنەمای نەتەوەکان لەدایك بوو. بیرۆکەیەك کە لە هەمووی زیاتر لە ژێر کاریگەری و کارتێکەری فەیلەسوفانێکی وەك ڕۆسۆ، فیختە، هیگڵ، و بێ شك لە ئاکامی جەنگەکانی ناسراو بە جەنگە ناپلیۆنیەکان هاتۆتە ئاراوە.

بە دڵنیاییەوە پێشڕەوانی ناسیونالیزم هەبوون، بەڵام کولتووری یۆنانی کۆن و ڕۆمیەکان هیچیان ناسیۆنالیستی نەبوون. هەموو ئەو کولتوورانە لە ڕێگای پێکدادانی کولتووره جیاواز و هەمەچەشنەکانی دەریای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە دروست بوون. ئەو مەسەلەیەش ڕاستە کە کولتووری هەنووکەی ڕۆژئاوا سەرچاوەگرتوو لە کولتووری یۆنانیەکانە: مەبەستم بیرۆکەی ئازادی، کولتووری دیموکراسی و هەڵوێستەی هەڵسەنگێندراوو ئەقڵییە کە سەرئەنجام پێکهاتنی زانستە سروشتییە مۆدێرنەکانی لێکەوتەوە.

کۆنترین بەرهەمی ئەدەبی بەجێماو لە یۆنانیەکان، واتە (ئیلیاد و ئودیسە)، بەڵگەی ڕوون و ڕاشکاو پێکدادانی کولتوورەکانە. پێکدادانێك کە لای یۆنانیەکان بۆتە مەسەلەیەکی بابەتییانەو پیشاندەری هەڵوێستێکە کە بە شوێن ڕاڤەکردنی ئەقڵانی مەسەلەکاندا دەگەڕێت. تەنانەت کارکردی خوداکانی هومر بەو جۆرەیە کە بابەتە ئاڵۆز و نائەقڵانییەکان (وەك کێشەی نێوان ئاشیل و ئاگاممنون ) لە ڕێگای بیرۆکەیەکی ڕۆشن و دەروونناسانەوە ڕاڤە بکەن: لە ڕێگای چاوچنۆکی و خولیایی ئەم خودایانە بۆ

ئامانجی کۆتایی مرۆڤ، خودایانێك کە لاوازی و کەمایەسییە مرۆیەکانیان ڕاشکاو و هەندێك جاریش جێی ڕەخنەی دادوەرانەیە. بە تایبەت (ئارس) کە خودای جەنگە و لە گیرۆدەیی ڕزگاری نابێت. گرنگی ئەم مەسەلەیە لەوەدایە کە لە (ئیلیاد و ئودیسە)دا بە هەستێکەوە لەگەڵ بێگانەکان هەڵسوکەوت دەکرێت کە هاوشێوەی هەڵسوکەوتی بێ جیاوازی نێوان خودی یۆنانیەکانە. واتە لەگەڵ (ئاخاییەکاندا).

پاشان ئەم بابەتە هەڵسەنگێنەر و ڕۆشنگەرە، خۆی لە بەرهەمگەلێکدا دەبینێتەوە کە لە ژێر کاریگەری جەنگی ئازادیخوازانەی یۆنانیەکان دژ بە هێرشی ئێرانیەکان نووسراوەو لە پلەی یەکەمیشدا ستایشی بیرۆکەی ئازادی دەکات. بە تایبەت لە بەرهەمی (ئایشیلوس و هێرودۆت)دا. ئا لێرەدا، مەسەلە لەسەر ئازادی نەتەوەیەك نییە، بەڵکو لەسەر ئازادی مرۆڤە. پتر لە هەر شتێك ئازادی ئەو ئەسینا دیموکراتانەی کە کەوتونەتە ژێر ڕکێفی ژێردەستانی شای گەورەی ئێران. ئازادییەك کە بە مانای ئایدۆلۆژیا نیە، بەڵکو بە واتای شێوازێك لە ژیانە کە ژیان مانادار و گرانبەهاتر دەکات. ئەم چەشنە ئازادییە لای (ئایشیلوس و هێرودۆت) بەدی دەکرێت. ئەم دوو کەسایەتییە وەك دوو شایەتی پێکدادانی کولتوورەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات شتیان دەنووسی، کاریگەری ڕۆشنگەرانەی ئەو پێکدادانە و چۆنیەتی فۆرمگرتنی دادوەرییەکی ئاگاهانەو ڕەخنەگرانەیان دەخستە ڕوو، باسی کولتووری ڕەخنە لە خۆگرتنیان دەکرد کە چۆن بۆتە هۆی پێکهاتنی دادوەرییەکی ئەقڵی و هەڵسەنگێنەرانە لە مەڕ مەسەلە ئەفسوناویەکان. ئەم مەسەلەیە لە (یۆنیای) ئاسیای بچوکدا هەڵسەنگێنەرانە جیهانناسی لێدەکەوێتەوە و وەك بیرۆکەگەلێکی هەڵسەنگێنەر سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهاتەی جیهان و زانستە سروشتیەکان سەرهەڵدەدات. دەتوانین بڵێین زانستە سروشتیەکان لە ئاکامی کارتێکەری هەڵوێستەیەکی ئەقڵی و هەڵسەنگێندراو لە مەڕ ڕاڤەکردنی ئەفسوناوی سروشت، هاتۆتە گۆڕێ. کاتێك باس لە هەڵسەنگاندنی ئەقڵی دەکەم مەبەستم ئەو هەڵسەنگاندنەیە کە هەقیقەت دەبینێت: ئەم پرسیارە کە "ئایا هەقیقەتی هەیە؟" یاخود "ئایا دەتوانێت هەقیقەت بێت؟".

یۆنانیەکان بە پرسیارکردن دەربارەی هەقیقەت و لێکدانەوەی ئەفسوناوی دیاردە سروشتیەکان، بیرۆکەگەلێکیان خولقاند کە بوون بە هۆی لەدایکبوونی زانستە سروشتیەکان. ئەوان هەروەها بە پرسیارکردن دەربارەی هەقیقەت و گێڕاندنەوەی چیرۆکە خەیاڵی و سیحراوییەکانی ڕابردوو، دەسپێکی زانستی مێژوویان خوڵقاند.

هێرودۆت کە بە حەق نازناوی باوکی مێژووی پێبەخشراوە، شتێك زیاتر لە پێشەنگی زانستی مێژوو بوو. ئەو داهێنەری ڕاستەقینەی تایبەتمەندی ڕۆشنگەرانەو هەڵسەنگێنەرانەی پێکدادانی کولتوورەکان بوو. بە تایبەت کولتوورەکانی: یۆنانی، میسری، پارسی و مادەکان.

پێم خۆشە چیرۆکێك لە بەرهەمەکانی هێردۆت بگێرمەوە کە لە ڕاستیدا چیرۆکی

پێکـدادانی جـەنگ و کولتـووری یۆنانیەکانـە، لەگەڵ دانیشتوانی رۆژهەڵاتی نزیك و بەتایبەتی لەگـەڵ ئێرانیەکانـدا. لـەم چیرۆکەدا، هێـرودۆت ئاماژە بە نمونەیـەکی توندڕەوانە و تا ڕادەیـەك ترسنۆکانە دەکات. نمونەی پێویستی فێربوونی هەندێك شت لەلایەن مرۆڤەوە. ئەو شتانەی کە دەتـوانن لـە داهـاتوودا پرسـیار خـولقێن بـن. پرسـیارگەلێك کـە پاشـان دەردەکـەوێت چـەندە سـاناو ئاسـان بـوون. هێـرودۆت دەنووسـێت (3.ل 38): جارێـك داریـۆش لـە سـەردەمی دەسەڵاتدارێتیدا، قاوی یۆنانیـەکانی لای خـۆی دەکات و لێیان دەپرسێت: بە چ نرخێك ئامادەی خـواردنی گۆشـتی باوکـەکانتانن لـە دوای مردنیانـدا؟ یۆنانیـەکان لـە وەڵامـی داریوشـدا دەڵـێن: هـیچ شـتێك ناتوانێـت ناچـار بـە ئەنجامدانی ئەم کارەمان بکات. پاشان داریـۆش (کالاتییـە) هیندیـەکان، کـە دوای مردنـی باوکـەکانیان گۆشـتەکانیان دەخـواردن، بـانگ دەکـات و لەبـەردەم یۆنانیـەکان کـە وەرگێڕێکیـشیان پێـدابوون دەپرسـێت: بـە چـی نرخێـك ئامـادەی سـوتاندنی باوکـەکانتانن لـە دوای مردنیانـدا؟ ئـەوان بـە حەپەسـاوی و بـە دەنگێکی بەرز قیژاندیان و داوایان لە داریوش کـرد کـە تەنانـەت شـتێکی نـاپیرۆزی وەهـا بـە زاریدا نەهێنێت؟ بەڵێ، جیهان بەم جۆرەیە.

هێرودۆت ئەم چیرۆکەی تەنیا بەو مەبەستە نەگێڕاوەتـەوە کە یۆنانیـەکانی سـەردەمی خـۆی فێـری ڕێزلێنـان لـە نـەریتی بێگانـەکان بکـات، بەڵکو مەبەستی هێرودۆت لەم نمونەیە ئەوەیە کە یۆنانیەکانی لە بەرانبەر شتگەلێك کە ئاشکرا دێنـە بەرچـاو، هەڵـسەنگێنەر و ڕەخنـەگر ڕابهێنێـت. ئاشـکرایە خـودی هێـرودۆت لـە پێکدادانی ئەم کولتوورانە، فێری زۆر شت ببو کە دەیویست خوێنەرانیشی لێ بێبەش نەکات.

لێکـچون و نـاکۆکی نـەریت و چـیرۆکە ئەفـسوناویە باسـکراوەکان، هێرودۆتـی سەرسامو سەرمەست دەکرد. من پێموایە ئەم ناکۆکیانـە بـوون هـۆی لـەدایکبوونی بابـەتی هەڵـسەنگێنەرو ئـەقلانی کـە بـۆ ئـەوەی هێـرۆدۆتو ئـەوەی پـاش ئـەویش، بابەخێکی چارەنووسسازانەی لێکەوتۆتەوە کە سـەرئەنجام کولتـووری ئـەوروپایی و زۆر شـتی دیکەشـی خـستە ژێـر کاریگـەری چارەنووسسازانەی خۆیەوە.

هەمیـشە لـە بـەریتانیا و ئـەمریکا ئـەم پرسیارەم لێدەکرێت کە پاشخانی کولتووری و تایبەتمەندی داهێنەرانـەی نەمسا، بـە تایبـەتی ڤیەنا چۆن وەسف دەکرێت؟ ئاسۆی بێ هاوتای سەمفۆنیاسازانی مەزنی نەمسا، بینای ڕازاوەو سەرسوڕهێنەر، و دەستکەوتە مەزنەکانی نەمسا لـە گۆڕەپـانی زانـست و فەلـسەفەی سروشـتی پیـشاندەری ڕاسـتەقینەی تایبەتمەندییـە کولتووریەکانی وڵاتی نەمسایە.

(لـودیگ بولتـسمن و ئێرنێـست مـاخ) نـەك تـەنیا فیزیـازانی گـەورە، بـەڵکو فەیلەسـوفانی سروشـتی دەورانـسازیش بـوون. ئـەوان بوونـە پێـشەنگی ئەڵقـەی ڤیـەنا. هـەروەها فەیلەسـوفی کۆمەڵایەتی (یوزف پوپر لونکویس) لێرە ژیاوە کـە ڕەنگـە بتـوانین وەك بنیاتنـەری فەلـسەفەی دەوڵـەتی مـۆدێرنی خۆشـگوزەرانی پێناسـەی بکـەین. بـەڵام ئێـرە تـەنیا لـە ڕوانگـەی کۆمەڵایەتیانـەوە نەبۆتـە فەلـسەفە، بـەڵکو ئـەم

مەسەلە لە سەردەمی پاشایەتیشدا لە ئارادا هەبووە و دەسکەوت و بەرهەمی گەورەشی لێبۆتەوە. قوتابخانەی باڵاو کەم وێنە بۆ پەروەردە و فێرکردنی گەورە ساڵان دروستکرابوو، ئەنجومەنی "قوتابخانەی ئازاد" ی هەبوو کە پاشان بوو بە گرنگترین سەرچاوە بۆ بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوازانی پەروەردەیی. هەروەها ڕێکخراوی یارمەتیدەری کۆمەڵایەتی وەک "پاراستنی منداڵان"، "کۆمەڵەی رزگاری"، "ئامادەگی" و "پەنابەری بۆ عەوداڵ و دەربەدەرەکان" و هتد لەو سەردەمەدا هەبوون.

بە راستی ناتوانین هەموو ئەو چالاکیە کولتووری و کۆمەڵایەتیانە شرۆڤە و شیبکەینەوە. بەڵام من لێرەوە پێم خۆشە وەک تاقیکاری گریمانەیەک پێشنیاز بکەم. ڕەنگە ئەو هەنبانە کولتوورییەی نەمسا لەگەڵ بابەتی وتارەکەی من، واتە پێکدادانی کولتوورەکان پەیوەندییان پێکەوە هەبێت. نەمسای کۆن وێنایەک لە ئەوروپا بوو: کەمینەی زمانی و کولتووری زۆری هەبوو. زۆرێک لەو مرۆڤانەی کە ژیانی شارنشینی بۆیان دژوار بوو، هاتبوون بۆ ڤیەنا. شوێنێک کە تا ڕادەیەک فێربوونی زمانی ئەڵمانیا پێویست بوو. کولتووری گەورەی نەمسا کاریگەری لەسەر زۆر کەس دانابوو، هەندێکیش توانیان لە دەوڵەمەندکردنی کولتووری نەمسادا پشکداری بکەن. ئێمە تا ئاستێك ئاگادارین کە "هایدن و موتزارت" کارتێکەری مامۆستایانی ئاڵمانی و فەرەنسی و ئیتالیایان لەسەر بووە. هەروەها کاریگەری مۆسیقای فۆلکلۆری و مەجەری و تەنانەت تورکیش.

گلوك، هایدن و موتزارت سەفەری ڤیەنایان کردبوو. هەروەها (بتهۆڤن)، (برامس)، (بارکنێر)و (مالر) لە دەرەوە هاتبوون بۆ ڤیەنا. هەڵکەوتوویی و بلیمەتی ئەم مۆسیقارانە بەیان ناکرێت. بە تایبەت بتهۆڤن کە وەک (سکڵی خودایی لە شوبرێت)، واتا گەورەترین مۆسیقاری لەدایکبووی ڤیەنا ناسرابوو.

کاتێك بیر لە مۆسیقای ڤیەنا دەکەمەوە، هەست دەکەم دەتوانرێت ڤیەنای هایدن و بارکنێر، لەگەڵ ئەسینای "پریکسلێ"دا بەراورد بکرێت. ڕەنگە ڕەوش و بارودۆخی ئەم دوو شارە زۆر شێوازی یەکیان دابێت، شێواز یاخود لێکچوونێك کە دوای ماوەیەك خەڵك پێی قبووڵ دەکرێت. بە ڕای من هەردوو شارەکە لە بارودۆخێکی هەستیاری نێوان ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا، بە هۆی پێکدادانی کولتوورەکانەوە تا پلەیەکی بەرز هەڵکشان و دەوڵەمەند بوون.

**سەرچاوە:**

www.2.dw-world.de/persian

# پارته سیاسییەکانو گروپەکانی فشار

عبدالرحمن عالم

لە فارسیەوە: حەسەن حسین

دیموکراسیزمی نوێنەرایەتی، کە سەردەمی ئێمەی پێ دەناسرێتەوە، بۆ ئەوەی بەدی بێتو بچەسپێت پێویستی بەوە هەیە کەسانی هاوبیروڕا هەبنو پێکەوە کاربکەن، بەبێ ئەمە بەدیهێنانی ئەم جۆرە دیموکراسیزمە دژوارییەکی زۆری دێتە بەردەم. ئەگەر نوێنەرانی خەڵك لە پارتە سیاسییەکاندا ڕێکخراو نەبن، ئەوا پەرلەمان (ئەنجومەنی یاسادانان) لە کەسانێك پێکدێت کە نەتوانن بەڕێکوپێکیو بەشێوەیەکی گونجاو کارەکانیان ئەنجام بدەن. لە ڕاستیدا وێناکردنی سیستمی دیموکراسیزمی نوێنەرایەتی بەبێ بوونی پارتە سیاسییەکان دژوارە.

### 1/ پێناسەو ناوەڕۆکی پارتە سیاسییەکان

بەپێی تێگەیشتنی باو، حزب کۆبوونەوەی کەسانێکە کە بۆچوونی هاوبەشیان سەبارەت بە پرسگەلێك هەیەو بۆ گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەکانیان دەیانەوێت پێکەوە کار بکەن. (ئێدموند بێرك) وا پێناسەی پارت دەکات ( دەستەیەك خەڵکی یەکگرتوون کە لەسەر چەند پرسێکی سیاسی ڕێککەوتوونو لەپێناوبەرەوپێش بردنی بەرژەوەندییەکانی گەلدا هەوڵی هاوبەش دەدەن ) ، بەبڕوای (گیتڵ) ( پارتی سیاسی تاقمێك خەڵکی



شارنشینی کەم تا زۆر ڕێکخراون، وەك یەکەیەکی سیاسی کاردەکەن‌و، بەسود وەرگرتن لە مافی دەنگدان هەوڵی بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات‌و پیادەکردنی سیاسەتە گشتییەکانی خۆیان دەدەن).

(جیل کریست)یش پێیوایە کە پارتی سیاسی (گروپێکی ڕێکخراون‌و بۆچوونی سیاسی هاوبەشیان هەیەو هەوڵ دەدەن وەك یەکەیەکی سیاسی کار بکەن‌و، دەسەڵات بگرنە دەست. برەودان بەسیاسەت‌و بیروڕا بەشێوازی سیاسیانە ئامانجی پارتی سیاسییە). بەپێی بۆچوونی (لیکۆك)یش پارتی سیاسی( گروپێکی شارنشینن کە تاڕادەیەك ڕێکخراون‌و، پێکەوە وەك یەکەیەکی سیاسی کاردەکەن‌و سەبارەت بەپرسە گشتیەکان ڕوانینێکی هاوبەشیان هەیە بەسود بینین لە ئازادی بڕیاردان‌و لە چوارچێوەی ئامانجێکی هاوبەشدا هەوڵدەدەن دەسەڵات بگرنە دەست). (ماك ئێڤەر) لە ناساندنی پارتی سیاسیدا ئاوا دەڵێت: (گردبوونەوەیەکی ڕێکخراوە کە بە ڕێگای یاسایی‌و لە پێناو بەرگریکردن لە بنەماگەلێك یا کۆمەڵە سیاسەتێك، هەوڵی گەیشتنە دەسەڵات دەدەن).

لەنێو ئەو جیاوازیانەی کە لەنێوان گروپە دەسەڵاتگەراکان‌و پارتە سیاسییەکاندا هەیە(ماکس وێبەر) پێی وابوو چوونە نێو گروپە دەسەڵاتگەراکان سوك‌و ئاسان نییە بە پێچەوانەوە پارتە سیاسییەکان دەرگایان والایە بۆ هەر کەسێك کە خوازیاری ئەندامێتی بێت، واتە پارتەکان کراوەن) (ڕۆبەرت میشلز) ئەوەی وەبیر هێناوەتەوە کە (ڕێکخراوێکی سیاسی نوێنەرایەتی دەسەڵاتی ئۆلیگارشی دەکات بەسەر ستراکتۆری دیموکراسییەوە، لە دیموکراسیدا دەنگدەران‌و هەڵبژێردراوان دەبینین، هەروەك چۆن دەسەڵاتی تا ڕادەیەك بێ سنوری ڕابەرانی هەڵبژێردراو بەسەر سەری دەنگدەرانەوە دەبینین)،(میشلز بڕوای وا بوو کە لەنێو پارتە سۆسیال دیموکراتەکانیشدا ئەنگیزەی ئۆلیگارشیانە ئامادەیی هەیە، هەر ئەمەشە وای کردووە پێگەی سەرکردایەتی بەرامبەر بە بنکە بەهێزتر بێت، پاساوی ئەنگیزەی ئۆلیگارشیانەیش تەکنیکی (بەواتای ئۆلیگارشیزم پێویستیەکی ڕێکخراوەییە)و دەروونیە (وەکو هاوپشتی‌و وەفاداری چینی کرێکار).

بەپێی بۆچوونی (جوزیف شۆمبیتر) سەرەکیترین‌و گرنگترین ئامانجی هەر پارتێکی سیاسی هەژمونگەرییە بەسەر ئەوانی دیکەدا (جا تاك بێت یان پارتەکان) تا بگەنە دەسەڵات یان تێیدا بمێننەوە. لێرەوە دەتوانین ئاوا پێکهاتەکانی پارتە سیاسییەکان دیاری بکەین:-

1- بوونی هاوڕاییەکی دیاریکراو لەنێوان دامەزرێنەرانی پارتی سیاسیدا سەبارەت بە پرەنسیپەکان (بنەما ستراکتۆریەکان ).

2- ڕێکخستنی ئەندامان لە ڕێکخراوێکی تۆکمەی تەواو هاوئاهەنگ.

3- خەبات کردن لەچوارچێوەی دەستوردا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان.

4- هەوڵدان بۆ بەرفراوانکردنەوەی بەرژەوەندییە گشتییەکان‌و وەلانانی بەرژەوەندی بەرتەسك‌و ناوچەیی‌و، خەباتکردن

بۆچوونە سەر دەسەڵات لەپێناو دابینکردنی بەرژەوەندییە سەرتاسەرییەکاندا.

5- بوونی سەرکردایەتییەکی سالارو ئۆلیگارشی لەنێو حزبدا، ئەوەش کە پارتەکان هەوڵ دەدەن سەرکردایەتییەکانیان دەسەڵاتی سیاسی بگرنە دەست لەگەڵ پەیڕەوی نێوخۆی حزبدا ناکۆك نییە.

هەندێك لە توێژەرەوەکان چەند مەرجێك بۆ دامەزراندنی پارت بەپێویست دەزانن، لەوانە جۆزیف لاپالۆمبارو مایرۆن وینەر باس لە چوار مەرج دەکەن بۆ پێکهێنانی پارت:

1- بوونی ڕێکخستنێکی ناوەندی پایەدار.
2- لێکهەڵپێکانی پەیوەندی ناوەندی بە کۆمیتەو لقەکان (ڕێکخستن)ەوە.
3- پشتگیری خەڵکی.
4- خەباتکردن بۆ گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی.

بەووتەی (بۆڵ) خاڵی دوواییان (بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی) خاڵێکی جیاکەرەوەی پارتە سیاسییەکان و گروپەکانی فشارە (هەرچەندە ئەم جیاکارییەش لە پەیوەندی بەگروپەکانی فشارەوە ڕوون نییە).

کەوایە دەتوانین بەپێی ئەم پێکهاتەو مەرجانە ئاوا پێناسەی پارتی سیاسی بکەین:-

کۆبوونەوەی پایەداری گروپێکە کە بیروباوەڕی هاوبەش و ڕێکخستنێکی ڕێكوپێکیان هەیەو، بەپێی یاساو بەپشتیوانی خەڵکی خەبات بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن.

**أ - پێگەی دامەزراندنی پارتە سیاسییەکان**

هەرچەندە پارتە سیاسییەکان،کە پێچکەی دیموکراسین و، ڕیشەیەکی دێرینتریان لە دیموکراسیزمی مۆدێرن هەیە، بەڵام گەشەکردنیان لەگەڵ پێگەیشتنی دیموکراسیدا بووە. هەر لەبارەی دێرینیی پارتە سیاسییەکانەوە دەتوانین سەردەمی ڕۆمەکان بەنمونە وەربگرین کە بەسەر پاتریسیەکان (*Patrician*) (نازناوی لایەنگران و ڕاوێژکارانی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم وخاوەن سامانەکان بوو)و پیلەبینەکان (*Pleb1ian*) (خەڵکانی بێ موڵك و ماڵ کە هیچ مافێکی مەدەنیان نەبوو) دابەش بوو بوون.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەرچەندە گیلفیەکان (لایەنگری پاپا بوون)و گیبلێنەکان (لایەنگرانی ئیمپراتۆری ئەڵمانی) کۆمەڵگەی ئاڵمانیان کردبووە دوو بەشەوە، بەڵام خۆی ئەم دوو گروپە بەشێوەیەك لەشێوەکان پابەندبوون بەکاری دەزگا حکومیەکانەوە، ئەو دەمە ئەمانە زیاتر دەستەو تاقم بوون، وەك ئەوەی بەمانا باوەکەی کە حزب بن. بەڵام سیستمی حزبیی تازەو حکومەتی نوێی حزبی لە ڕووی تەکنیکییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی بەریتانیا لە سیاسەتدا. دەستپێکی سیستمی حزبایەتی لەڕووی مێژووییەوە پەیوەندییەکی تێکچڕژاوی لەگەڵ سەرهەڵدانی دەستور (بزوتنەوەی دەستوری) لە ئینگلیستاندا هەبوو، لەم ڕووەوە ئەزموونی حزبایەتی لە بەریتانیا پێشڕەوی ئەزموونی پارتە سیاسییەکانە لەجیهاندا. بەپێی چەند توێژەرێك بیوریتانیەکان، لە سەردەمی شاژنە ئەلیزابێسدا، وەك گروپێکی

سیاسی پێڕەوکار لە سیاسەتێکی ئایینزایی تایبەت، پارتێکی سیاسیان پێکهێنابوو، بەڵام دەرکەوتنی هێڵە دیارەکانی پارتی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ستیوارتەکان، ئەو کاتەی کە شا لەگەڵ پەرلەماندا لە ڕووبەڕووبوونەوەدا بوون. ڕابەرانی کڵێساو دەوڵەت لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا دژی زۆرداریی حکومەت بوون، هەرچی ئەریستۆکراسەکانیشە (نەجیبزادە) لایەنگری حکومەت و پاشایەتی زۆردارو سەرەڕۆ بوون و هەر زوو گروپەکانی شەڕی ناوخۆیان پێکەوەنا. دوای گێڕانەوەی (چارڵزی دووەم) ئەم گروپانە بە ناوی (ویگ) ەکان و(توری)ەکانەوە ناسران. ویگەکان خوازیاری پادشایەتیەکی دەستووری پابەندی پەرلەمان بوون و توریەکانیش لایەنگری پادشایەتیەکی ڕەها بوون و هیچ ئاڵوگۆڕێکیان لە بوونیادو تایبەتمەندییەکانی حکومەتدا پەسەند نەدەکرد. لەگەڵ هاتنی زنجیرە پادشایەتی (هانۆڤەر) ویگەکان لە دژایەتیکردنی پادشایەتیەوە بوونە لایەنگری پادشای نوێ و، بەپێچەوانەیشەوە توریەکان دژایەتیان دەکرد. بەڵام لەسەردەمی جۆرجی سێیەمەوە پارتەکانی لیبراڵ و پارێزگاران سەریان هەڵدا. لیبراڵەکان پشتیوانیان لە چاکسازی و پێشکەوتن و فراوان بوونەوەی ماف دەنگدان دەکردو خوازیاری یاساکانی چاککردنی ژیانی کرێکاران و هەڵگرتنی کۆسپ و تەگەرەکانی مەزهەب بەسەر پیشەسازی و بازرگانییەوە بوون. هەرچی پارێزگارەکانیشە لایەنگرییان لە سیستەم و ئارامی و سیاسەتێکی دەرەکی داڕێژراو دەکردو، پشتگیری سەرمایەدارانیان دەکردو، پێگەو ڕێزێکی تایبەتیشیان بۆ پادشا دادەناو، بەرگرییان لە خاوەن پلەوپایەو بەرژەوەندییەکان دەکردو لە دژی تازەگەرییە مەترسیدارەکان بوون. لەسەرەتای سەدەی بیستدا لیبراڵەکان بەهۆی سەرهەڵدانی پارتێکی دیکەوە کە هەڵگری تێڕوانینێکی سۆسیالیستی بوو کەوتنە دوواوە. لەوە بەدواو تا ئێستایش لە بەریتانیا بەفیعلی هەر دوو پارتی کرێکاران و پارێزگاران بۆ بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان ململانێ دەکەن. لە ئەمریکا هەرچەندە لە دوای داڕشتنی دەستورەوە پارتە سیاسییەکان سەریان هەڵدا، بەڵام خودی داڕێژەرانی دەستور لەگەڵ ناوەڕۆکی پارتە سیاسییەکاندا ناکۆك بوون، جۆرج واشنتۆن باسی لە دەرەنجامە خراپەکانی زاڵ بوونی گیانی حزبایەتی بەسەر کاروباری حکومەتی دیموکراسیدا کردووە. ڕابەرانی دیکەی ئەمریکا پارتە سیاسییەکانیان بەسەرچاوەی گشتی پەرێشانی و لاوازی سیاسی – کۆمەڵایەتی دەزانی، بۆیە سیستەمی حزبی لە ئەمریکا بە شێوەیەکی ناڕەسمی گەشەی کرد. ئێستایش هەردوو حزبی سەرەکی ئەم وڵاتە دیموکراتی و کۆماری، جیاوازیەکی بنەڕەتییان نیە.

لە پاش ڕووخانی ڕوسیای قەیسەری و سەرهەڵدانی یەکێتی سۆڤیەت، سیستمی تاك حزبی لەم وڵاتەدا هاتە ئاراوەو، بەمەیش سۆڤیەت بوو بە یەکەمین وڵات کە بەپێی دەستور سیستمی تاك حزبی چەسپاندو مۆڵەتی کارکردنی پارتەکانی دیکەی نەدەداو پارتی کۆمۆنیست تاکە پارتێك بووکە ماف

هەبوو ئیدارەی سیاسی وڵات بەڕێوەبەرێت و، چارەنووسەکەی دیاری بکات. ئەم سسیستمە تاك حزبیە هەتا ماوەیەکی کەم بەر لەڕوخانی سۆڤیەت بەردەوام بوو.

لە فەرەنسادا سیستمی فرەحزبی (پلورالی) هەر لە سەرەتای جێگیر بوونی دیموکراسیزمەوە چەسپا، بەڵام زۆرینەی پارتەکان لەسەر بنەمایەکی دیاریکراو دانەمەزرا بوون.

**ب - پایەکانی دروست بوونی پارتە سیاسیەکان**

پێنج پایەو بنەمای جیاواز بۆ دروست بوونی پارتە سیاسییەکان خراوەتە ڕوو:

**1-سروشتی مرۆڤ:**

ئەنگیزەی دروست بوونی پارتە سیاسییەکان پەیوەستە بە سروشتی مرۆڤەوە، بۆ نمونە هەندێك لە تاکەکان خۆیان لەبنەڕەتدا خۆپارێزن، بەڵام هەندێکی دیکەیان خوازیاری گۆڕانکارین لێرەوە کەسەکان بە پێی جیاوازیەکانیان پێکهاتەو مەزاجیان بەرەو لای ئەم یان ئەو حزب کەمەندکێش دەبن. پارێزگارەکان کۆدەبنەوەو پارتێك دادەمەزرێنن کە بیروبۆچوونی خۆپارێزی و ئۆرسەدۆکسی پەرەپێبدات، لایەنگرانی سیاسەتی گۆڕانی ڕیشەییش پارتی لیبراڵ یان سۆسیالیستی پێك دەهێنن.

**2-ناکۆکی بەرژەوەندیە ئابووریەکان**

ئەمەیان پایەی ڕاستەقینەی دروست بوونی پارتە سیاسییەکانە (ئارسەر هۆڵکالمبڵ) دەڵێت ( بەردەوام بوونی پارتە جەماوەریەکان بەپاڵنەرو ئامانجی تێپەڕو کاتیەوە شیاو نییە، بەڵکو دەبێت بەپێی بەرژەوەندی گشتی و لەوەیش گرنگتر لەسەر بەرژەوەندیە ئابوورییە هەمیشەییەکان ڕاوەستابن، حزب بە فیعلی نوێنەرایەتی چینە جۆراوجۆرەکان (جووتیاران، خاوەن موڵکەکان، کرێکار یان سەرمایەدار) دەکات بەواتایەکی دیکە درەنگ یان زوو چەوساوەو چەوسێنەران لەیەك جیادەبنەوەو لە ڕێگەی ڕێکخراوە سیاسییەکانیانەوە دەکەونە بەرامبەری یەکترەوە.

**3-ژینگە**

هۆکاری ژینگەیی و خێزانی کاریگەرییان لەسەر جموجووڵ و ئاڕاستەی تاك بۆ بوونە ئەندام لەم حزب یان ئەو حزب هەیە، ڕاستە کە گوتویانە، مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی سیاسەت و ئایینی بەمیرات بۆ دەمێنێتەوە. خێزان (دایك و باوك) ڕۆڵەکانی فێری ئایدۆلۆژیای پارتێکی دیاریکراو دەکات. بۆ نمونە لە ئەمریکا ئیرلەندییەکان بەشێوەیەکی باو لایەنگری لە پارتی دیموکرات دەکەن و، ئاڵمانەکانیش لە پارتی کۆماری. پشتیوانی کردنی باوك و کوڕ بۆ دوو پارتی جیاواز نمونەیەکی دەگمەنە، کە دەشێت ئەمە لەوڵاتانی دیکەدا باو نەبێت.

**4-هەستی نەژادی**

لەکەنەدا فەرەنسیەکان حزبێکیان هەیە و بەریتانییەکانیش حزبێك، پارتی ناسیونالیستی نەژادپەرست لە ئەفریقیای باشور، لە هۆڵەندییەکان پێکهاتبوون، لەکاتێکدا پارتی یەکگرتوو کە لیبراڵ بوون، بەگشتی لە بەریتانییەکان پێکهاتبوون. لێرەوە هەستی

نـەژادی کاریگـەری خـراپ لەسـەر سیاسـەتی حزبی دادەنێت.

5-**زەمینەی ئایینیو ئاینزایی**

لـەو وڵاتانـەی کـە دیموکراسـیزم تێیـدا لـە سـەرەتایدایە یـان بـە پێـچەوانەوە لـە پووکانەوەدایە، دەشێت ئاینو ئاینزایی ببێتە بنەمایەك بۆ دامەزراندنی پارتی سیاسی، وەك لـە وڵاتـانی دنیـای سـێ کـە پارتـەکان لەسـەر بنەمایـەکی ئـایینی تـەواو دادەمـەزرێنو بەپێچەوانەی وڵاتانی ئەوروپا کـە دامەزراندنی زۆربەی پارتـەکان دوورە لـە هۆکاری ئایینیەوە. پـارتی ئـاینی لـە وڵاتـانی فرەئـاینو مەزهەبـدا یـەکێتی نەتـەوەیی تـەفروتوونا دەکـاتو، دیموکراسیزمیش ڕیشەکێش دەکات.

لـەم سـەردەمەدا بەگشتی هۆکاری ئـابووری پایـەی پێکهێنـەری پارتـە سیاسـیەکانە، تەنانـەت ئەو پارتانـەیش کەلەسـەر بنەمایـەکی ئـاینزایی یاهاوشـێوەی ئـەو پێکهـاتوون، بـۆ ئەوەی درێژە بەمانەوەی خۆیان بدەن ناچارن کە بانگەشـە بـۆ بەرنامەیـەکی ئـابووری بکـەن، کـە ڕەنگـە زۆر لەگـەڵ بـاوەڕە ئایینیەکەیانـدا نەشگونجێت.

2/**تایبەتمەندیەکانی پارتە سیاسییەکان**

پارتـە سیاسـییەکان مـەرجێكو بگـرە بڕبـڕە پشتی سیستمی دیموکراسین. بە وتـەی (بۆڵ) یەکخـستن، ئاسـانکاری، ڕاگـرتنی ڕەوەنـدی سیاسـی گـرنگترین تایبەتمەنـدی پارتـە سیاسییەکانن کە بەدیهێنانیان بایەخێکی زۆری هەیـە، (مێریـام) پێـنج تایبەتمەنـدی دیاریکردووە:

1-دیـاریکردنی پاڵێوراوەکـانی بـۆ هەڵبژاردن.

2-ئامادەکردنی سیاسەتە گشتییەکان.

3-ڕەخنەگرتن لە حکومەت.

4-هۆشیاری سیاسی.

5-نێوانکاری نێوان تاكو حکومەت.

(مـۆنرۆ)یـش جگـە لـەو تایبەتمەندیانـە دوو تایبەتمەنـدی دی بـۆ زیـاد دەکـات کـە ئـەوانیش (بەردەوامیو پێکهێنانی بەرپرسیارێتی سیاسی بـە کۆمـەڵ)ن . دەتـوانین بۆچـوونی مـۆنرۆ بەکورتی لێرەدا ڕوون بکەینەوە:

1-**ململانێی هەڵبژاردن لەپێناوی بردنەوەدا**

پارتـە سیاسییەکان لـە پێنـاو بەشداریکردن لـە ململانێـی هەڵبژاردنـدا دادەمـەزرێن، سـەرەکیترین فەرمانیـشیان دیـاریکردنی ئـەو پاڵێوراوە گونجاوانەیە کـە لـە پشتیوانی حزبی بەهرەمەندنو، زۆرترین کورسـی لـە پەرلەمانـدا بـۆ حـزب دەبەنـەوە، لـەم ڕووەوە حـزب وەك بێـژنگێکی گـەورە ئەندامـە ڕکابـەرەکانی دەبێژێتـەوەو هـەڵیان دەبـژێرێتو، بەگـشتیش کۆمەکی ئەو پاڵێوراوانـەی دەکات کە دەرەتانی دابینکردنی بوودجەی هەڵبژاردنیان نییە .

2-**ئامادەکردنی سیاسەتە گشتییەکان:**

حـزب بەرنامـەو بانگـەواز بـۆ هەڵبـژاردن ئامادە دەکات بۆ ئەوەی دەنگدەران بە تـەواوی ئاگـاداری پرسـە بنەڕەتییـەکانو سیاسـەتو بەرنامـەکانی بـن. لـەم ڕووەوە پارتـەکان بـە وریایـەکی زۆرەوە سیاسـەتەکانی خۆیـان دادەڕێـژنو بڵاویـان دەکەنـەوە، جگـە لـەوەش پۆستەرو وێنەو لافیتە بڵاودەکرێنەوە. هەروەها

میدیاکان بانگهێشت دەکرێن تاچاوپێکەوتن و کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی لەتەك پاڵێوراوان و سەرکردەکانی حزبدا سازبکەن. لێرەوە پارتە جۆراوجۆرەکان سیاسەتەکانیان دەخەنە پێش چاوی دەنگدەران و ڕەخنە لە پارتە ڕکابەرەکانیان دەگرن یا وەڵامی ڕەخنەکانیان دەدەنەوە.

**3-ڕەخنەگرتن لە حکومەت و نیشاندانی هەڵوێست لە بەرانبەر سیاسەتەکانیدا:**

پارتی زۆرینە حکومەت پێك دەهێنێت و، کەمینەش دەبێتە ئۆپۆزسیۆن. کەمینە یا ئۆپۆزسیۆن ناهێڵێت زۆرینەی دەسەڵاتدار سنورە دیاریکراوەکان ببەزێنێت و، ناچاری دەکات لە دارشتنی یاسا و سپاردنی بۆدەنگدان لەپەرلەماندا زۆر وورد بێت، چونکە هەر بریارێك یان هەنگاوێکی ناشایستەی پارتی دەسەڵاتدار دەشێت پێگەی پارت لە ناو خەڵکیدا لاواز بکات و، دەرفەت بداتە پارتی ڕکابەر کە جێگەی بگرێتەوە. بۆیە حزبی دەسەڵاتدار پێویستە هەوڵ بدات لەم ئاکامە خۆی بپارێزێت.

ململانێی حزبی دەستەبەری کارابوونی ئیدارەی حکومەتە. پارتی ڕکابەر ڕاستەوخۆ ڕەخنە لەحکومەت ناگرێت، بەڵکو حکومەتی ئەڵتەرناتیڤ و بەرنامەی جێگرتنەوە ئامادە دەکات، ئەمەش لە ڕاستیدا وا لە پارتی ڕکابەر دەکات لەئاستی سیاسەتەکانی حکومەتدا وەك سەگی نهێنگر وابێت.

**4-حزب فێرگەیەکی سیاسییە بۆ خەڵك:**

پرۆسەی هەڵبژاردن و ململانێی لیستەکان، خەباتێکیشە بۆ فێرکردن و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی. لە ڕاستیدا خەڵك بەرامبەر بەکارو سیاسەتەکانی حکومەت هەستیارنین و بە بایەخەوە تێیناڕوانن. لێرەوە بایەخی حزبەکان دەردەکەوێت کە پێویست دەکات خەڵکی لە کەمتەرخەمی و گوێ پێ نەدان دەریانبهێنن و وە جوڵەیان بخەن.

حزب لە ڕێگەی چاپەمەنی و کۆڕو کۆبوونەوە و تێکەڵبوونی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خەڵکیدا، پشتیوانی خۆی بۆ کەسایەتییەکان یان سیاسەتەکان دەردەبڕێت و، ئەمەیش شێوازێکی فێرکاریی سیاسی دەنگدەران و هاولاتیانە، سەرباری ئەوەی کە هۆکارێکیشە بۆ ئەوەی حزب لایەنگران و ئەندامانی پێ زیاد بکات.

**5-پردی نێوان تاك و دەسەڵات:**

پارت ڕێکخەری پەیوەندییەکانی نێوان تاك و دەسەڵاتە، سەرکردایەتی پارت هەنگاوەکانی حکومەت بۆ خەڵك ڕوون دەکاتەوە و کاردانەوەی خەڵکیش دەگەیەنێتە دەسەڵات. واتە هێڵی بەیەکگەیاندنی ئەو دوو خاڵەیە بەیەکتر، یا قولاپێکە کە تاك بە دەسەڵاتەوە دەبەستێتەوە.

**6-ئاسانکاری بۆ حکومەت و پەرلەمان:**

ئەوەی کە سیستمی پارلەمانی سەرکەوتوانە کاردەکات دەگەڕێتەوە بۆ پشتیوانیکردنی زۆرینەی پارتی دەسەڵاتدار لە حکومەت، بەبێ ئەم پشتیوانییە حکومەت لەگەڵ لیستی پارلەمانتارە سەربەخۆو نارێکخراوەکاندا، کە هەر ئەمانیش دەتوانن پەرلەمان ئیفلیج بکەن، دووچاری ناکۆکی دێن و بەمەیش

حکومـەت بـەردەوام لـە ئـاڵوگۆڕدا دەبێـت و کارەکانی ڕایی نابن.

**7-حـزب چوارچـێوەیەکە بـۆ یەکخـستنی بیرکردنەوەی هاوبەش و کۆکردنەوەی هاوبیرەکان:**

پارتی سیاسی کارامەو چالاك ئەو پارتەیە کە ڕێکخـراوو بەدیسپلین بێـت و یەکپارچـەیی ڕێکخـستنەکانی بپارێزێـت و، ماڵێـك بێـت بـۆ لـەخۆگرتنی ئامـانج و بـیری هاوبـەش. لێـرەوە کـارکردن وەك خێزانێـك دەبێتـە بناغـەی ئەنجامدانی ئەرکە سیاسییەکان.

ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان لە دیموکراسیزمی هاوچـەرخدا بـەم تایبەتمەندێتیانەوەیـە. لـە ڕاسـتیدا دیموکراسـیزمی نوێنەرایـەتی بـەبێ بـوونی پارتـە سیاسـییەکان ئیمکـانی نیـە، دیموکراسـیزم بـەبێ حزب چەشنی بەلـەمێکی بێ چارۆکە یا کەشتییەکی بێ ناخودایە.

پەیوەندییـەکی تێکـچرژاویش لـە نێـوان پەیکـەری ڕێکخراوەیـی و ئـەو تایبەتمەنـدی و شـێوەکارانەی کـە پارتـەکان دەیگرنـە بـەر، بـۆ چوونە دەسەڵات یا پاراستنی دەسەڵاتەکەیاندا هەیە. ئەو پارتانەی کە بە ئاشکرا کار دەکەن و بەشـداری هەڵبـژاردن و سیـستمی پەرلـەمانی دەکـەن، پەیکـەرو بینایـەکی جیاوازیـان هەیـە، لەگەڵ ئەو پارتانەی کە بە هەر هۆیەکەوە بێت ناچارن بەنهێنی کاربکەن، یا چالاکی چریکی لە بنکـەو بارەگاکـانی دەرەوەی شـارەوە لـە دژی دەسـتەبژێری سیاسـی نـاو شـارو وڵات ئەنجام دەدەن.

ئـەو پارتـەی کـە خوازیـاری بەرفراوانبوونـەوەی مـەوداکانی دیموکراسـییە، وەکـو فراوانبوونـەوەی مـافی دەنگـدان، دەشـێت پەیکـەرێکی جیـاوازی هـەبێت لـە پارتێـك کـە خوازیـاری دەسـەڵاتێکی هەمیـشەییە بـۆ دەسـتەبژێری سیاسـی. (مـۆریس دۆڤێرجیـە) ڕیزبەندیـەکی چـوار پلـەیی لـە گـرنگترین شـێکردنەوەیدا لەسـەر پەیکـەری حزبـی خستووەتە ڕو. ئەگەرچی بەگشتی هۆکارەکان دەکەونە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیا، پێکهاتـەی حکومـەت، ئاسـتی گەشـەی کۆمەڵایـەتی – ئـابووری و کـەلتوری سیاسـی و ڕووداوە مێژووییەکانـەوە بـەڵام لـە خوێندنەوەیـەکی بنەڕەتی پەیکەری ڕێکخراوەیی پارتەکاندا ئەم هۆکارانە ئامادەییان هەیە:

1- ڕۆڵـی سـەرکردایەتی و شـێوەی هەڵبژاردنەکەی.

2- ئاستی سانترالیزمی ڕێکخراو.

3- توانـای پەیوەنـدی گـرتنی سـەرکردایەتی لەگـەڵ پلـە زنجیرەییـەکانی ڕێکخـستنداو، قورسـایی بڕیـارە دیـسپلینیەکان و چـۆنێتی بەشـداربوون لـە بڕیـاردان و داڕشـتنی سیاسەتەکان.

4- جڵەوکردنی بیرۆکراسی حزب.

5- پەیوەنـدی بـاڵی (فراکسیۆن) پەرلـەمانی حزب لەگەڵ حزبدا.

6- پێوەرو بنەماکانی ئەندامگیری.

**3/ لایەنە پۆزەتیف و نیگەتیفـەکانی سیـستمی حزبی:**

پێشتر باسمان لە گرنگی ڕۆڵی پارتـەکان لـە سەرخستنی دیموکراسیدا کرد. لێرەدا بەکورتی بـاس لـە لایەنـە بـاش و خراپـەکانی سیـستمی حزبی دەکەین. دەتوانین بڵێین لایەنە باشـەکانی

حزبایەتی ئەمانەن: حزبایەتی لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا کۆکەو ولات ڕزگاردەکاتو ڕێگەرە لەبەردەم هەڕەشەی داڕشتنی ڕاستەوخۆی یاسا. سەرخستنی دیموکراسی پێویستی بەبوونی پارتە سیاسییەکانە، چونکە زۆرداری( دیسپۆتیزم)ی حکومەت جڵەودەکاتو پێگەی دەسەلاتی یاسادانان(پەرلەمان) بەهێزدەکاتو دەزگا حکومیەکان لە نێو یەکدا هاوئاهەنگ دەکات ، و ڕەهەندی چینایەتی حکومەت دەگۆڕێت بە حکومەتێکی خاکی. لەڕووی دروستکردنی هوشیاریو فێرکارییەوە گرنگیەکی زۆری هەیەو برەو بە گیانی هەست بەلێپرسراوێتیو دیسپلین دەداتو بەڕێوەچونی هەڵبژاردنەکانیش ئاسان دەکات.

بێگومان لەهەمانکاتیشدا پەیرەویی حزبایەتی جێگەی ڕەخنەی توندیش بووەتەوە، وەکو ئەوەی: حزبایەتی دیاردەیەکی سیاسی ناسروشتیەو دەستەگەری دروست دەکاتو شوناسی مرۆڤ و ڕەهەندە تاکگەراییەکەی ورد دەکات. بەهۆی زاڵبوونی بیری تەسکی حزبایەتیەوە بەسەر ئەندامەکانیدا دڵسۆزیو چالاکی سودمەندانەی ئەندامانی پارتەکانی دیکە ناخوێنرێتەوە، ئەمەیش بەهۆی پەروەردەی سیاسی نادروستو برەودان بە شوێنکەوتنی کوێرانەوەیە. حزب بەرژەوەندی خۆی دەخاتە سەرو بەرژەوەندی گشتی(گەل)ەوەو پەرە بە ڕیاییو دووڕوویی دەداتو هەلپەرستەکان بۆ گەیشتن بەپلەو سامان بەکاری دەهێنن. ڕۆسۆ باوەڕی وابوو کە لە هەر ولاتێکدا چالاکی حزبیو ڕێکخراوەیی هەبێت خواستو ڕای گشتی بەمانا ڕاستەقینەکەی ناخرێتە ڕو، حزبایەتی سیستمی سیاسی دووچاری سەرگەردانی دەکاتو، حکومەت ناجێگیر دەکاتو، دەیخاتە دەستی کۆمیتەی حزبی یان تاقمە خەڵکێکی تایبەتەوە، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر ژیانی ناوخۆیی هەیە. پارت پرۆژەی خیانەتی کۆمەلایەتیەو لە ئاستی پێداویستییەکاندا لاوازە.

کەوایە خوێندنەوەی ئەو کەموکورتییە بەرچاوانەی کاری حزبی پێویستی بە تێڕامانە، سەرچاوەی زۆربەی ئەو کەموکورتیانە ماکی لاوازییەکانی مرۆڤە لە ئاکاری گشتیدا، (واتە لاوازیەکی ئاکاریە- وەرگێڕ-) وەك ئەوەی کە بەرپرسیارێتی دەدرێتە کەسانێکی تەوەزەل کە تەنها لە کاتی نزیك بوونەوەو دوورکەوتنەوەی هەڵبژاردنەکاندا جموجۆڵیان زیادو کەم دەکات. لە ڕاستیدا دامو دەزگاکان چەندە پێویستیان بە چاکسازی هەیە خەڵکیش ئەوەندەیان پێویستی پێیەتی. هەڵبەتە زۆربەی ئەو کەموکورییانەیش لەو ولاتانەدا دەردەکەون، کە هوشیاری سیاسی لە کۆمەڵدا کەمەو دیموکراسی لە سەرەتادایە، ئەوکاتەیش کە هۆشیاری سیاسی خەڵك گەشە دەکات ئیدی چەواشەکردن یاخود گێل کردنی جەماوەریش زەحمەت دەبێت، بێگومان ئەمەش زیان لەو حزبانە دەدات کە پەنا دەبەنەبەر دیماگۆگی (هەڵفریواندن)ی هاولاتیان. بەلام دەتوانرێت ئەم کەموکوڕییانەیش تاڕادەیەکی زۆر کەم بکرێتەوە، ئەویش بە ئەنجامدانی پەروەردەکردنێکی سیاسی تەندروستو، بەدیهێنانی ئالوگۆڕی پۆزەتیف لە بیرکردنەوەی

خەڵکیـــــدا، ئەمـــــەیش پێداویــــــستیەکی لێکدانەبڕاوی دیموکراسیزمە.

### 4 / سیستەمە حزبیەکان

پەیڕەویکردن لە سیستمی حزبی لە وڵاتانی جیهانــدا لــە وڵاتێکــەوە بــۆ وڵاتێکــی دیکــە دەگۆڕێـــت، وەك سیـــــستمی دووحزبـــی و فرەحزبی و تاك حزبی.

#### أ/ سیسستمی دووحزبی:

ئــەم سیــستمە لــە بــەریتانیا هاتــەئاراوە، ململانێــی نێــوان ســەرکردە ئەریــستۆکراسی و نەجیبزادەکان و پاشان ویگەکەکان و توریەکان و لیــبراڵ و پارێزگارەکــان و دواجــاریش پــارتی کرێکاران و پارێزگاران، بەڵگەی گەشەکردنی ئەم سیــستمەن لــە بــەریتانیادا. هەڵبەتــە سیــستمی دوو حزبی ئەوە ناگەیـەنێت کـە حزبـی دیکـە یـا بــەرەی دیکــە بوونیــان نــەبێت، بــۆ نمونــە لــە بەریتانیا هەتا ئێستایش لیبراڵەکان، هەرچەندە ئەو قورساییەشیان نییە، هەر ماون، وەك چۆن لـە ئـەمریکا جگـە لـە هـەردوو پـارتی سـەرەکی دیموکرات و کۆماری پارتی بچوکتریش هەن.

#### لایەنە باشەکانی سیستمی دووحزبی:

لــە سیــستمی دوو حزبیــدا حکومــەتێکی دیمـوکراتی بـە تێگەیـشتنە واقعیەکـەی دێتـە ئـاراوەو، پـارتی ئۆپۆزسیـۆنیش ڕۆڵـی ڕێکخـەر دەگێڕێت. کابینـەی حکومـەت جێگیرە، چونکە هــەموو وەزیرەکــان ســەر بــە پــارتی زۆرینــەن، جێگیربـــوونی حکومـــەتیش دەســـتەبەرکەری چوســت و چــالاکی ئیــداری و بــەردەوام بــوونی سیاسەتە لە وڵاتدا. (لاسکی) بە جوانی لایەنە چاکەکانی سیستمی دووحزبی پوختەکردووە( تەنها شێوەیەکە کە خەڵکی بەهۆیەوە دەتوانن لــە کــاتی هەڵبژاردنەکانــدا حکومــەتی خۆیــان هەڵبــژێرن، ئــەم حکومەتــە، لــەم سیــستمەدا دەتوانێــت سیاســەتەکانی لــە چوارچــێوەی یاســـادا پراکتیـــزە بکـــات و دروێنـــەی شکستەکانیشی بکات. لە سیستمی دووحزبیدا جێگرەوە( ئەڵتەرناتیڤ) یەکسەر ئامادەیە.

#### لاوازیەکانی سیستمی دووحزبی:

لــە سیــستمی دوو حزبیــدا دەســـەڵاتی یاســـادانان لـــە بەرامبـــەر دەســـەڵاتی جێبەجێکردنــدا هەیبــەتی کــەم دەبێتــەوەو، دابەشـــبوونی کۆمـــەڵگایش بـــۆ دوو حزبـــی ســـەرەکی دەبێتـــە هـــۆی ئـــەوەی کـــە بەرژەوەندیگـــــەلێك ببنـــــە قوربـــــانی بەرژەوەندییەکانی هەردوو حزب . لە سیستمی دوو حزبیــدا ئیختیــار (*choice*) ی دەنگــدەر لەنێوان دووحزبدا لەقاڵبدراوە. لە نێو ئەندامانی حزبدا بە هۆی بایەخدانی زیاد لە پێویست بە ســەرکردایەتی و بــرەودان بــە ستایــشکردنی ژێریـــی ســـەرکردەکانی حزبـــەوە نـــەریتی شـــوێنکەوتن و لـــەخۆبووردنی کوێرانـــەی ســەرکردایەتی و لەدەســتدانی ســەربەخۆیی و تاکگەراییانــەی ئەنــدامانی حــزب جێکەوتــە دەبێت.

#### ب/ سیستمی فرەحزبی ( پلورالیزم):

ئەم سیستمە لە وڵاتانی ئەوروپادا بەربڵاوە، ســەردەمانێك لــە فەرەنــسا ژمــارەی پارتــەکان

گەیشتبوونە 20 پارت، هەروەها لە ئەڵمانیا و ئیتالیا و سویسرایش فرەحزبی هەیە. لەم سیستمەدا هیچ پارتێك زۆرینەی ڕەهای دەنگەکان بەدەست ناهێنێت، لەبەرئەوە پێکهێنانی حکومەت (ئەنجومەنی وەزیران) بەدروستکردنی (هاوپەیمانێتی) ئیئتیلاف دەبێت، چەند پارتێك ڕێکدەکەون تا زۆرینەی پێویست بۆ پێکهێنانی حکومەت بەدەست بهێنن. بۆیە بەردەوامی و کارایی حکومەتیش بەهەڵوێست و بڕیاری حزب و گروپە پێکهێنەرەکانیەوە بەستراوەتەوە. مانەوەی پارتەکان لەئیئتیلافدا مانای درێژە کێشانی تەمەنی حکومەتە، ئەگەریش نا، ئەوا حکومەت هەڵدەوەشێتەوە و بەپێکهێنانی ئیئتیلافێکی دیکە حکومەتی نوێ پێکدەهێنرێت ، بۆیە دەبینین لەم جۆرە حکومەتانەدا هەموو وەزیرێك خۆی بە سەرۆك وەزیران دەزانێت.

**لایەنە باشەکانی سیستمی فرە حزبی:**

هەرچەندە مۆدیلی فرەحزبی بەشێوەیەکی گشتی کەمبووەتەوە و بایەخێکی وای نەماوە، بەڵام چەند لایەنێکی باشیشی تێدایە، ئەوەی سەرنج ڕاکێشە لایەنە خراپەکانی سیستمی دووحزبی دەبێتە لایەنە باشەکانی مۆدیلی فرەحزبی. لە مۆدیلی فرەحزبییدا بازنەی هەڵبژاردنەکان فراوانە، حزبەکان هەریەکە و نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی دەکەن. ئەمەیش مانای وایە بەرژەوەندی گروپ و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانیش بەشێوەیەکی باشتر دەستەبەر دەبێت. جگە لەوەی کە تاکەکان دەتوانن لایەنگری لەو پارتە بکەن کە لە بۆچوونەکانیانەوە نزیکە، ئەمەیش مانای وایە تاك شوناسی خۆی دەپارێزێ. دواجار حکومەتی ئیئتیلاف، لە مۆدیلی فرەحزبیدا ، ناتوانێت دەسەڵاتی تاکڕەوانەی خۆی بەسەر دەسەڵاتی یاساداناندا تێپەڕێنێت.

**خراپیەکانی فرەحزبی:**

بەدەست نەهێنانی زۆرینەی ڕەهای دەنگەکان لە سیستمی فرەحزبیدا ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئۆپۆزسیۆنێکی ڕێکخراو و تەندروستیش، کە مەرجی دیموکراسیزمی پەرلەمانیە، نەیەتە ئاراو گەشە نەکات. پەرلەمان لە مۆدیلی فرەحزبیدا دەبێتە مەیدانی دەستەگەرێتی و پیلانگێڕی فراکسیۆنەکان. لە ڕاستیدا قەیران و لەرزۆکی حکومەت لەگەڵ مۆدیلی فرەحزبی دەستەخوشکی یەکترن. حکومەت دەکەوێتە دەستی کۆمەڵێك هەلپەرستەوە کە بەتەنها هەڵپەی دەسەڵاتیانەو بەرژەوەندی هاوبەش کۆیان ناکاتەوە، بەمەیش کارو چالاکییەکانی حکومەت توشی شۆك و ڕاوەستان دەبێت. دواجار بەهۆی ئەو ئاڵۆزیانەی کە لە هەناوی فرەحزبیدایە هاوڵاتیش پەی بە پرس و بەرژەوەندییەکانی نابات.

**پ/ سیستمی تاك حزبی**

ئەم سیستمە پەیوەستە بەو وڵاتانەوە کە هەڵگری ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیستین، یەکێتی سۆڤیەت لە ژێر دەسەڵاتی حزبی کۆمۆنیستدا یەکەمین وڵات بوو کە مۆدیلی تاکحزبی

دامەزراند. شەڕی ناوخۆو دەستێوەردانی دەرەکی بوارێکی بۆ هاوکاریکردنی پارتی کۆمۆنیستو پارتەکانی دیکە نەهێشتەوە، پارتی کۆمۆنیست بووە پێشڕەوی کرێکارانو زەحمەتکێشانو ناوکۆکەیەکیش بۆ ڕێنوێنی کردنی هەموو ڕێکخراوەکان لە ناو وڵاتدا. لێرەوە ئاشتەوایی و ڕێککەوتنی بەرژەوەندییەکانی جەماوەری زەحمەتکێش لە سۆڤیەتدا ڕاگەیەنرا، گوایە چیدی ئەم بەرژەوندییانە ئاشتی هەڵنەگر نین. پێشکەوتنو دەستکەوتە ئابووریەکانی وڵاتیش کرایە شانازیەكو بەباڵای دەسەڵاتو چاودێری حزبی کۆمۆنیستدا بڕا، ئەمەیش لە لینینەوە داکەوت، ئەو یەکەمین سەرکردەی وڵات بوو کە ڕێی خۆشکرد بۆ سیستمی تاك حزبی. پاشان ستالین هات، کە لە سەردەمی ئەودا ڕابوونێك لە پرسی دەستورو یاساییبووندا هاتە گۆڕێ. ستالین گووتی (ئەبێت سەرکردایەتی دەوڵەتو دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بەدەست حزبی کۆمۆنیستەوە بێتو نابێتو ناکرێت شەریکی دیکەی هەبێت). جگە لە سۆڤیەت، چینو یۆگۆسلاڤیا و چیکوسلۆڤاکیا و پۆلۆنیا و ڕۆمانیا و بولگاریا و هەنگاریا و چەند وڵاتێکی سۆسالیستی دیکە پەیڕەوییان لە سیستمی تاك حزبی یان بەرەیەك بەسەکردایەتی پارتی کۆمۆنیست کرد. پاش یەکەمین جەنگی جیهانی تورکیا و ئەڵمانیا و ئیتالیا و ئیسپانیا و پورتوگالو چەند وڵاتێکی دیکەیش مۆدیلی تاکحزبیان پیادەکرد. لە ئەڵمانیا پارتی نازی، ناسیونال- سۆسیالیزم، کە لە سەرەتاوە بە نازی- سوزی ناسرابوون، بەڕابەرایەتی هیتلەر سەرکردایەتی وڵاتیان گرتە دەست، لە ئیتالیا فاشیستەکان، بەڕابەرایەتی مۆسۆلینی، هەتا دۆڕاندنی ئیتالیا لەجەنگی دووەمدا دەسەڵاتیان بەدەستەوەبوو. هیتلەرو مۆسۆلینی سەرجەم پارتە سیاسییەکانیان لە وڵاتەکانیاندا لەناوبرد. پاش ئەوەی جگە لە پارتی نازی هیچ پارتێکی دیکە لە ئەڵمانیادا نەما، ڕۆژی 1939/7/9 هیتلەر گووتی (دواجار هەمو پارتە سیاسیەکان قڕیان تێکەوت، ئەمەیش ڕوداوێکی مێژوویی گرنگە کە لێکدانەوەی ئەو دەرەنجامو ڕەنگدانەوە خێرایانەی کە لەسەر زۆر بوار دایدەنێت بۆ هەمو کەس ئاسان نییە، ئیتر دەبێت خۆمان لە پاشماوەکانی دیموکراسی پاك بکەینەوە، ئێستا پارتی ناسیونال سۆسیالیزم ئیدی بووەتە دەوڵەت). مۆسۆلینیش هەموو پارتەکانی ئۆپۆزسیۆنی هەڵوەشاندەوەو، ئاوا ستایشی خۆی دەکرد( من پارتی فاشیستم دامەزراندو هەمیشەیش سەرکردایەتیم کردووە).

ئەم ڕژێمە سیاسیانە کە لە بنەڕەتدا خۆیان دیکتاتۆریەتێکی فەردی بوون، بەڵام بەپاڵپشتی سەرکردەکانی دیکەی حزب ئازادییە مەدەنییەکانیان سەرکوتکردو دەمی چاپەمەنیان داخستو بۆ وێڵ کردنی جەماوەریش لە ئاست پرسو کێشە ناوخۆییەکانی وڵاتو سەرکێشیە دەرەکیەکانیان دەستیاندایە برەودان بە بیری مەزنخوازی نەتەوەیی و خۆبەزل زانین لە ئاست نەتەوەکانی دیکەو وڵاتانی تردا. (فاینەر) لە خوێندنەوەیدا بۆ سیستمی تاك حزبی دەڵێت: (پارتە دیکتاتۆریەکان، پارت نین، بەڵکو

زۆرداریییەکی ڕێکخراو یاخود فەردین، واتە ئەم پارتانە نە ڕابەرایەتی فراوان دەکەنەوەو، نە هانیشی دەدەن، بەڵکو بەرتەسکی دەکەنەوە).

یەکێتی سۆڤیەت لەژێر دەسەلاتی سیستمی تاك حزبیدا پێشکەوتنێکی خێرای بەخۆوە دی و بووە زلهێزێکی جیهانی، جڵەودارانی سیستمی تاکحزبی پێیان وابوو کە سیستمی سۆڤیتی دادپەروەری کۆمەلایەتی و نەژادی و، بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی هاولاتیانیان دەستەبەرو دابین کردووە. فێربوون و خوێندن بەخێرایی پەرەیان سەندو ئاستی بەشداریکردنی هاولاتیان لە کاروبارە گشتیەکاندا ڕووی لە هەڵکشان کرد، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لە سەردەمی ستالین دا دەسەلاتگەرایی بەتەواوی پەرەی سەندو زاڵ بوو، ئۆپۆزسیۆن سەرکوت و بنبڕکراو ئازادیە مەدەنیەکان قەدەغە کران و، بۆ بەرزڕاگرتنی پارت و سەرکردایەتیەکەی گەلێك شێوازی زۆرەملێ گیرایە بەر. واپێدەچێت ئەنجومەن (شورا)ی یاسادانان هەر دیکۆر بوو بێت.

بەلام ناشکرێت هەرچی سیستمی تاك حزبیە خراپ و تاوانبار بکەین. بۆ نمونە تورکیا بە هۆی توانایی و ڕابەرایەتی ئەتاتورکەوە توانی ڕێگە بۆ شێوازێکی دیکەی دیموکراسی هەموار بکات. هەروەها زۆرێك لە ولاتانی گەشەسێن لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین بە هۆی پەرش و بلاوی پارتەکان و ڕێژەی زۆری نەخوێندەواری و نائامادەیی نەریتی ئازادیخوازی و کەمی بەرپرسانی خوێندەوارو بەهۆی جیاوازی زۆر لە داهات و دابەشکردنی سامانداو گیرۆدەبوون بە کێشەکانی ئاوەدانکردنەوەو بەپیشەسازیکردن، دەوڵەت نەهاتوە دیموکراسی بەخەیاڵ و بەڕوکەش دامەزرێنێ بەڵکو بۆ دەربازبوون لە ژێر باری قورسی ئەو دۆخە سودیان لە ئەزمونی تاك حزبی ولاتانی سۆسیالیستی وەرگرت، هەتا ئەو قۆناغەیان تێپەڕاند، ئینجا پشتگیری لە دیموکراسیزمی واقیعی دەکەن تابتوانن گەشەی ئابووری و دادپەروەری کۆمەلایەتی و ئاوەدانکردنەوەی ولات مسۆگەربێت.

**ت/ ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆن لە دیموکراسیدا**

ئەو قسەیەی کە دەڵێت ئۆپۆزسیۆنی تەندروست گیانی دیموکراسیزمی پەرلەمانیە زۆر ڕاستە. چونکە ڕۆڵێکی هەستیارو زیندووی هەیە. ئەوە ئۆپۆزسیۆنە کە دەتوانێت هەنگاوەکانی پارتی دەسەلاتدار بەرەو زۆرداری و سەرەڕۆیی جڵەوبکات. ئۆپۆزسیۆنی لێهاتوو لە پەرلەماندا دەتوانێت تاوتوێکردنی هەر پرۆژە یاسایەکی نابەجێ و نەویستراو کە زادەی بیری نەخۆشی دەسەلاتداران و دەسەلاتخوازی سەرکردەکان بێت لە قاو بدات و، ڕێگر بێت لە تێپەڕین و پەسەندکردنی لە پەرلەماندا. جگە لەوەیش بە هەڵماڵینی کەموکوڕی و لاوازی وەزیرەکانی کابینەی حکومەت دەتوانێت ڕێگربێت لە سەرەڕۆییەکانی حکومەت و ئەنجومەنی وەزیران. لەڕاستیدا سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن سەرۆك وەزیرانی جێگرەوەو پارتەکەیشی حکومەتی چاوەڕوانکراون. لە بەریتانیا بە ئۆپۆزسیۆن دەوترێت ( ئۆپۆزسیۆنی

خاوەنشکۆ)و لە بودجەی بەریتانیا پشکی بۆ تەرخان کراوەو سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن هاوتای وەزیرێکی حکومەتەو سەرۆك وەزیران لە پرسە گرنگ و هەستیارەکاندا ڕاوێژی پێدەکات. ئۆپۆزسیۆنێکی ئاوا لەسیستمی دوو حزبیشدا دەتوانێت هەڵسوڕێت و ڕۆڵیشی کەم نییە.

لە دیموکراسیزمی سەرۆکایەتی ئەمریکاشدا ئۆپۆزسیۆن دەتوانێت لە بەرامبەر هەر بەرزەفڕییەکی شاهانەی سەرۆکدا بووەستێتەوەو، لە کۆنگرێسیشدا ململانێی زۆرینە بکات. لە سیستمی دیموکراسیدا ، پەرلەمانی بێت یا سەرۆکایەتی، ئۆپۆزسیۆنێك بە چەشنی شمشێرەکەی دیمۆکلیس بەسەر سەری سەرکردە هەڵبژێردراوەکانەوە نەبێت ئەوا دیموکراسیزمێکی تەمەن کورت دەبێت و، ئەگەر هەموو زەنگێکی ڕای گشتیش لە نێو پەرلەماندا زایەڵەی بێت، ئەوا پەرلەمانیش دەبێتە پەرلەمانی خەڵکی.

### 5/ گروپەکانی فشار

ڕۆسۆو بیرمەندە ئایدیالیستەکانی دیکە لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە پێویستە هاوڵاتیان حەزو ویستە تایبەتەکانیان وەلابنێن و هۆشیارییەکی هاوبەشی لەشوێندا برەو پێبدەن کە چاکەی گشت لایەکی تێدابێت. بەڵام پاشان بە تێپەڕینی کات ئەوە دەرکەوت کە ( چاکەی گشتگیر) چەمکێکی ناڕۆشن و ناواقعیە، چونکە بەرژەوەندی کۆمەڵگا وا دەخوازێت کە هاوسەنگی و هاوتایی لەنێوان بەرژەوەندی تاکەکاندا بەدی بهێنرێت، نەك سەرخستنی بەرژەوەندی هەندێك بەسەر بەرژەوەندی کۆمەڵێکی دیکەدا. هەر ئەمەیشە هونەری سیاسەت کە بەهاوسەنگ کردنەوەی بەرژەوەندییە جیاوازەکان، زۆرترین ڕەزامەندی کۆمەڵایەتی بەدی بێت.

جگە لە پارتە سیاسییەکان گروپ و کۆڕو کۆمەڵەی دیکە لە نێو کارگاو دامەزراوە ئابووری و بازرگانیەکان و ... هتد دا هەن کە بە مەبەستی پاراستنی(بەرژەوەندی) ئەندامەکانیان پێکهاتوون و خۆیان ڕێکخستوە. جوتیاران و هونەرمەندان و پزیشك و مامۆستا و پیشەوەرەکانی تریش ڕێکخراوی خۆیان هەیە. لە ئەمریکا گروپەکانی فشار گەورەترین گروپی خاوەن بەرژەوەندین کە زۆربەیان لە واشنتۆن کارمەندو هەڵسوڕێنەریان هەیە بۆ ئەوەی نزیك بن لە ناوەندی بڕیارەوەو دەست وەردەنە سیاسەتەکانی دەوڵەتەوە، تا حکومەت لە بڕیارو پەسەندکردنی یاساکاندا بەرژەوەندییەکانیان فەرامۆش نەکات و زیانیان پێ نەگەیەنێت. هەر لە ئەمریکا توێژینەوەگەلێك سەبارەت بە ڕۆڵ و بەرهەمی ئەم گروپانە ئەنجامدراون و توێژینەوە تازەکانیش ئەوە دەردەخەن کە لە بەریتانیایش ئەم گروپانە هەن، ئەوەی مایەی نیگەرانی ڕای گشتیە ڕۆڵ وفشاری ئاشکراو شاراوەو هەژمونی خاوەن سەرمایەو بەرژەوەندییەکانە بەسەر بەرپرسەکانی حکومەت و، ڕەنگدانەوەی ئەو فشارانەیە لەنێو سیاسەتە نادروستەکانی حکومەتدا. ئەوەیش کە نیگەرانیەکان زیاتر دەکات چالاکی و هەڵسوڕانی گروپەکانی فشارە لە چەشنی ژووری بازرگانی و یەکێتیە بازرگانیەکان کە وەك گروپی خاوەن

بەرژەوەنـدی هـەوڵ دەدەن دەسـەڵاتیان بەسـەر سیاسـەتەکانی حکومەتـدا بسەپێنن. هـەر بۆیـە بیرمەنـدە سیاسـیەکان لەسـەر ئەوبڕوایـەن کـە ئیـدی کـەس ناتوانێـت لاف ئـەوە لێبـدات کـە نوێنەری بەرژەوەندی گشتیە.

گروپەکانی فشار لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بەهۆی پێشکەوتنی ئابوورییەوە جۆراوجۆرترو چالاکترن لە گروپەکانی فشار لە وڵاتانی هەژارو دواکەوتوودا.

**أ/ ماناو ناوەڕۆکی گروپەکانی فشار**

گروپەکانی فشار بەپێی پێناسەی هەندێك( کۆبوونـەوەی خەڵکێکـە کـە بـۆ گەیـشتن بـەو ئامانجە هاوبەشانەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، دەسـت دەدەنـە چـالاکی سیاسـی تـا کاربکەنـە سـەر سیاسـەتە گـشتیەکان (مـاك ئیڤـر) ڕای وابـوو( کۆمەڵـە کەسـانێك بـۆ پاراسـتن یـا باشـترکردنی پێگـەو دەسـتکەوتەکانی پێشووتریان یـەك دەگرن‌و، دەربڕینی (گروپـی بەرژەوەندییـەکان) وەك پاسـاوێك بـۆ دروسـت بوونیـان بـۆ خۆیـان بەکاردەبـەن، ئەمـەیش بـۆ ئـەوەی نیـشانی بـدەن کـە گروپـی جۆراوجـۆر هـەن‌و لـە ئـاراداو‌و شـێوازو ڕێگـای هەمەچەشنیان لەبەردەستدایە بۆ دژایەتیکردنی بەرژەوەنـدخوازی گروپـەکانی تـر یـاخود هاوسـەنگ کردنـەوەی بەرژەوەندیـەکانیان، کـە ناوەڕۆکێکی ئابووری یان سیاسیان هەیە، یەك لە بەرامبەر ئەویدیدا.

(زیگلـەر) ئـاوا پێناسـەی گروپـی فـشاری کـردووە( کۆمەڵـە کەسـانێکی ڕێکخـراون کـە هەوڵدەدەن کاربکەنە سەر بڕیارو سیاسەتەکانی حکومـەت بـەبێ ئـەوەی هەڵپـە بکـەن بـۆ بەدەستهێنانی کورسی‌و پۆستی حکومی) بەم پێیە لایـەنێکی گرنگی هەڵسوڕانی گروپـەکانی فشار لەوەدایە کە بەردەوام بەشێکن لەڕەوەندی سیاسـی‌و خـەبات دەکـەن بـۆ چەسـپاندن یـا گـۆڕینی ئاڕاسـتەو ئاقـاری سیاسـەتەکانی حکومـەت، بـەڵام نایانـەوێت جڵـەوی دەسـەڵات بگرنە دەست.

بۆیـە دەتـوانین ئـەوە هـەڵهێنجێنین کـە گروپـەکانی فـشار ئـامرازێکن کـە بـە هۆیـەوە خـاوەن بەرژەوەنـدی هاوبـەش هەوڵـدەدەن کاریگـەری لەسـەر ڕەوتـی سیاسـەتی گـشتی دابنێن. واینەر دەڵێت( مەبەست لە گروپی فشار هـەر جـۆرە ڕێکخراوێکـی نـاحکومی خۆبەخشانەیە کە هەوڵ دەدات لە مەسەلەکانی جێگـۆڕکیێ یـا وەرگـرتنی پۆسـتە حکومیـەکان‌و جێبەجێکردن یان چاکسازیکردن لە سیاسەتی گشتیدا ڕۆڵ‌و کاریگەری هەبێت).

کەوایە گروپەکانی فشار ڕێکخراوگەلێکن کە ئاگایان لە سیاسەت هەیەو، خۆیان لە کاروباری حکومـەت هەڵـدەقورتێنن، تـا بڕیـارو سیاسـەتەکانی لەگـەڵ بەرژەوەندییەکانیانـدا نـاکۆك نـەبێت، بـەڵام ئامـادەش نـین کـە هـیچ پاڵێوراوێـك بـۆ وەرگـرتنی پۆسـتی حکـومی دەسـت نیـشان بکـەن. (دۆڤیرجـیێ) دەڵێت:(گروپەکانی فشار لە هەوڵی ئەوەدان کە کاریگـەری لەسـەر بڕیاربەدەسـتەکانی حـوکم دانـێن، نـە ئـەوەی کـە ئەنـدامانی خۆیـان بـۆ دەسـەڵات دەستنیـشان بکـەن (لایـەنی کـەم بـە شێوەیەکی ئاشکرا، چونکە زۆرێك لەڕیکخراوو گروپـە بـەهێزەکان ژێربـەژێرو بەشـێوەی نهـێنی

خـەڵكیان لـە نـاو حكومـەت و دامەزراوەكانـدا هەیـە). كەوایـە گروپـەكانی فشار لـە سیاسـەتدا دیاردەیەكی تـازە نین، بـەڵام لێتوێژینـەوەیان لـە زانـستی سیاسـەتدا پێـشێنەیەكی وای نییـە. گروپـی فـشار (لـۆبی)و (گروپـی سیاسـی)و (گروپی خاوەن هەژمون) یشیان پێدەگووترێت.

**ب/ تایبەتمەندییـە گـشتییەكانی گروپـەكانی فشار**

پـەرێزگرتن لـە كاركردنـداو دەرەنجـامی چـالاكییەكانیان لەسیـستمی سیاسـیدا لـەو ئەنجامگیریانـەن كـە توێژینـەوەكان لەسـەر تایبەتمەندییـە بنەڕەتییـەكانی گروپـەكان دەریانخستوە، لەو تایبەتمەندیانەش:

1- بەرژەوەندی تایبەت،

سەرچـاوەو هۆكـاری پێكهـاتنی گروپـی فشارە، ئـەو خەڵكانـەی كـە گروپێك پێكدێنن و دەسـت دەدەنـە چالاكی و خـەبات، بەرژەوەنـدی تایبەت و هاوبەش كۆی كردوونەتـەوە. بە وتـەی میلـەر(ڕێكخراوەكـان هـەر بەتـەنها نوێنەرایـەتی ئەندامـەكانیان ناكـەن بـەڵكو نوێنـەری ئـەو كەسانەشن كـە تایبەتمەندێتییـەكی هاوبەشیان لەگەڵ گروپدا هەیـەو بەو هۆیەشەوە بە ئەندام دەژمێردرێن).

2- سیمایەكی سیاسی شاراوەیان هەیە،

گروپـــەكان ڕووی سیاســـی خۆیـــان دەشارنەوەو پێیـان شـەرمە بێنـە نـاو مەیـدانی ئاشـــكرای سیاســـەتەوە (سیاســـەتەكانی گروپـەكانی فشار ئـەوە دەردەخـەن كـە شـتێكە كەمترە لـە سیاسی بوون و زیـاترە لـە ناسیاسی بوون، واتە لە نێوانی چالاكی سیاسی و غـەیرە سیاسـیدا)، بەشـێوەیەكی گـشتی گروپـەكانی فشار سیمای سیاسی خۆیـان بـە پێی بـۆ لـوان دەپارێزن یان لەدەستی دەدەن.

3- **جیـاوازی گروپـەكانی فـشار لەگـەڵ پارتـە سیاسییەكاندا،**

گروپـی فـشار كۆبوونەوەیـەكی بەرتەسـك و سـنووردارەو لـە پـشتی پـەردەوە ڕۆڵـی خـۆی دەگێڕێـت و، نـاوەڕۆكێكی سیاسـیانەی نییـەو بەشداربوونیـشیان لـە پرسـە سیاسـییەكاندا بـەپێی پێویـستی و بـۆ لوانـە، بۆیـە هـەوڵی دەستخستنی دەسـەڵاتی سیاسی نادات، بـەڵام بەپێـــچەوانەوە پارتـــە سیاســـییەكان كۆبوونەوەیـەكی فراوانترن و بەئاشكرا لـە پرسـە سیاسـییەكانی وڵاتـدا بەشـدارن چـونكە خۆیـان نـاوەڕۆكێكی سیاسـیان هەیـەو دەیانـەوێت دەسـەڵاتی سیاسـی بگرنـە دەسـت. (دۆڤیرجـێ) نووسـیویە (جووڵانـەوەی پارتـە سیاسیەكان بـۆ بەدەســـتهێنان و كـــارپێكردنی دەســـەڵاتی سیاسـییە، بـە پێـچەوانەوە گروپـەكانی فـشار ڕاستەوخۆ ناچنە پرسی دەستخستنی جڵەوی دەســـەڵاتەوە، بـــەڵكو لـــە دەرەوەی بازنـــەی دەسەڵاتەوە فشار بۆ دەسـەڵات دێنن)، هـەروەها لـــەو جیاكارییـــەی كـــە لـــە نێـــوان پارتـــە سیاسـیەكان و گروپـەكانی فـشاردا كردوویـەتی ئـــاوای نووســـیوە: (پارتـــە سیاســـییەكان ڕێكخراوگـەلێكی تایبـەتن بـە هەنـدێك چەشـنی ڕژێمـەكان (وڵاتـە دیموكراسـیەكانی ڕۆژئـاوا)و لەسـەردەمێكی مێـژوویی دیـاریكراودا (سـەدەی بیـست)دا، بەپێـچەوانەوە گروپـەكانی فـشار لەهەموو سەردەم و ڕژێمێكدا هەن، سنوری پارتە سیاسـییەكان لـە سـنوری گروپـەكانی فـشار

ڕونترەو، لەڕاستیدا پارتە سیاسییەکان لە پێناو چالاکیو دەستدانەکاری سیاسی هاتونەتە ئارا، پـارت بەتـەنها پارتـە. بـەڵام گروپـی فـشار ڕێکخراوگەلێکی ناسیاسین کە لە هەوڵی گرتنە دەستی دەسەڵاتدا نین).

4- **گروپەکانی فشار یان سیاسین یان نیمچە سیاسی،**

گروپەکان هەندێکیان ئەو کاتە سیاسین کە شـوێن بەرژەوەندییـەکی درێژخایـەن دەکـەونو، لـە پێنـاو دابینکردنـی دەسـتکەوتی هەمیشەیی بـۆ ئەندامـەکانیان دەچـنە نێـو ڕەوەنـدی سیاسـیەوە، ئـەم گروپانـە زیـاتر نوێنەرایـەتی کرێکـار، جوتیـار، بازرگـان، خـاوەن بانـكو سەرمایەداران دەکەن، بەڵام هەندێك گروپی تر هـەن کـە بەشـێوەیەکی کـاتی و لـە پێنـاو بـەرگریکردن لـە بـاوەڕێکی تایبـەت- ئـاینزایی یان مرۆڤدۆستانە- پێکدێنو ، هەڵسوڕانیان بە چـالاکیەکانی حکومەتـەوە نەبەسـتراوەتەوە، بەڵکو بەرگری لە باوەڕێك یان بنەمایەك دەکەن، نـەك دەسـتکەوتی ئـابووری، وەك هەڵوەشـاندنەوەی سـزای لـە سـێدارەدانو پاراستنی ژینگە( ئاشتی سەوز) .

5- **بڵاوبوونەوە بە جیهاندا (جیهان گرتنەوە)،**

ئـەم گروپانـە لـە هـەموو وڵاتـانی جیهانـدا بـەربڵاونو یەکێتییـە کرێکارییـەکان، ڕێکخـراوە جوتیاریـەکان، دامـەزراوەی ئـایینیو گروپـی ئابووریو پیشەیی دەگرێتەوە.

**پ/ ڕۆڵی سیاسی گروپەکانی فشار**

چ لـە سیـستمە دیموکراتیەکانـداو چ لـە سیـستمە تۆتالیتاریەکانـدا گروپـەکانی فـشار ڕۆڵێکـی دیاریـان هەیـە، لـە سیـستمە دیموکراتیەکاندا هەڵسوڕانی گروپەکان ڕوو بە حکومەتـەو لەسیـستمی سیاسـی گشتگیریـشدا چـالاکییەکانیان تـەواو ئاراسـتەیەکی جیـاوازی هەیە. ڕۆڵی ئەم گروپانە بە کورتی ئەمانەن:

1- **گروپەکانو هەڵبژاردن**

ڕێکخراوەکـان بایـەخێکی زۆر بـە هەڵبـژاردن دەدەن چونکە لەم ڕێگەیـەوە دەتـوانن کەسـانێك هەڵبـژێرن کـە خۆیـان مەبەسـتیانەو بـەهۆی پاڵێوراوەکانیـشەوە دەسـەڵاتیان بەسـەر کاروبارەکانی حکومەتدا بشکێ.

ڕێکخراوەکـان بەشـێوەیەکی شـاراوەو ئیـشکردنی پـشت پـەردەوە بەشـداری گەمـەی هەڵبژاردنـەکانو قۆناغـەکانی دەبـن. وەك لـە ناسـاندنی پاڵێوراوەکـانو بەدەسـتهێنانی پـشتیوانی دەنگـدەران بۆیانـدا هـەوڵی بەدەستهێنانی کورسیەکانی پەرلەمان دەدەن بۆ کەسـانی جـێ مەبەسـتیان. ڕەنگـە گروپـەکان لەبـەرخاتری ئـەو پاڵێوراوانـەی کـە مەبەستیانە لایـەنگری لـە پـارتێکی سیاسـی بکـەنو، پـشت ئەستور بەو جەماوەرەیان کەلەنێو دەنگدەراندا هەیانـە بەئاسـانی چەلەحانێ لەگەڵ پارتـەکانی تـردا بکـەنو کەسـانی جـێ مەبەستیـشیان وەك ئەندامی فلانە پارت بناسێنن. جاری وا هەیـە ڕێکخـراوە گـەورەو بـەهێزەکان دەست دەخەنـە ناو دەستی یەکەوەو ڕێك دەکەون تا پارتـەکان ناچـار بکـەن کەسـانێك دەستنیـشان بکـەن بـۆ هەڵبژاردنەکە کە بەرگری لە بەرژەوەندییـەکانیان دەکـاتو، بەهەڵبژاردنیـشیان ئـەو کەسـانە بـە دڵـسۆزیەوە بـەرگری لـە گروپـەکانو

بەرژەوەندیـــەکانیان دەکـــەن. هەنـــدێکجاریش کەسانی دەسەڵاتخواز و بەهەڵپە بۆ گەیشتن بە کورســی و مــسۆگەرکردنی مانــەوەیان لەســەر پۆستەکانیان بەردەوام لەگەڵ ئەم ڕێکخراوانەدا هاوخەت دەبن. تا ڕێکخراوەکانیش گەورەتر بن مەرجــــــــەکانو پابەنــــــــــدبوونو پێملبوون(ئیلتیزامات)و فشارەکانیش زیاترو توندتر دەبن.

### 2- گروپەکانی فشارو پەرلەمان

ئەو کەسانەی کە بە پشتیوانی ڕێکخراوو گروپــەکان چــوونەتە نێــو پەرلەمانــەوە ڕۆڵــی گرنگیـان لـەو پـرۆژەو یاسایانەدا هەیـە کـە بـە قـازانجی گروپەکانــە. (بــارمن) ســەبارەت بــە هــەژمونی ئــەم گروپانــە لەســەر کۆنگریــسی ئـــەمریکا نووســـیویە( ئەنـــدامانی کـــۆنگرە، بەتایبــەت ئەنــدامانی ئەنجومــەنی نوێنــەران، بەگشتی لە ژێر هەژمونی ڕێکخراوەکاندانو لە چاو ئەندامەکانی دیکەی کۆنگرە، کە ئەرکیانە بەپێی دەستوری پارت بجوڵێنەوە، بۆ پەسەند کردنی پێشنیارو ڕاسپاردەکانیان بۆ کۆنگریس هەوڵێکی زیاتر دەخەنە گەڕ. ڕێکخراوەکان لە زۆربەی وڵاتاندا بۆ پیادەکردنی هێزی خۆیان بەســـەر پەرلەمانـــدا شـــێوازی نادەســـتوری بەکاردەهێنن. ڕێکخراوو گروپـەکانی فشار لـە سیــستمی دیموکراســی نوێنەرایەتیــداو لــەو دەوڵەتانەی کە پێیان دەگوترێت خۆشگوزەران ( دەوڵـەتی ڕیفاه) ڕێکوپێکترو چالاکترن وەك لە نـاو سیــستمە تۆتالیتاریەکانــدا کــە دەوڵــەت لەسەر دیسپلین کردنو چڕکردنەوەی دەسەڵات لــە دەســتی تاکــە حزبێــكو دیکتاتۆریەتێکــدا بەڕێوەدەچێت ( لەسیستمی سیاسی گشتگیردا کە پارتی تاقانە بانگەشەی سەرکردایەتیکردنی سیاسیو کۆمەڵایەتی دەکات، چەمکی گروپی فــشار پێویــستی بــە جۆرێــك لــە ڕۆشــنایی خستنەسەرە، چونکە پارتی تاقانە یان پێشڕەو، ڕێگــە بــەم ڕێکخــراوە تایبەتمەندانــە نــاداتو زەمینەو توانستی هاتنە ئارایان لەناودەبات).

### 3- گروپــــەکانی فـــــشارو دەســـــەڵاتی جێبەجێکردن

هــەژمونو دەســەڵاتی ڕێکخراوەکــان بەســەر حکومەتـــدا لـــە ڕێگـــەی پەرلەمانەوەیـــە. پەرلـەمانتاری هەڵبـژێردراوی ڕێکخراوەکـان بـە وروژانــدنی پرســیارو بانگهێــشت کــردن بــۆ ڕوونکردنـــەوە(استیـــضاح)، ڕاگــرتنی کــاتی دانیــشتنەکانو بەرزکردنــەوەی پێــشنیار لــە ڕێگـــەی لیژنـــەکانی ڕاوێـــژکاری خـــودی پەرلەمانــەوە، دەتــوانن کــار لــە سیاســەتی حکومەت بکەن. لە ئەمریکا گروپەکان ڕاگرتنی کـاتی دانیـشتنەکانی سـەنا دەکەنـە کـارتێکی فشار بۆسـەر سـەرۆك کۆمـار تـا کەسـانی جـێ مەبەستی خۆیان بۆ هەندێك پۆستی سیاسی، سەربازیو دیپلۆماتی دیاری بکات. لە هەندێك ویلایەتیشدا سـەرۆكو بەرپرسـانی ویلایەتەکـە ئەنـدامانی ئەنجومـەنی یاسـادانانی ویلایــەت ڕائەســـپێرن تـــا وەکـــو نێوانکارێـــك لەگـــەڵ گروپەکاندا پەیوەندیەکانیان بۆ ڕێکبخات.

### 4- گروپەکانی فشارو دەسەڵاتی دادوەری

دەســـەڵاتی دادوەریــش پــارێزراو نییــە لــە هــەژمونی لـۆبیو گروپـەکان، لەگـەڵ ئەوەیـشدا

دەسـەڵاتی دادوەری لـە ڕووی سیاسـییەوە بێلایەنـە، بـەڵام گـروپ و ڕێکخراوەکـان دووراودوور (نـەك لـە ڕێگـەی فـشاری ڕاسـتەوخۆو جڵـەوکردنی دادوەرەکانـەوە) و بـە دنـەدانی ڕای گـشتی و جوڵانـدنیان بەشێوەی دیموکراسیانە زۆر بۆ دادوەرەکان و دەسەڵاتی دادوەری دێنن و دەستی تێوەردەدەن. گوتـارو ڕاوبۆچـوونی ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـان کاردەکەنـە سـەر دادگـای بـالاش (سـەروتارە گرنگـەکان بەشـێکن لـە گـرنگترین بۆچوونە مافناسییەکانی بەردەستی دادوەران). لـە ئـەمریکا تێبینیـە سیاسـییەکان و دەسـتێوەردانی گروپـەکان کاردەکەنـە سـەر هەڵبژاردنی دادوەرەکان، ئەم دەستێوەردانە ڕێك بـۆ ئەوەیـە کـە هەڵبـژاردنی دادوەرێـك و هەڵنەبژاردنی یەکێکی تر مسۆگەر بکەن. لێرەوە کاریگـەری گروپـەکان لەسـەر دادوەری دەردەکەوێت.

5- **گروپەکانی فشارو ڕای گشتی**

لە هەموو سیستمە سیاسییەکاندا گروپەکان لـە هەڵخرانـدن و دنـەدانی ڕای گـشتیدا ڕۆڵـی گرنگیان هەیە، بە وتەی چایلدز (گروپەکان سێ جـۆر سـتراتیژیان هەیـە بـۆ کارکردنـە سـەر ڕای گشتی:

1- پەنابردنـە بـەر توانـایی و هێـزی عـەقڵی خـەڵك، ئـەویش بـە هـۆی بڵاوکراوەکـان و، کۆبوونـەوەو وتاربێـژی، کـۆنگرەی ڕۆژنامەوانی و...هتد.

2- بزوانـدنی هەستوسـۆزو تـوڕەیی و ترس و دڵەڕاوکێ و یا هەر چەشنە دنەدانێکی هەسـتی خـەڵکی بـۆ گـۆڕین یـا جێخـستنی بڕوایەکی دیاریکراو.

3- بەکارهێنانی تاکتیکی خۆخۆشەویست کردن یا خۆشیرین کردن لەلای دەنگدەران یان خـەڵکی خـاوەن پایـەی کۆمەڵایـەتی ئەمـەیش بەبانگەشـە کـردن و باسـکردنی داخوازییـە تایبەتیەکانیان کە دەتوانن بەمە بە شێوەیەکی بەرچاو کاربکەنە سەر ڕای گشتی.

لێـرەوە دەتـوانین ئـەوە هـەڵهێنجێنین کـە ڕێکخراوەکـان ڕۆڵێکـی گرنگیـان هەیـە کـە هـەر کاتیـك ئـەو ڕۆڵـە بەشـێوەیەکی نابەرپرسـیارانە بگێڕن و بیانـەوێت لـە ڕێگـەی فشارهێنانەوە بـۆ سەر حکومەت دەستکەوت بەدەست بهێنن ئەوا زیانبـارە، بـەڵام کـاتێکیش تەگـەرەو کۆسـپ دەخەنـە بـەردەم بەرژەوەنـدی و خۆشـگوزەرانی گـشتی و دیموکراسـی، ئـەوا بـۆ حکومـەتی نوێنەرایەتی مەترسییان دەبێت.

**سەرچاوەو پەراوێز:**

*1.Ball,Alen R., Modern Politics and Government .London: oxford University Press, 1951. p 79 and Bhattacharjee, Arun ,An Introduction to Political Science. New Delhi: S.B . Nangia 1991 .p.21*

*2.Burke, Edmond," Thoughts on the cause of Present Discontents "in the Works of Edmond Burke, vol.2, (London: Holfman&Knopt, 1949) vol.2.p.82 .*

3.***Finer, Herman, The Theory and Practice of Modern Government.$4^{th}$ ed . New York: Methuen,1965***.

***4.Gettell, Roymond G., History of Political Thought. New York: Ginny and Co., 1924. p.289***.

***5.Gilchrist, R.N., Principles of Political Science.$6^{th}$ ed., London: Longman. Green and Co .1938.p.327***

***6.Kapur, A.C, Principles of Political Science. $17^{th}$ ed., London: C .Allen& Unwin, Ltd., 1987.p .566-569***

***7.Laski,Harold,AGrammar of Politics.$5^{th}$ ed.,London: C.Allen& Unwin Ltd.,1967***.

***8. Leacock, Stephen, Elements of Political Science. London: Constable, 1924.p.311***

***9.Maciver, Robert M. The Modern State. New York: Oxford University Press, 1964.p390***.

***10.Michaels , Robert Political Parties (New York: Free press,1949) p.418***.

***11.Merriam,CharlesE., The New Democracy and the new Desperation .Chicago: Chicago University Press, 1939***.

***12. Nnoli, Okwadiba, Introduction to Politics. Essex: Longman Group Ltd., 1990***.

***13.Schumpeter, J.A., Capitalism, Socialism and Democracy, 5th ed. (London: Allen& Unwin, 1950) p. 279***

***14.Ziegler, H. and G.Wagne Peak, Interest Groups in American Society $2^{nd}$ ed ( Englewood Cliffs , N.j .Prentic Hall, 1972) p. 30***.

**سەرچاوەکان:**

1 – **ابـوو الحمـد، عبدالحميـد .حقـوق اداری ایـران، چاپ چهارم، تهران:** طوس ،1370.

2– **موریس دوورژه، احـزاب سیاسـی، ترجمـه رضـا علومی ، تهران: انتشارات امیر کبیر،** 1357.

**بنیادهــای سیاســت / عبــدالرحمن عــالم– تهــران: نشرنی،** 1373

# له بارەی عەقڵەوە

د. عبدالكریم سروش
له ئینگلیزییەوە: هادی محەمەد

**پێشەکی/**

هەڵهێنجانی ڕێسا گشتییەکان لە دڵی "عەقڵی نا مێژوویی – ڕەهاوە "*absolute a – historical reason*" و ڕەچاوکردنی ئەم ڕێسایانە بەوەی کە شایانی جێبەجێکردن بن بۆ هەموو خەڵکی و لە هەموو سەردەمەکاندا، ئەمڕۆ بۆتە کارێکی زۆر سەخت. ئەمڕۆ مرۆڤایەتی بە فرەگەری *pluralism* و ڕێژەگەراییەکی *relativism* تەندروست و سوودمەند گەیشتووە، بەرهەمی ئەم گەیشتنەش خاکی بوون و ڕەتکردنەوەی دۆگماتیزمە، گەورە فەیلەسوفی ئێرانی کە ئێستا بە سەردانێك لە زانکۆی ئەمستردامە قسە لە بارەی سێ نەیاری عەقڵەوە دەکات، ئەوانیش (سروش "وەحی"*revelation*، عەشق *love*، شۆڕش *revolution*)، سێهەمیان واتە شۆڕش دڵڕەقترینیانە بەرامبەر عەقڵ *Reason*. لەگەڵ ڕووبەڕوبونەوەی شۆڕشە گشتگیرەکاندا، واتە ئەو شۆڕشانەی کە هەڵگری جوانی عەشق و پیرۆزی سروش (وەحی) نین، تەنها دەتوانین پەنا بۆ خودا *God* بەرین. ئەو شۆڕشانەن خەڵکی لە ژیان و عەقڵ بێ بەش دەکەن..

د. سروش: کاتێك ریچارد رۆرتی *Richard Rorty* ووتی: لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خوا *God* هەر خوا بوو *god* تەنها وەکو پەرستراوێك، لە سەردەمی ڕۆشنگەری و مۆدێرنیتەدا، عەقڵ بوو بە خوا، ئەمڕۆ لە سەردەمی پۆست مۆدێرندا، خوا بوونی نییە، لە بانگەشەکەی رۆرتیدا پێوەرێکی باشی تێدا بوو لە بارەی حەقیقەتەوە. بتی عەقڵ یاخود خوای عەقڵ ئەمڕۆ پارچە پارچە بووە. وە زاراوەی دڵگیری "عەقلانیەت *Rationality*" کە رۆژێك لە رۆژان

بەرزترین و پیرۆزترین زاراوە بوو، ئەمڕۆ جگە لە مانایەکی نزم و لێڵ و ناڕۆشن هیچی دیکە ناگەیەنێت. عەقڵی ئەرستۆیی، عەقڵی دیکارتی، عەقڵی کانتی، عەقڵی هیگڵی، عەقڵی دینی، عەقڵی مێژوویی، عەقڵی دیالێکتیکی، عەقڵی کردەیی، عەقڵی تیۆری و هەموو جۆرەکانی دیکەی عەقڵ ئەم ئاوێنەیان کردووە بە هەزار پارچەوە و بینینی وێنایەکی گشتگیر و رێکوپێک (نەشێوێنراو) یان لە ئاوێنەکەدا مەحاڵ کردووە.

ئەمڕۆ، کاتێك کەسانێك قسە لە عەقڵ دەکەن، یا ئەوەتا دەگەڕێنەوە بۆ میتۆدە لۆژیکییەکانی عەقڵکاری استدلالی *deductive reasoning* و عەقڵکاری هەڵێنجاندن *inductive*، بەراستساندن و بەتاڵکردنەوە.. هتد، یاخود بۆ بەرهەمەکانی عەقڵ کە پێکدێن لە فەلسەفە، زمان، ئەخلاق، زانست و هەروەها. وە لەبەرئەوەی ئەم بەرهەمانە هەموویان لەبەر ڕۆیشتوون و شایانی گۆڕانن، لە سەردەمی ئێمەدا ئەوە بەڕاستییەکی بەڵگەنەویست دەزانرێت کە عەقڵ دەگۆڕێت (گەشە دەکات و بە تەواوی کامڵ دەبێت). عەقڵی مۆدێرن و عەقڵی کلاسیك دوو عەقڵی جیاوازن چونکە بەرهەمەکانیان واتە زانست و فەلسەفە و ئەخلاق و ئابوری و سیاسەتیان جیاوازە. لەبەرئەوەیش دۆخەکە بەم شێوەیەیە، خۆ بەدەستەوەدان بۆ جۆرێك لە ڕێژەگەرایی شایانی دەربازبوون نییە. ئەمە کتومت ئەو بارودۆخەیە کە ئێمە ئەمڕۆ ژیانی تیادا دەگوزەرێنین. هەندێك فەیلەسوف موسڵمان عەقڵی تیۆری وەکو کۆمەڵێك حەقیقەتی

بەڵگەنەویستی تیۆری تەماشا دەکەن و عەقڵی کردەییش وەکو کۆمەڵێك حەقیقەتی بەڵگەنەویستی کردەیی تەماشا دەکەن. لەسەر بنەمای ئەم ناساندنە، پێویستە بووترێت کە حەقیقەتە بەڵگە نەویستەکان *self-evident truths* گۆڕاون و ئەوەی خەڵك لە ڕابردوودا بە بەڵگەنەویست تەماشای دەکرد، ئەمڕۆ چیدی بەڵگەنەویست نییە. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بوونی خودا شتێك بوو وەکو حەقیقەتێکی بەڵگەنەویستی تیۆری مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا، لە کاتێکدا ئەمڕۆ ئەم پێگەیەی لەدەستداوە. بە پێچەوانەوە، لەسەردەمی ئێستاماندا، مافەکانی مرۆڤ وەکو حەقیقەتگەلێکی بەڵگەنەویست ڕەچاو دەکرێت، لە کاتێکدا لە ڕابردوودا، ئەم مافانە لەناو حەقیقەتە بەڵگەنەویستە کردەییەکاندا پێگەیەکیان نەبووە.

سەردەمی ڕۆشنگەری *Enlightenment* خۆی وەکو ڕۆشنگەرو ڕووناککەرەوە لەقەڵەمدەدا و سەدەکانی ناوەڕاستیشی وەکو سەدە تاریکەکان وەسف دەکرد. وە بێ گومانیش ئەگەر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پرسیارتان لە خەڵك بکردایە، دیدی پێچەوانەیان دەبوو: دەیانگووت ئێمە ڕۆشنگەرین و هەر کەسێکیش پێچەوانەی دیدی ئێمە بێت لە تاریکیدا دەژیت. ڕاستی ئەوەی کە هەر کەسێك بە جدی برگەی "سەدە تاریکەکان" *Darkages* بەکاردەهێنێت، خۆی گەواهی دانێکە لەسەر گۆڕانێکی گەورە و سەرەکی هەڵوێست و ئاستی مەعریفی. ئێستا ئەوە ڕوونە کە هەردوو سەردەمی ڕۆشنگەری و

ســــەدەكانی ناوەڕاســـت لــــە چوارچــــێوەی پارادایمــەكان و حەقیقەتــە بەڵگەنەویــستەكانی خۆیانـــدا كاریـــانكردووە و بـــەم پـــارادایم و حەقیقەتانــە ســنوردار كــراون و لایـــەنگرانی هــەردوو پارادایمەكــە (مەعریفــە ناســی) زۆر بــە جدی ڕەخنــەی یــەكتریان كــردووە و ســەریان لــە ســنورەكانی خۆیــان دەرهێنــاوە. بــەڵام هــەر ئەوەندەی ئەم سنورانە روخان و ئیدی چاوەكان كرانــەوەو زمانــەكان كەوتنــە قــسە. ڕەوشــی ئەمڕۆی ئێمە لە سەردەمی پۆست مۆدێرندا لە ڕەوشــی ســەردەمی رۆشــنگەری و ســەدەكانی ناوەڕاست دەچێت. ئەو خاڵەی ئێمە لە تۆماس كوهن و میشیل فۆكۆوە فێری دەبین ئەوەیە كە تەنها یەك عەقلانیەتمان *Rationality* نییە بەڵكو فرە عەقلانیەتمان (*Rationalies*) هەیە.

ئەو وانەیەی لەمەوە فێری دەبین بریتییە لە خاكیبوونی عەقلانی. لە ڕابردوودا دەیانگووت: لــــووت بــــەرزی *arrogance* و خۆویــــستی *selfishness*ڕێگرە لەبەردەم عەقلانیەتدا، ئێستا دەبێت بڵێین كە لووتبەرزی واتە ناعەقلانیەت *irrationality* و خـــــــاكیبوونیش *modesty* یەكێكــە لــە فەزیلەتــە لــێ دەربازنــەبووەكانی خــەڵكی عــەقلانی و خوازیــارانی مەعریفــە و فێربــوون. هەڵهێنجانـــدنی ڕێـــسا گـــشتییە گەردونییــە نامێژوویــەكان لــە دڵــی "عــەقڵی نامێژوویی ڕەهاوە" و ڕەچاوكردنی ئەوەی ئەم ڕێــسایانە بــۆ هــەموو خــەڵكی و لــە هــەموو سەردەمەكاندا گوایە شایانی جێبەجێ كردنن لـــەمڕۆدا كـــارێكی زۆردژوارتـــرە وەك لـــە ســــەردەمەكانی پێــــشووتر. مرۆڤایــــەتی *Humanity* ئـــــەمرۆ بـــــە فرەگـــــەری و ڕێژەگەراییــــەكی تەندروســـت و ســـوودمەند گەیشتووە، بەرهــەمی ئــەم گەیــشتنەش خــاكی بــوون و ڕەتكردنــەوەی دۆگماتیزمــە. پێویــستە ئێمــە سوپاسـگوزاری ئـەم دەسـكەوتە بـین و بـە دەستكەوتێكی باشی بزانین. بەڵام عەقڵ تەنها لە دیوە ناوەكییەكەیەوە رووبەڕونەبۆتەوە واتە تەنها لە ناوخۆیدا دووچاری پارچە پارچە بوون بووبێت و هەمەچەشنەكانی عەقڵی پارچەبوو دروست بووبێت، بەڵكو هەروەها عەقڵ لە دیوە دەرەكییەكـــەوە لەگـــەڵ نـــەیاری دەرەكیـــدا ڕووبەڕوبۆتـــەوە. مـــن لێـــرەدا ســـێ نـــەیار (كێبـــەركێكار) *rival* بـاس دەكــەم كــە خـــۆم بەشێوەیەكی شەخسییانە لەگەڵیاندا ژیاوم و ئەزموونم لەگەڵیاندا هەیە.

## عەقڵ و سروش (وەحی)

پاپا بێنەدیكتی شانزدەهەم لە ووتارە تازە جێ مشتومڕەكەیدا، شانازی كرد بە هاریكاریی و گونجــانی نێــوان مەســیحیەت و فەلــسەفەی یۆنـانی و ئاشـتبوونەوەو هاوپـەیمانێتی نێـوان ئەم دووانەی (مەسیحیەت و فەلسەفەی یۆنانی) بە قۆناغێكی تازەی مێژوو و دڵخۆشكەر وەسف كرد. پاپا ڕەخنەی لە ئیسلام و پرۆتستانتیزم گـرت كـە نـەیانتوانیوە پەیوەندییـەكی بـەهێز لەگـەڵ عەقلانیەتــدا *Rationality* بــە تایبــەتی عەقلانیـەتی فەلسەفی و یۆنـانی بەرقەراركەن كە دەبوایــە كــارێكی لــەم شــێوەیەیان بكردایــە. تەنانەت ئەو خودای ئیسلامی وەكو خودایەكی ناعـەقلانی و بگـرە دژە – عـەقلانی وەسـف كـرد. مـن نامــەوێت لێــرەدا ســەرنجە ناڕاسـت و نـا رۆشـــنەكانی پاپـــا هەڵـــسەنگێنم. مەســـەلەكە

ئەمەیە کە پەیوەندی نێوان عەقڵ و وەحی هەرگیز پەیوەندییەکی نەرم و نیان و هاوڕێیانە نەبووە. عەقڵی پشت نەبەستوو بە وەحی هەمیشە وەکو نەیاری وەحی تەماشا کراوەو پێغەمبەرانیش ***prophets*** هەرگیز حەزیان نەکردووە پێیان بووترێت فەیلەسوف. دیناسەکان (ئیلاهیاتناسەکان) واتە ئەوانەی سەرقاڵی عەقلاندنی عەقیدەی ئایینن و عەقلانیەتی پێدەبەخشن، خۆیان وەکو خزمەتکاری ئاین تەماشا کردووە، بەلام لەلایەن پەیڕەوانی ئەرسەدۆکسی ئایینییەوە وەکو خائن سەیرکراون، باوەڕیان وابووە عەقلاندنی ئایین ***religion*** مانای خۆبەدەستەوەدانی ئایینە لە بەرامبەر عەقڵدا و پێوانی حەقیقەت و ڕاستێتی ئایینە بە پێوەری عەقلانیەت، وە باوەڕیان وا بووە کە ئەم کارە لانیەکەم گومانێکە و ئەنجامدانی بێ سودە. باوەڕداران سووربوون لەسەر ئەوەی کە وەحی بۆ یارمەتیدانی عەقڵ هاتووە، پاشان چۆن توانرا ئەم پەیوەندییە بە بوونی وەحییەك یارمەتی عەقڵ بدات بەرقەراربکرێت؟

هەندێك لەمەش زیاتر دەڕۆن و دەڵێن: مۆمی عەقڵ لەسەردەمی تاریکی پێشهاتنی وەحیدا سوودی هەبوو، بەلام کاتێك خۆری وەحی هەڵهات، ئیدی مۆمی عەقڵ دەبوو کۆتایی پێبێت.

بێگومان، هاوکاری نێوان عەقڵ و وەحی (سروش) یەکێك بووە لە ئختیارەکان. بەو مانایەی ئەو خودایەی کە عەقڵی دروست کردووە هەمان ئەو خودایەیە وەحی بۆ ناردووین و بناغەی ئەم هاوکارییەی داناوە.

زۆرێك لە فەیلەسوفە مەزنە مەسیحی و ئیسلامییەکانی وەکو ئبن سیناو فارابی و تۆماس ئەکویناس خاوەنی ئەم تەرزە لە بیرکردنەوەن. سەدرەدین شیراز، فەیلەسوفی ئێرانی سەدەی (27)هەم دەگاتە ئەوەی بڵێت "تیاچوون بۆ ئەو فەلسەفەیەی کە ئایینی خودا پشتگیری ناکات". قوتابخانەی موعتەزیلەی دیناسی ***theology***، کە بەداخەوە لەسەر دەستی نەیارە ئەشعەرییەکانی دووچاری شکستێکی مێژوویی وێرانکەر بووە، لەسەر بنەمای گونجانی عەقڵ و ئایین دامەزراوەو هەروەها پەیوەندی باشی لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا هەبووە. خوای موعتەزیلەکان خوایەکی دادپەروەرو ئەخلاقی بووەو هەموو ڕەفتارەکانی لەگەڵ پێودانگە عەقلانییەکاندا گونجاوبووە. موعتەزیلەکان هەمان تێگەیشتنیان بۆ پێغەمبەر و وانەکانی هەبووە. عەقڵ لەم قوتابخانەیەدا هێندە قەڵەو بووە ئایین لە بەرامبەریدا لاواز دەرکەوتووە، بە پێچەوانەوە، قوتابخانەی ئەشعەری دیناسی (ئیلاهیاتناسی) ئاینێکی قەڵەوو عەقلانیەتێکی لاوازی هەبووە. بەلام سۆفییەکان بەش بە حاڵی خۆیان تەواو دەستەیەکی جیاواز بوون، ئەوان عەشقێکی قەڵەویان هەبووە و لە بەرامبەریشدا ئایین و عەقڵ لاواز دەرکەوتوون.

بە هەرحاڵ، دۆزینەوەکانی عەقڵی ئەزموونی لە ئەوروپای سەدەی شانزدەهەم و حەڤدەهەم و پێکدادانی نێوان زانست و پەرتوکی پیرۆز بوو بە هۆی لە پرتاو زیندوو کردنەوەی جەنگی چالاکی نێوان عەقڵ و وەحی و جارێکی تر شەپۆلە ترسناکەکانی خۆی لەم زەریایەدا

ووروژاند. باوەڕم وایە ئەم پێکدادانە بوو بە مایەی خێر بۆ هەردوولا (ئاین و زانست) چونکە هەردوولای فێرکرد زیاتر خاکی بن و بانگەشەکانیان کەم بکەنەوە و زیاتر هەستیار بن لە بەرامبەر ئالۆزی ئەو حەقیقەتانەی کە لە بوارە جیاوازەکاندا کەشف دەکرێن. بێگومان بەردەوام بوونی ئەم جەنگە ڕێگەی خۆشکرد بۆ سەرەتای دەرکەوتنی سیکۆلاریزمی گەشەکردوو، ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ دەرکەوتنی پرۆتستانتیزم و ڕوودانی پێکدادانە خوێناوییەکان لە نێوان مەزهەبە مەسیحییە جیاوازەکان. وە دەوڵەتانیش دەستیان کردە بانگەشەی بێ لایەنی لە بەرامبەر ئایینەکاندا و هەژموونی یەك ئایین بەسەر ئەوانی دیکەدا ڕەتکرایەوە.

هەرچەندە، وەحی ئیسلامی ناوبەناو مامەڵەی دروست و ناوبەناویش مامەڵەی نادروستی کردووە لەگەڵ عەقڵی نادینیدا (بەتایبەتیش عەقڵی فەلسەفی/ یۆنانی)، بەلاّم وەحی ئیسلامی هەرگیز لەگەڵ عەقڵی ئەزموونیدا *reason empirical* بەرەنگار نەبۆتەوەو ئەمەش لەبەر هۆکارێکی سادە چونکە زانستی ئەزموونی نوێ لەناو موسڵماناندا گەشەی نەکردووە. لەبەرئەوە موسڵمانان نە لە خراپییەکانی ئەم جەنگە (جەنگی نێوان زانست و ئایین) زەرەرمەندبوون و نە لە باشییەکانی ئەم جەنگە سوودمەند بوون. کاتێك زانستی پێشکەوتوو لە سەدەی نۆزدەو بیستدا گەیشتە ناوچە ئیسلامییەکان، لەجیاتی ئەوەی خەڵکی تووشی لەرزین بکات، وایکرد خەڵکی دڵخۆش بن کاتێك بینییان لایەنی براوە (زانستی نوێ) بەسەر مەسیحیەتدا زاڵ بووە و ئێستا لەگەڵ ئیسلامدا لە پەیوەندییەکی دۆستانەدایە، زۆر گرنگە تێبینی بکرێ کە زانست و فەلسەفەی نوێ لە ناوچە ئیسلامییەکاندا لە زۆرترین کاتدا دووچاری ڕێگری و بەربەرەکانی نەبووە.

هەر لە سەرەتاوە، دەرگای زانکۆکان و پاشانیش دەرگای پەیمانگاکان بەڕووی زانستو فەلسەفەی نوێدا ئاوەلاّکراوەو بوونەتە بابەتی لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ. لە ئێرانیش لە دوای شۆڕشی ئیسلامییەوە هەمان شت ڕوویدا. بیرمە لە پاش شۆڕش، کاتێك ئەندامی پەیمانگای فەرهەنگی شۆڕش بووم، ڕۆژنامەنوسێکی ئیتالّی لە چاوپێکەوتنێکدا پرسیاری لێکردم: ئایا تیۆریەی پەرەسەندن *Theory of evolution* لە مەنهەجی زانکۆکاندا لادەبرێت. پێم ووت کە نەخێر لانابرێت، پاشانیش، بۆچوونێکی لەو شێوەیە هەرگیز نەیەخەی منی گرت و نەهاوکارەکانم واتە داوای لابردنی ئەو تیۆریایە نەکرا لەلایەن هیچ کەسێکەوە. بێگومان لەم ڕووەوە، پێویستە مارکسیزم بە جیا سەیرکەین چونکە هەمیشە ڕوحانییەکان *clerics* مارکسیزمیان وەکو تیۆرییەکی مادەگەراو دژە - دینی سەیر کردووە.

ئەمڕۆ بزوتنەوەی ڕۆشنبیرە ئایینیەکان لە ئێران لە هەوڵی بەردەوامدان بۆ سەرلەنوێ ناساندن و پێناسەکردنەوەی پەیوەندی نێوان عەقڵ و وەحی. وە بۆ ڕاڤەکردنی پەرتوکی پیرۆز (بەتایبەتی قورئان) سود وەردەگرن لە هێرمونتیکای نوێ و ئەو ئەزموونەی کە

مەسیحیەت *Christianity* هەیەتی و بەدەستی هێناوە. وە بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی پاپاوە، لە جیاتی ترسان و تۆقێن لە ڕاڤە فرە و زۆرەکانی قورئان و ڕەچاوکردنی ئەم فرە ڕاڤەکردنانە وەکو پێشێلکردنی ئەو ڕاستییەی کە قسەکانی قورئان وەحی ئیلاهین، ئەم رۆشنبیرە ئایینیانە باوەڕیان وایە کە ئیسلام لە بنەڕەتدا لەم فرە ڕاڤەکردنانە *multiple interpretation* پێکهاتووە و کارێکی سەد لەسەد مەحاڵە بگەینە کاکڵی یاخود ناوەڕۆکی پوختی ئایین.

## عەقڵ و عشق

ترادسیۆنی دەوڵەمەند و فراوانی عیرفانی ئیسلامی بەرهەمی پەرچەکردارەکان بوو لە بەرامبەر دوو شتدا: یەکەم: پەرچە کردارێك *reaction* لە بەرامبەر ڕابواردن و کۆڕی شەوانەو گەندەڵی و مادەگەرایی و لەزەت بازی بێ سنورو بەرەلاییانەی دەسەڵاتی خەلیفە ئومەوی و عەباسییەکان. پەرچەکردارێکیش لە بەرامبەر خودای ترسێنەر و ستەمکارو دەسەڵاتداری ڕەهای ئەشعەرییەکان و لادانە فەلسەفییە زۆر و توندەکانی موعتەزیلەکان لە بەرامبەر کردار و سیفاتەکانی خودادا بە تایبەتی سیفەتی عەدالەتی خودا. پەرچەکرداری یەکەم عیرفانی زوهدی *ascetic Sufism* بەرهەمهێناو پەرچەکرداری دووەمیان عیرفانی عشقی *love Sufism* بەرهەمهێنا.

عیرفانی عشقی هەردوو عەقڵ *Reason* و ترس (*fear*)ی ڕەتکردەوە. واتە داوای خۆشویستنی خودای کرد نەك ترسان لە خودا. داوای مەست بوون و مەدهۆشبوونی کرد لە بەرامبەر خوادا، وەك عاشقێك *lover* مەدهۆش و حەیران بین لەبەردەم مەعشوقدا *Beloved*، نەك کەشفکردنی خودا وەکو ئەوەی فەیلەسوفێك سەرقاڵی دۆزینەوەی وەڵامی مەتەڵێك بێت. مەنسوری حەللاج عارف گەورەو ناوداری سەدەی نۆیەم، جەوهەری کورتکراوەی ئەم شێوازەمان بەم شێوەیە بۆ بەیان دەکات: "مەعشوق پڕە لە جوانی و جیلوە و سەرنج ڕاکێشی نەك لە نهێنی". بەمانایەکی دیکە، خودا بابەتێك نییە بۆ عاشقەکان و کۆتایی چیرۆك نییە. عشق بەم مانایە جەنگکردنە لەگەڵ عەقڵدا. لەوانەیە ووشەی "جەنگ *war*" کەمێك توند دەربکەوێت، بەڵام بە قوڵبوونەوە لە کاری عارفەکاندا، لەم مانایە زیاتر هیچی دیکە ناگەیەنێت.

عشق بوو بە نەیاری هەم عەقڵی تیۆری و هەم عەقڵی کردەیی، لەلایەکەوە، عارفەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە عشق چاوانێك بە عاشق دەدات بتوانێت دیمەنەکانی ئەودیو سنوری عەقڵ ببینێت. گەورەترین عارف و شاعیری ئێران/ ئەفغانی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لە ساڵی 1234 لەدایك بووە، بە گەورە و هاوڕێی خۆشەویستی خۆی شەمسی تەبریزی دەڵێت "شەمسی تەبریزی، عشق دەتوانێت شت فێری تۆ بکات، نەك عەقڵ"، واتە عشق مەعریفەت پێدەبەخشێت. توانای دۆزینەوەت پێدەبەخشێت و دۆزینەوەکانی عشقیش زانیاری و توانای ئیدراکی زیاددەکەن. لەلایەکی دیکەوە، عارفەکان باوەڕیان وایە کە عەقڵ مەخلوقێکی خۆپەرست و بەرژەوەندی خواز و

خۆپارێزە و بەرگەی بێ خودی و بەخشندەیی و خۆ فیداکردن ناگرێت، لە کاتێکدا عشق خۆویستی دەگەیەنێتە ئاستی سفر، واتە "نەفس دەکوژێت"، وا لە عاشق دەکات بەخشندە و دڵخۆش و پاراوو ئازاو پڕووزە بێتو هەموو دەردە ڕوحییەکانی چارەسەر دەکات. هەرچەندە ئەم عشقە کرۆکی دینداریيە *religiosity* بەڵام لە ڕاستیدا دەکەوێتە دەرەوەی ئەرکەکانی باوەڕدارەوە، واتە بەشێك نییە لە ئەرکەکانی باوەڕدار. زۆرینەی باوەڕداران داوای هەندێك سوود و خەڵات دەکەن لە دینداریيەکەیان، واتە مامەڵەیەکی بەرژەوەندی خوازانە لەگەڵ دینداریيەکەیاندا دەکەن. هەرچەندە ئەم دینداریيە بەرژەوەندی خوازە لەگەڵ ناوەرۆکی ئاییندا پێچەوانە نایەتەوە، بەڵام زۆر دوورە لەو پلە باڵایەی عاشقەکان بە دەستی دەهێنن، ئەو عاشقانەی سنوری بەرژەوەندی و سودەکانی خۆیان تێدەپەڕێنن و ڕەوتی گەمەو قوماری عاشقانەی خۆیان دەگرنەبەر.

عیرفانێك *Sufism* کە لەسەر ئەم جۆرە عشقە بنیاتنرابێت نزیکترە لە وەحییەوەو زیاتر یاخود کەمتر پەیامبەران وەکو ئەو عارفە مەزنانە تەماشا دەکات کە بەرهەمی قوڵبونەوە ڕوحییەکانی خۆیان خستۆتە ئختیاری مرۆڤەکانەوە، لە کاتێکدا ئەو عارفانەی *mystics* کە پەیامبەر نین ئەم پەیامەیان پێ نییە. بەهەر جۆرێك بێت، پەیوەندی نێوان عیرفان و فەلسەفە یاخود عشق و عەقڵ بەهەمان شێوەی پەیوەندی نێوان عەقڵ و وەحی پەیوەندییەکی سازگار و نەرم و نیان نەبووە. هەروەکو چۆن فەیلەسوفە موسڵمانەکان سودیان لە وەحی وەرگرتووە، بە هەمان شێوەش سودیان لە عیرفان وەرگرتووەو هیچ کام لە عیرفان و وەحییان بە پێچەوانەی عەقڵی پەتی نەزانیوە. کەمترین شت کە لێرەدا دەکرێت بگوترێت ئەوەیە کە فەیلەسوفەکان ئەو بەرهەم و دۆزینەوە عیرفانییانەیان وەرگرتووە و تەوزیف کردۆتەوە کە کۆمەکییان کردوون بۆ کاری عەقڵانی و فێری بێدەنگیان کردوون لە باقی کاتەکانی دیکەدا. بەڵام عارفەکان ئەو زەینانەیان *minds* قبوڵکردووە کە خاڵییە لە فەلسەفە و پێیان وابووە قوڵبونەوە فەلسەفییەکان و "پەیوەست بوون بە هۆکارەکانەوە" دەبنە مایەی ناسازگاری و نەگونجان لەگەڵ مەقامی عاشق. لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە تێڕوانین و تێگەیشتنی پێش – چەمکی/ پێش – تیۆریانەی عارفەکان توانراوە بخرێتە ناو چوارچێوەو تێگەیشتنی چەمکییانەی کەسی فەیلەسوف، بەڵام هەر بەچوونە ناوەوەیان بۆ ناو ئەو چوارچێوەیە، ناوازەیی و ڕاستێتی خۆیان لەدەستداوەو ئەمەش وای لە عارفەکان کردووە لە فەلسەفە دوور بکەونەوە. ئەوەندەی من کارم کردبێت لە فەلسەفە و عیرفاندا و وانەم وتبێتەوە، هەموو ژیانی خۆم لە ناو جەرگەی ئەم دووانەدا گوزەراندووە و سەرنجی قوتابییەکانم ئاڕاستە کردووە تابیبینن بە چ شێوەیەك ئەم دووانە گەمەی خۆیان کردووە و بەرزو نزمیان نیشانداوە. بە دەگمەن ڕێکەوتی کەسێکم کردووە کە توانیبێتی تەحەمولی جەنگی نێوان ئەم دووانە بکات و دەستی لێ بەرنەدابن. لە کۆتاییدا یان

ئـەوەتا عـەقڵ بردوویەتییـەوە یـاخود عـشق، جـار جـاریش عـشق بـەهێزتر بـوونی خۆی سەلماندووە.

**عەقڵ و شۆڕش**

شۆڕش *Revolution* تەقینەوەیەکی بەهێزی ڕقو کینە *Hatred* و وزەی دەرپەڕیوی ئەم سۆزە وێرانکەرەیـە. وە شـۆڕش هـیچ هۆگرییـەك و تەباییەك نیشانادا لە بەرامبەر سازگاری عەقڵی شـیکاریدا *analytical reason*. چ هۆگرییـەك *affinity* هەیـە لـە نێـوان ڕقێـك کـە دەیهـەوێت ترادسـیۆنەکان و دەسـەڵاتی پاشـایەتی و شـکۆمەندی.. هتـد وێـران بکـات و عـەقڵێك کـە دەیهـەوێت بزانێت و تێبگات؟ لە شۆڕشەکاندا، عشق و سۆزەکان تاڕادەیەکی زۆر ماف خۆیـان پێدەدرێت، بەڵام عەقڵ بەسەلامەتی دەرناچێت. کاتێکی زۆر هەیە پێش هەر شۆڕشێك بۆ ئەوەی ڕابەرانی شۆڕشەکە بگەڕێنەوە بۆ عەقلانیـەت و بونیاتنـان و ڕێگـرتن لـە وێرانکـاری. بۆئـەوەی شۆڕشـەکان دادپـەروەربن، ناکرێـت بـەبێ عەقلانیـەت ئەنجامبـدرێن، بـەڵام لـە زۆرینـەی بارەکانـدا، عەقلانیەتەکـەیان لـە شـێوەی ڕەتکردنـەوەی عەقلانیـەتێکی بـەردەوام و لەبـەر ڕۆیشتوودا خۆی بەیانکردووە. شۆڕشگێڕەکان دەزانـن ڕووبـەڕووی چـی دەبنـەوە بـەڵام نـازانن چـییان دەوێـت. شۆڕشـگێڕەکان ئایدیالیـستگەلێکی تـوڕەو بەهەڵەشـەن کـە خۆیـان هەڵدەخەڵـەتێنن بـە شـتگەلێکەوە کـە گوایـە دەتـوانن بـە دەسـتی بێـنن. خـەیاڵی ئـەوە دەکـەن کـە گوایـە دەتـوانن لـە پـڕدا ترادسـیۆنەکان و مرۆڤـەکان بگـۆڕن و بـە ترادسـیۆن و مرۆڤـی نـوێ شـوێنیان بگرنـەوە.

هـەموو شۆڕشـەکان تـا ئاسـتێك ئانارشـستین *anarchist*، هـەر شۆڕشـێك پێکهاتەیـەکی ئانارشیزمی تێدا نەبێت، شۆڕش نییە.

شـەبەنگە ڕەنگاوڕەنگەکـەی حەقیقـەت دادەبەزێتـە ئاسـتی تـاکڕەنگی و هـەموو شـتێك دادەشکێت بـۆ ڕەش و سپی: رابـردوو خراپـە، داهـاتوو چـاکە، دژە شـۆڕش خراپـە، شـۆڕش چاکە، وە هـەروەها.. لێـرەوە، دەرگـا لـە بـەردەم عـەقڵی شـیکاریدا دادەخرێـت، ئـەم عەقڵـە پێویستی بە فەزا و مەیدانێکی زیاتر شیکاری و واقعگـەرایی هەیـە وەك لـەو فەزایـەی شـۆڕش ئامادەی دەکات. لە شۆڕشدا، تەنها یەك پێوەر هەیـە بـۆ چـاکە *good* و خراپـە *bad*، ئـەویش خـودی شۆڕشـە. هـەر ئەمـە یەکـسانە بـە لـەباربردنی هـەموو پێوەرەکـان: نـەك تـەنها شۆڕش چاکە، بەڵکو شۆڕش یەکسانە بە چاکە واتە شۆڕش خودی چاکەیە، چاکە شتێك نییە جگـە لـە شـۆڕش! کاتێـك شـتێك دەبێتـە تاکـە پێـوەر، ئیـدی ناعەقلانیـەت *irrationality* دەسـتبەکار دەبێـت. ئـەرکی کەسـانی عاقـڵ لـە جەرگـەی شۆڕشـەکاندا پێـچەوانەکردنەوەی شـەپۆلی شۆڕشـگێڕییە کـە نییـە، چـونکە ئـەم کارە لە توانای ئەواندا نییە، بەڵکو ئەرکی ئەوان بریتییـە لـە کەمکردنـەوەی وێرانکـاری*destruction* و ئاراسـتەکردنی ووزەو تواناکـان بـەرەو ئاوەدانکردنـەوەو بنیاتنانەوەو دوورکەوتنەوە لە ئاژاوە *chaos* و وێرانکـردن. بـەو پێیـەی خـۆم ئـەزموونم هەیـە لـە شۆڕشـدا و چـەندین لێپرسـراوێتیم لـە شۆڕشـدا وەرگرتـووە، هـەر زوو دەرکـم بـەم ڕاستییە کردووە.

هـــەر کەســـێك شۆڕشـــی بینیبێـــت هەســت دەکــات کــە هــەموو ئــەو کەســانە شایانی سەرزەنشت کردنن کە هیچ ئیختیارێك جگـــە لـــە پەنابردنـــە بـــەر شـــۆڕش بـــۆ خەڵکی ناهێڵنەوە.

یەکەم سەرچاوە کە لە شۆڕشدا لە دەست دەچـێت بریتییـە لـە عەقڵانیـەت و دواهـەمین شتیش کە دەگەڕێتەوە (ئەگەر بگەڕێتەوە) هەر عەقڵانیەتـە. لـەم سـێ نـەیارەی عـەقڵ: وەحـی، عەشـــق، شـــۆڕش، ســـێهەمیان (شـــۆڕش) دڵرەقترینیانەو عەقڵ تێکدەشکێنێت. وەحی کەم و زۆر ئـاڵوگۆڕێکی مێـژوویی گونجـاوی لەگـەڵ عەقڵـدا ئەنجامـداوە کـە ئـەم ئـاڵوگۆڕە دەکرێـت سوودمەندبێت بۆ هەردوولا. عشقیش هەمیشە چاکەیەکی دەگمـەن بووە و کەمینەیـەکی بچوك بوونەتــە خــاوەنی. وە عــشق چــالاکی و ووزە دروسـت دەکـات و نەبۆتـە هـۆی دروسـتبوونی توندو تیـژی. لەگـەڵ رووبەڕووبوونـەوەی شۆڕشـە گـشتگیرەکاندا، ئـەو شۆڕشـانەی کـە هـەڵگری جـوانی عەشـق و پـیرۆزی وەحـی نـین، تـەنها دەتـوانین پـەنا بـۆ خـودا بـەرین، چـونکە ئـەو شۆڕشـانە خـەڵکی لـە ژیـان و عـەقڵ بـێ بـەش دەکــەن. کەســە ژیرەکــان لــە هــەر جڤاتێکــدا ئـــەرکێکیان هەیـــە ئـــەویش ئاڕاســـتەکردنی کارنامە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانە بـەرەو هێنانەکایـەی سیـستەمێکی عـەقڵانی و دادپـــەروەر بۆئـــەوەی هـــەرگیز پێویـــست بـــە وێرانکردن و ناعەقڵانیەتی شۆڕشگێڕی نەکات. کەسـە ژیرەکـان پێویـستە دادپـەروەری *Justice* بڵاوبکەنـــەوە بـــۆ ئـــەوەی لـــە شۆڕشـــکردن بەدوور بن.

**سەرچاوە**

www.drsoroush.com

# ژنانی فەلەستین

زهیرە کەمال
لەعەرەبییەوە: کنێر عەبدوڵڵا

## ژنانی فەلەستین و بڕیارسازی لە ساڵانی 1978-1992

ژنانی فەلەستین لە میانەی کارەکانیاندا و لە چوارچێوەی خەباتی ڕامیاری –کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریدا دژ بە داگیرکەران شێوازێکی نوێخوازی و داهێنەرانەیان هێنایە گۆڕێ و شێوەی کارەکانیان خۆبەخشانە لە سەرەتای حەفتاکاندا بووە کرۆکی کارکردنیان ، لە کۆتایی حەفتاکاندا کارەکانیان گەشەکردنی بەخۆوە دی لەسەر ئاستی جەماوەری ژنان، ڕۆژنامەگەری، کشتوکاڵی و یەکێتی و سەندیکا جۆربەجۆرەکان. وە لە ساڵی 1983دا چوار لایەنی ژنان کە نوێنەرایەتی چوار ئاراستەی ڕامیاریان دەکرد لە مەیدانی کارکردندا بوون، بەوشێوەیە ڕێکخستنی ژنان لەڕووی ڕامیارییەوە بووە دەروازەیەك و هەوڵی زیادکردنی چالاکانە و بەشداریکردنیان دەکرد لە بۆنە نیشتمانییەکاندا، وە لە ساڵی 1987دا ژمارەیان ڕووی لەزیادبوون کرد و بوونە شەش لایەن و بەو شێوەیە ڕێژەیەکی بەرفراوانی ژنانیان ڕێکخست لە سەرجەم شار و گوند و کۆمەڵگە زۆرەملێکاندا بڵاوبوونەوە وەکارەکانیان خستە پێناو خزمەتکردنی جەماوەری فەلەستین. بەو شێوەیە ژنان بوونە جێی باوەڕ و متمانەی کۆمەڵگەیان بەدەست هێنا.

بەشداریکردنی ژنان لە فەلەستیندا بەشێوەیەکی ئاشکرا و دیار لە ڕاپەڕینی ساڵی 1987 دا بەدەرکەوت و هەر لە سەرەتاوە ڕۆڵێکی سەرەکیان بینی و بوونە جێی سەرنجی چاودێرەکان بەشێوەیەك گەر بەشداربوونی ئەوان نەبوایە ڕاپەڕینەکە بە سەرتاسەری ناوزەند نەدەکرا بەوەی توانیان ڕۆڵێکی چالاکانەیان هەبێت لە پێکهێنانی لیژنەی جەماوەری و لەسەر ئاستی ناوچەکاندا خزمەتگوزاری جۆربەجۆریان لە گشت بوارەکانی تەندروستی، خوێندن و چاودێری

کۆمەڵایەتیدا پێشکەش بە جەماوەر کرد ئەوەش لــەڕێی خــەباتی جۆربــەجۆری راســتەوخۆ و ناڕاســـتەوخۆوە بـــوو بـــۆ ڕوبەڕوبونـــەوەی داگیرکـــەران، بەرەنگاربونەوەکـەیان بـووە هـۆی دەستبەسەراگرتنی 433 ژن لە نێوان ساڵەکانی 1990-1997 بـۆ مـاوەی یـەك مـانگ تـا هـەتا هــەتایی ئــەوە جگــە لــە دەستبەســەراگرتنی نزیکــەی 1000 ژن ســاڵانە لەلایــەن دەســەڵاتی داگیرکەرانەوە لە نێوان کاتژمێرێك بۆ ڕۆژێك یان مانگێك، ئەمە وێڕای دورخستنەوەی 250 ژن و منــداڵ بــۆ دەرەوەی وولات لەلایــەن دەســەڵاتی داگیرکەرانــەوە لــەو ماوەیــەدا. ئــەو شــێوازی بەشــداریکردنەی ژنــان یارمەتیــدەر بــوو بــۆ تەشــەنەکردنی هۆشــیارییەکی نــوێ لای ژنــان و بەشێوەیەکی تایبــەتی ئــەوەی پەیوەندیــدارە بــە ڕۆڵ بینینێــوە لــە کۆمەڵــدا کــە ئامــانج لێــی چــالاککردنی ڕۆڵــی ژنانــە لــە بنیادنــانی کۆمەڵگەیـــەکی شارســـتانی دیموکراســـی بەشێوەیەك باوەڕی بە بیروباوەڕی یەکسانیی و دەرفــەتی وەکیــەکی هــەبێت لــە نێــوان پیــاوان و ژنانــدا کــە بــە هۆیــەوە زۆرێــك لــە چــەمکە بــاوە کۆمەڵایەتییـــەکان لـــە مـــاوەی راپەرینـــدا نزمبونەوەیەکی بەرچاویان بەخۆوە دی بەدەر لە گرنگێتی بەشداریکردنی ژنان لە سەرکردایەتی ڕامیاریـــدا گـــەر لەدەســـتەی ســـەرکردایەتی حزبــەکان بێــت یــان ســەرکردایەتی نیــشتمانیی یەکگرتوی راپەریندا بێت، هەموو ئەو باسانە و چـــەندین باســـی تـــری تایبـــەت بـــە ژنـــان بوونـــە گفتوگـــۆی نێـــو کـــۆنگرەی ڕاپـــەرین کە لە لایـەن دامـەزراوی بیـسان بـۆ توێژینـەوە لـە کـانونی یەکـەمی سـاڵی 1990 دا سازیکرد، هـــەروەها کـــۆنگرەی ژنـــانی دادپـــەروەری و یاسا کە لە لایـەن دامەزراوی ماف و هاوکاری بەڕێوەچـــوو لەگـــەڵ ســـەرجەم لایـــەن و دامــەزراوەکانی ژنــان لــە ســاڵی 1992. ئەمــە وێـــڕای ئـــەوەی ئـــەو قۆناغـــە بـــووە هـــۆی سـەرهەڵدانی ژمارەیـەك لـە سـەنتەری پسپۆری ژنــان وەك ســەنتەری لێکۆڵینــەوەی ژنــان لــە ســاڵی 1989 و ســەنتەری ژنــان بــۆ ڕێنمــایی یاســایی و کۆمەڵایــەتی لــە ســاڵی 1991 کــە هەریــەك لــەو ســەنتەرانە پێــشنیاریان هــەبوو لەســـەر مەســـەلە کۆمەڵایەتییـــەکانی ژنـــان بـــە تایبەتی و کۆمەڵگە بە گشتی.

## ژنان و بڕیارسازی لە ساڵی 1992 وتا ئیمرۆ

لەگـەڵ دەسـتپێکردنی دانوسـتان لـە نێـوان فەلەســـتین و ئیـــسرائیلیەکاندا لـــە تـــشرینی دووەمـــی ســـاڵی 1991 و پێکهێنـــانی چـــەندین تیمی هونەری، ژنان چالاکانە بەشداریان هەبوو لەســـەر داخوازییـــەکانیان، بـــۆ ئـــەو مەبەســـتە لیژنــەی کاروبــاری ژنانیــان پێکهێنــا وەك یــەکێك لـــەو تیمانـــە لـــە پێنـــاو پـــشتیوانیکردن و بەشداریکردنیان و بۆئەوەی بەشداریان هـەبێت لە پلانڕێـژی و بەرنامـەی نیـشتمانیدا لـە گـشت بوارە جۆربـەجۆرەکانی (خوێندن، تەندروستی، کار، ئابوری و کشتوکاڵی... هتد). جگـە لـەوەی ژمارەی ژنانی بەشداربوو لەکۆی 300 ئەندامی تیمە هونەرییەکان تـەنها شـەش ژنیان تێدا بـوو بەڵام سەرئەنجامی ئەو هەوڵانەی لەلایـەن تیمـی کاروبــاری ژنانــەوە درا ڕێــژەو ژمــارەی ژنــانی

بەشداربوو ڕووی لە زیادبوون کرد و گەیشتە 66 ژن لە کاتێکدا ژمارەی گشتی لە تیمە هونەرییەکاندا 366 کەس بوون بێ ئەژمارکردنی ژنانی بەشداربوو لە تیمی کاروباری ژناندا، هەر لەو ماوەیەدا کار بۆ نوسینەوەی ڕەشنوسێکی یاسایی کرا کە تیایدا وەك بەندێکی سەرەکی ئاماژەی بە هیچ بیروباوەرێکی یەکسانیی نەکردبوو بۆیە ژنان لە دەرەوە و لەسەر ئاستی یەکێتی گشتی ژنانی فەلەستیندا دەستیان کرد بە جوولە و نامەیەکیان ئاراستەی سەرۆك عەرەفات کرد سەبارەت بە چەسپاندنی بیروباوەڕی یەکسانیی وەك بەندێکی سەرەکیی لە دەستوردا ئەمە جگە لە بزوتنەوەو جوولەی ژنان لە ناوخۆدا و لەسەر ئاستی لایەن و کۆمەڵەکانی ژنان وێڕای سازکردنی کۆبونەوەیەك لەگەڵ دکتۆر (ئەنیس قاسم) کە وەك سەرۆکی لیژنە ڕاسپێردرابوو بە ئامادەکردنی پرۆژەیەکی یاسایی، لە میانەی ئەو هەولانەدا ژنان توانیان لەو ڕێگەیەوە سەرنج و تێبینییەکانیان لەسەر بەندەکانی یاسا بەگشتی و مەسەلە پەیوەندیدارەکانی بە یەکسانیەوە هەیە بە تایبەتی بخەنە ڕوو ئەوەش بۆخۆی یارمەتیدەر بوو لە گۆڕانکاری ڕەشنووسە دەستورییەکەدا بەشێوەیەك هەندێك ناوەرۆکی لەخۆگرت کە پەیوەندیدار بوو بە یەکسانیی لە نێوان ڕەگەزەکاندا. لەگەڵیدا بەڵگەنامەیەکی یاسایی هاوپێچ کرا و تیایدا سەرجەم ئەو مەسەلانەی لە خۆگرتبوو کە ژنان خوازیاری جێبەجێکردنین لە چوارچێوەی دەوڵەتی فەلەستیندا ئەوەش لە مانگی ئابی 1994دا بوو کە سەرجەم لایەنەکانی بزوتنەوەی ژنان تیایدا بەشداربوون. ئەوەی پێشتر باسی لێوە کرا دەریخست کە ژنان لە درێژەی خەباتی نیشتمانیدا هاوبەشی پیاوانیان کردووە و سەرجەم دامەزراندنی دامەزراوەکان لە پێناو خزمەتکردنی ئەو ئامانجانەدا بوون بەلام لەسەر ئاستی یاسایی و سەندیکایی بارودۆخەکە وەك خۆی مایەوە سەرەڕای ئەوەی ڕێژەی خوێندەواران بە شێوەیەکی دیارو ئاشکرا ڕوویان لە زیادبوون کرد وێڕای زیادبوونی ڕێژەی ژنان بە شێوەیەکی کەم لە کاری بەرهەمهێندا و بوونی جیاوازی لە کرێی ڕۆژانەیان لەگەڵ پیاواندا، وەدەتوانین ئەوە بڵێین کە تا سەرەتای نەوەتەکان هیچ دەرچوویەکی ئاشکرا نەبوو سەبارەت مەسەلەو بەرنامەکانی ژنان بۆ جێبەجێکردنی داخوازییەکانیان.

### بوارەکانی ژنان پێی نەگەیشتن لە بڕیارسازیدا

نموونەی توێژینەوەکە تایبەت بوو بەو ژنانەی لە ناوەندەکانی بریارداندا بوون ئەوەش بەپێی ئەزموونی کارکردنیان و زانینی ئەو بوارانەی پێیان وایە ژنان نەگەیشتونەتە ناوەندی بریاردان و هۆکارەکانی ئەوەش هەروەك لە خشتەی داهاتوودا دەردەکەوێت بەوەی:

- بواری دارایی و کارەکان لە هەمووی دووبارەترە بە ڕێژەی 62.1٪.
- بواری زانست و تەکنەلۆژیا 57.6٪.

- بواری کاری سیاسی 48.5٪
- بواری یاسایی 47٪.
- بواری سەندیکایی 30.3٪.

ئەو دەرئەنجامانە واقعی راستەقینەی ژنان پێچەوانە دەکەنەوە چونکە ڕێژەیەکی زۆری ژنان تا ئێستا کارناکەن ئەمە جگە لەوەی بواری کارەکان تا ماوەیەکی زۆر نزیک لە پیاواندا چڕکرابۆوە ئەوەش پەیوەندی بە خاوەنداری و ڕۆڵی ئابوری تاکەکانەوە هەبوو، سەرەرای ئەوەی دەرفەتی زانست و تەکنەلۆژیا بوارێکی جیهانیی نوێیە و پێویستە ژنان بەئاگا بن لێی کە دەشێت تەنها پێویستی بە زانست و خوێندن و ژیرییەوە هەبێت بۆ ئەوەی بتوانیت لە ڕێگەیەوە بوونی خۆی بسەلمێنیٚ، هەروەها ڕێژەی 48.5٪ ی تاکەکانی نموونەکە پێیان وابوو ژنان نەگەیشتونەتە ئاستی ناوەندی بریار لە کاری رامیاریدا ئەمە جگە لە ڕێژەی 30.3٪ ی تاکەکانی نموونەکە کە پێیان وابوو ژنان ناگەنە ناوەندی بریار لە کاری سەندیکاییدا کە بوارێکی رامیارییە و مەسەلەیەکە جێی سەرنجە چونکە ژنانی فەلەستینی کە خەباتیان کرد لە پێناو سەربەستی و ئازادیدا و تێکەڵبوون بە کاری سیاسیەوە لەڕێی ڕێکخراوەکان و بزوتنەوە سیاسیەکانی فەلەستین وە لە کاتێکدا بۆماوەیەك پێیان وابوو یەکسانیان بەدەست هێناوە بە قوربانیدان و بریارەکانی پەیوەندیداربوو بە خەباتیانەوە بەڵام کاتێك مەسەلەکە دەبەسترایەوە بە شوێنگەی سیاسی و پێگەی کۆمەڵایەتییەوە تەنها بە ڕۆڵی پیاوانەوە چڕدەکرایەوە، ئەوەی جێی سەرنج بوو ئەو ڕێکخراوانەی زۆرجار قسەکەر بوون لەسەر پیشکەوتن و یەکسانی بەرنامەکانیان بە شێوەیەکی تایبەت یەکانگیربوو لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی بێئەوەی هیچ بەندێکی بە شێوەیەکی دیاریکراو پەیوەند بێت بە ژنانەوە یان بە یەکێك لە ئامانجەکانی دەرفەتی وەکیەکی سەبارەت گەیشتنی ژنان بە ناوەندەکانی بریار لە نێوان ژنان و پیاوان لە پێناو پێدانی شوێنی مسۆگەر بۆ ژنان. ئەوە یەکێك بوو لەو بابەتانەی کە بایەخی خۆی هەبوو لە نێوان ژنان لە فەلەستیندا. ئەگەرچی تێڕوانینی جیاواز سەبارەت بەو بابەتانە هەبوو بە پێدانی ڕێژەیەکی دیاریکراوی ژنان لە هەڵبژاردنەکان یان ناوەندەکانی بڕیاردا، هەندێك پێیان وابوو بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی خودی ژنان و پێویستە بوونی خۆیان بسەلمێنن و خەبات بکەن لەپێناو گەیشتنیان بە ناوەندەکانی بریار. ئەو هەلوێستە زۆرێك لە پیاوان پشتیوانیان لێدەکرد بە جیاوازی شوێنەکانیانەوە لە ژێر دروشمی یەکسانیدا لە کاتێکدا بەشێکی تری پیاوان ئەو تێڕوانینانەیان ڕەتدەکردەوە لە ژێر دروشمی نا بۆ ولایەتی ژنان. ڕێژەی 44.3٪ ی ژنانی نموونەکە پێیان وابوو بواری کارکردنی یاسایی ئەگەرچی ڕێژەیەکی زۆری ژنانی پارێزەری لەخۆ گرتووە بەلام نەیانتوانیوە بگەنە ئاستی بەشداریکردن لە ناوەندی بڕیاردا جگە لەوەی ڕێژەیان لە بواری دادوەریدا کەم بوو هۆکاری ئەوەش بۆ داگیرکەران دەگەڕێتەوە کە ڕێگەیان بە بوونی دادوەری عەرەب نەدەدا ژن بوایە یان پیاو بەلام لەگەڵ وەرگرتنەوەی دەسەلاتی نیشتمانی ژمارەیەك لە ژنانی دادوەر

دامەزرێنران ئەوەش بە هەنگاوێکی لێپرسراوێتی ناوزەد دەکرا، بە تایبەت دامەزراندنی ژنان لەو بوارەدا بە شێوەیەکی گشتی لایەنێکی تازە بوو لەسەر ئاستی عەرەبی.

| بوارەکانی نەگەیشتنی ژنان بە ناوەندی بڕیاردان | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| بواری کاری سیاسی | 32 | 45.7 |
| بوای کاری یاسایی | 31 | 44.3 |
| بواری کاری سەندیکایی | 20 | 28.6 |
| بواری دارایی و کارکردن | 41 | 58.6 |
| بواری کاری تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو | 38 | 54.4 |
| بوارەکانی دیکە | 3 | 4.2 |
| بێ وەلاّم | 4 | 5.7 |

درککردن و هەستکردنی ژنان بە بوونی ئەو بەربەست و ڕێگریانە گرنگ بوو بگۆڕدرێ بە بەرنامەی کار. بۆ بەزاندنی ئەو دیاردەیە ئەوەش جێبەجێکرا، ماوەتەوە پشتیوانیکردن و وەرگێڕانی ئەو مەسەلانەی ئاماژەیان پێکرا وەك ئامانجی ستراتیجی نیشتمانی ژنان بۆ پلانی کار جگە لە بەدواداچوونی جێبەجێکردن و هەڵسەنگاندنی بەردەوام بۆی.

### هۆکارەکانی نەگەیشتنی ژنان
### بە ئاستی بڕیاردان

لە ڕێگەی لێکۆلینەوەیەکەوە کە سازکرابوو بۆ ڕاهێنانی کچان بە بواری کارکردن و پێشنیازەکانی لێیکەوتەوە دەرکەوت تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە تەرکیزیان خستبووە سەر چوار لایەنی سەرەکی پەیوەندیدار بە خوێندن، گەشەکردنی تواناکان، دابین کردنی زانیارییەکان و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و یاسادانان. بەو شێوەیە دەرکەوت مەودای یاسایی کە ئامرازێکە وێنای پەیوەندییەکان لە کۆمەڵگەدا دەنەخشێنێ هۆکارێك بووە لە هۆکارەکان پاشان بوونی دابونەریتەکان ڕێگرییەکی تری بەردەم ژنان بووە بۆ نەگەیشتنیان بە ناوەندی بریار پاڵپشت بە نەبوونی یاساکانی هەوڵی ڕێکخستنی هەموو ئەوانە بدات بە شێوەیەکی گەورە ریگربوون لەبەردەم زۆرێك لە ژنان سەبارەت گەیشتنیان بە ناوەندی بڕیار، خشتەی داهاتوو ئاماژە بە بوونی ئەو هۆکارانە دەکات کە پشتیوان بوون بۆ نەگەیشتنی ژنان بەو ناوەندانە بە شێوەیەك ڕێژەی 58.5٪ ی نموونەکە هۆکارەکەیان بۆ زاڵێتی دەسەلاّتی پیاوان گەڕاندوّتەوە لەو بوارانەدا ئەوەش پەیوەندیدارە بە دابەشبوونی ڕۆڵەکان لە نێوان پیاوان و ژناندا. بەوەی پیاوان لە دەرەوەی ماڵ بڕیاردەرن و ژنانیش لە ناوەوەی ماڵ، گەر ڕێگەیان پێدرا، ئەمە جگە لە ڕاکێشکردنی تێڕوانینی خراپی کۆمەڵگە لەسەر ژنان کە 56.9٪ ی نموونەکە پێیان وابوو تێڕوانینی کۆمەڵگە بۆ ژنان یەکێکە لە هۆکارەکان چونکە هەندێك لە هاولاّتیان وا تەماشای ژنان ناکەن کە کەسایەتیەکی خاوەن بریار بن بۆیە بەشێك لە ژنان وایان دەزانی کە دابینکردنی زانیارییەکان فاکتەرێکی گرنگە بۆ گەیشتنی ژنان بە ناوەندەکانی بڕیار و ڕێژەی 38.3٪ ی نموونەکە پێیان وابوو نەبوونی هۆشیاری تەواو و هۆشمەندی بەو بوارانە

یەکێکە لە هۆکارەکانی دیکە لەبەردەم ژناندا، ئەمە جگە لەوەی زۆرێك لەو وەزیفانە لەڕێی ریکلام و هەڵبژاردنەوە نەبووە بە پێی تواناو لێهاتوویی کەسەکە لە کاتێکدا 32.3٪ی نموونەکە پێیان وایە هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ژنان بەپێی پێویست لە ناوەندی خوێندنی باڵادا هەروەها ژمارەیەکی کەمی نموونەکە ئاماژەیان بە یاساکان و دەسەڵاتی یاسادانان کرد بەوەی دەبێتە ڕێگرییەکی گەورە لەبەردەم گەیشتنی ژنان بە ئاستی بەشداریکردن لە بڕیارداندا وە ڕێژەی12.3٪ ئاماژە بەوە دەکەن کە ژنان تا ئەو ئاستە هەست بە گرنگێتی یاساکان دەکەن لە ژیانیاندا چونکە لە ماوەی داگیرکردندا یاساکان ڕۆڵێکی سەرەکیان بینی دژ بە مییللەت بە شێوەیەکی گشتی و دەروازەیەك بوو بۆ سەندنەوەی مافی تاکەکان و کۆمەڵ کە دەشێت ئەوە هۆکارێکی دیکە بوبێت سەبارەت بە بایەخ نەدانی هەندێك لە خەڵکان بە یاساکان، وە لە تێڕوانینی ژنانی نموونەکەوە نەگونجانی هەندێك بواری کارکردن لەگەڵ سروشتێتی ژناندا کەمترین هۆکارە کە وادەکات ژنان نەگەنە ئاستی بڕیاردان.

| هۆکارەکانی نەگەیشتنی ژنان بە ئاستی بڕیاردان | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| زاڵێتی دەسەلاتی پیاوسالاری لەو بوارانەدا | 38 | 58.5 |
| تێڕوانینی کۆمەڵگە بۆ ژنان | 37 | 56.9 |
| نەبوونی هۆشمەندی پێویست و زانین بەو بوارانە | 25 | 38.1 |
| کەمی گەیشتنی ژنان بە ئاستی خویندنی باڵا | 21 | 23.3 |
| بوونی ڕێگری لەبەردەم یاسادانان و یاساکاندا | 8 | 12.3 |
| سەرقاڵی ژنان بە کارە خێزانیەکانەوە | 2 | 3 |
| هۆکاری دیکە | 3 | 4.6 |

پێشنیاز بۆ پشتیوانیکردنی دەرفەتی گونجاو لەبەردەم ژنان سەبارەت بە وەرگرتنی پۆستی سەرکردایەتی، دەستکەوتی کۆتایی توێژینەوەکە دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانەیە کە لە ڕێگەیەوە ژنان بتوانن بگەنە ناوەندەکانی بڕیار، هەر بۆیە تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە کۆمەڵێك پێشنیاریان بۆ ئەو مەبەستە خستەڕوو کە پێشتر زۆرێك لەوانە ئاماژەیان پێ کرابوو.

| پیشنیارەکان | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| بایەخدان بە خوێندنی باڵای ژنان | 40 | 57.1 |
| رۆشنبیرکردنی ژنان بەو بوارانەی نەچونەتە کارکردنەوە تیایدا | 30 | 49.2 |
| گۆڕینی وێنەی ژنان لە کۆمەڵگەدا | 31 | 44.3 |
| زاڵبوون بەسەر داب و نەریتەکانی لە بایەخی کاری ژنان کەم دەکەنەوە | 24 | 34.4 |
| پیاچونەوە بە یاساکان و یاسادانان کە ڕێگرن لەبەردەم ژنان | 20 | 28.6 |
| دابینکردنی هەندێ خزمەتگوزاری کە یارمەتیدەری ژنانن بۆ ڕۆڵبینینیان | 16 | 22.9 |
| پێشنیاری دیکە | 2 | 2.9 |
| بێ وەلاّم | 2 | 2.9 |

## تێڕوانینی ژنان سەبارەت بە مەودای هاوکاریکردنی چالاکانەی ژنان لەسەر ئاستی بڕیاردان

لەسەر ئاستی فەلەستین: سەبارەت مەودای هاوکاریکردنی ژنانی فەلەستین بە شێوەیەکی چالاکانە لە دروستکردنی بڕیاردا لە 53 کەس دا75.7٪ ی تاکەکانی نموونەکە پێیان وابوو ژنانی فەلەستینی توانای هاوکاریکردنیان نەبوو لە کاتێکدا 10 کەس لەوانە بە ڕێژەی

21.4٪ ی نموونەکە بە باشە وەلامیان داوەتەوەو هۆکارەکانیشی لە یەکەوە نزیک بوون، وە بەرێژەی 32٪ ی نموونەی توێژینەوەکە هۆکارەکانیان گەڕاندەوە بۆ یاساکان و دابونەریتەکان و تێڕوانینی خراپی کۆمەڵگە جگە لە زاڵێتی دەسەلاتی پیاوان لە بواری کار و رۆڵیان لە خێزاندا بەدەر لە بەرزبونەوەی رێژەی نەخویندەواری لە کاتێکدا 7٪ ی نموونەکە وایان دەبینی کە هۆکارەکان دەگەڕێتەوە بۆ سنورداری متمانەو باوەڕبوون بە خودی ژنان ئەوەش دەرئەنجامی ئەوەی کۆمەڵگە تا ئیمرۆ ڕانەهاتووە بە بوونی ژنان لە ناوەندەکانی بریار ئەمە جگە لەوەی تەنها 5٪ی تاکەکانی نموونەکە پێیان وابوو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی و تێکەڵنەبوونی ژنان بە شێوەیەکی جدی بە کارەکانیان بەلام ئەوانی دیکە هۆکارەکانیان گەڕاندەوە بۆ هۆکاری سیاسی جیاواز لەوانە دابەشبوونی بزوتنەوەکانی ژنان و داگیرکەرانی ئیسرائیل. بەلام ئەوانەی پێیان وابوو ژنان رۆڵ و هاوکاری چالاکانەیان هەبوو لە دروستکردنی بڕیار دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی خوێندن و هۆشمەندی و مێژووی خەباتیان وێرای بوونی پێشکەوتن لە بیروبۆچوون و کۆمەڵگە و زیادبوون لە رێژەی هۆشیاریدا.

### کورتەیەك

کورتەیەك سەبارەت بە تێڕوانینەکانی ژنانی فەلەستینی لە ناوەندی بڕیاردان

1- لێکۆڵینەوەکە دەریدەخات زۆربەی زۆری ژنانی نموونەکە لە کارەکانیان هەست بە سەرکەوتن و دەرئەنجامی باش دەکەن و زۆربەیان هۆکاری ئەو سەرکەوتنەش دەگەڕێننەوە بۆ خۆشەویستی کارەکەیان جگە لەوەی ئەو ژنانە جەخت لەوە دەکەنەوە کە سەرکەوتنیان کارێکی ئاسان و بێ گرفت نەبووەو دووچاری قورسایی زۆر دەبوونەوە لە کاتی یەکبوونی بڕیارەکاندا وە بێگومان دیارترین هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی سستمەکانی کار و کەمی زانیارییەکان و بیانات و جیاکاری لە مامەڵەکردندا جگە لە هەوڵدانی زاڵێتی لە لایەن پیاوانەوە.

2- وێرای ئاماژەکانی زۆربەی ژنانی نمونەی توێژینەوەکە دەیانکرد بەوەی لە دەرەوەی کارەکانیان روبەرووی قورسایی نەدەبوونەوە لەگەڵ ئەوەشدا دەگەڕانەوە بۆ جەخت کردن لەسەر ئەوەی قورسایی بنەڕەتی کە دووچاری زۆربەی ژنان دەبێتەوە لە دروستبوونی ناهاوسەنگیدا خۆی دەبینێتەوە لە نیوان بەرپرسیارێتی کارەکانی نێوماڵ و دەرەوەی ماڵدا.

3- سەبارەت راگرتنی هاوسەنگی لە نیوان کاری نێو ماڵ و بەرپرسیارێتی دەرەوە باش دابەشکردنی کات لە نیوان هەردووکیدا و بەشداریکرنی هەردوولا لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی خێزان و سوودوەرگرتن لەو خزمەتگوزاریانەی کۆمەڵگە پێشکەشی دەکات هەموو ئەوانە رێگای سەرکەوتن و یارمەتیدەرن.

4- ژنان لە شوێنی بڕیاردانا رۆلی خۆیان هەیە لە بەجەمسەرکردنی ژنان بۆ کاری بە کۆمەڵ بۆیە ژمارەیەکی زۆریان هاوکاریان کرد

لــە بنیادنــانی پــۆلێنکردنی ژنــان لــە بــواری کارکردندا.

5- لەسەر ئاستی دەستکەوتەکانی ژنان بەدەســتیان هێنــا لــە مــاوەی کارکردنیانــدا وەلاّمــەکان دوو ئاراســتەیان لــەخۆ گرتبــوو یەکــەمیان خــۆیی و لــە بــوونی شــارەزایی و باوەربــەخۆبوون و گەشــەکردنی کەســایەتیدا خۆی دەبینییەوە، دووەمیان خێزانیی بوو کە لە بەرزکردنــەوەی ئاســتی داهــاتی خێزانــدا خــۆی دەبینییەوە لە رووی ئابورییەوە.

6- تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە پێیان وابــوو ژنــانی فەلەســتین نــەیانتوانی چــالاکانە بەشــداری بکــەن لــە دروســتکردنی بریــار و هۆکــاری ئەوەشــیان گەرانــدەوە بــۆ زالّێتــی دەسەلاّتی پیاو و داب و نەریتەکان و تێروانینی خراپــی کۆمەڵگــە بــۆ ژنــان ئــەوە جگــە لــەوەی زۆربــەیان پێیــان وابــوو ئاســتی بەشداریکردنی ژنان لە دروستکردنی بریار لە بــواری دارایــی و کارەکانــدا کــەمترین بــوارە کــە ژنان توانیویانە پێی بگەن.

7- خوێنــدن گــرنگترین بناغەیــە کــە ژنــان رادەهێنێ بۆ کــارکردن و توانــای بــەردەوامێتیان پێدەدات و سەبارەت پشتیوانیکردنی دەرفەتی پێویست لەبەردەم ژناندا بۆ وەرگرتنی پۆستی ســــەرکردایەتی و بەشــــداریکردنی لــــە دروستکردنی بریار پێویستی بە دابینکردنی چەندین فاکتەر هەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- بایەخــدان بــە خوێنــدنی کــچان و گەیشتنیان بە ئاستەکانی خویندنی بالاّ.
- رۆشــنبیرکردنی کۆمەڵگــە بــە گرنگێتــی رۆڵی ژنان لە بواری کارکردندا.
- دەســتوری و یاســایی کــە خــۆی لــە جێبــەجێکردنی بیروبــاوەری رەخــساندنی وەکیەکیدا خۆی دەبینێتەوە بۆ هەمووان.
- زۆربەی تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە جەختیان لە نەتوانینی ژنانی عەرەبی دەکردەوە لە بەشداریکردنی چالاکانەیان لە دروستکردنی بریاردا و هۆکاری سەرەکیشیان گەراندەوە بۆ داب و نەریتەکان و تێروانینی خراپی کۆمەڵگە بۆ ژنان، لەگەڵ ئەوەشدا زوربەیان جەختیان لە بوونی ئەزموونە بەرجەستەکان دەکردەوە لەو بــوارەدا و بــەدەر لــە ئــەزموونی تــونس لــە هەســتانەوەی ژنــانی تونــسدا وەك ئــەزمونێکی نموونــەیی لەســەر ئاســتی عــەرەبی و هــەرێمی و نیودەوڵــەتی تەنانــەت دەشــێت لەســەر ئاســتی نیشتمانیش جێبەجێ بکرێت.

سەرچاوە:

زهيرة كمال، المرأة الفلسطينية واتخاذ القرار.

# هیچ چاوێك چاوەڕوانم نییە!!

لاش ئالین*

لە سویدییەوە: هیوا قادر و عەبدوڵڵا قادر دانساز

بە تەنها هەر منم لە ژوورەکەدا بێ جووڵە دانیشتووم. ڕۆژنامەکەم گرتووە بە دەستەوەو لەسەر قەنەفەکە دانیشتووم. کەس چاونابڕێتە چاوم. گەر کەسێکیش سەیرم بکات وەك وایە سەیری مۆبیلەی ماڵەکە بکات . من لێرە دانیشتووم و خۆم وا پیشان دەدەم کە دەخوێنمەوە، بەڵام من بە هیچ شێوەیەك ناخوێنمەوە بەڵکو دانیشتووم و بیر لەوە دەکەمەوە کە بە تەنها هەر منم لەم ژوورەدا بێ جوڵە دانیشتووم، تەنها کەسێکیشم کە لە چاوی هیچ کەسێکدا نابینرێم. ئینگرید دەچێ بۆ سەما و هارالد دەڕوات بۆ شار. بیرێر دەچێت بۆ ئەگلەنجە و ئاناش کوڕەکەی دەزگیرانی پاش سەعاتێکی تر دێت بەشوێنیداو بێگومان بە سواری ئوتۆمبیل دەچن بۆ هێرنوێساند و شەوێ لای ئاشنایەکیان دەمێننەوە. هەموویان دەڕۆنە دەرەوە. ژنەکەشم دەچێت بۆ دانیشتنی ئاینی. خەتیبێکی حەدیس خوێنی هێندە سەرسوڕهێنەر هاتووە. ژنەکەم وا بە ئینگرید دەڵێ. کەچی ژنەکەم ئەمە بە من ناڵێ. هیچ کەسێ هیچ شتێك بە من ناڵێت.

کاتی خۆی پێش ئەوەی ئەو شتە ڕووبدات کە ڕوویدا، هەمیشە گرێتا ڕۆژانی شەممان وەك ئێستا نیسی و بێرتیلی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆ ئێرە.

ئێستا بۆتان هەیە بۆ خۆتان لە ماڵی باپیرە بمێننەوە، کاتێك کە دایەو بابە دەچنە دەرەوە. ئەو سەردەمە وا دەوترا.

ئەو سەردەمە کوڕەکان خەنیدەبوون بەوەی کە بۆیان هەبوو لای من بمێننەوە. بە توێکڵەدار بەلەمم بۆ دەتاشین و بە کاغەز کۆلارەم بۆ دروستدەکردن. کوڕەکان دواهەمین کەس بوون کە چاویان دەبڕییە چاوم. چاویان دەبڕییە چاوم و دەیانووت:

–ئای.. کە باپیرەمان میهرەبانە! بەڵام ئەوانیش گۆڕان، ئەوانیش وازیان لەوە هێنا کە

چاو ببڕنە ناوچاوم. تەنانەت ئەوە پێش ئەو ڕووداوەش بوو کە ڕوویدا. کوڕەکان ئیتر وازیان لەوە هێنا داوام لێبکەن بەلەمی تویکڵەدار و کۆلارەیان بۆ دروستبکەم. لە جیاتی ئەوە گۆڤاری "ئەللەش"یان لەگەڵ خۆیان دەهێنا بۆ ئێرە. بۆ خۆیان دادەنیشتن و نەخشەکانیان دەبڕی و کەتیرەیان لێدەدا و خانوو قەڵایان پێ دروست دەکرد، بەڵام هەرگیز پرسیاریان لەمن نەدەکرد. هەروەها مەکینەی فڕۆکەشیان دروستدەکرد. کە لەو سەردەمەدا بوو بوو بە باو، کەچی هەرگیز بۆ ڕینومایکردنیش پرسیارێکیان لە من نەدەکرد. تا لە کۆتایدا تەنانەت کوڕەکان ئەو یاریانەشیان پیشانی من نەدەدا کە دروستیان دەکرد.

ئیتر پێش ئەوەی ئەو شتە ڕووبدات کە ڕوویدا شتەکان بەم شێوەیە بوون. ئێستاکەش بە تەواوەتی هەر وەك ئەو سەروەختە وەهایە.

من تەنها کەسێکم لە ژوورەکەدا بێ جووڵە دانیشتووم. بێ جووڵە دانیشتووم و ڕۆژنامەکەم بەدەستەوە گرتووە. ئێستا کەس چاونابڕێتە ناوچاوم. بەدەگمەن کەسێك دەمدوێنێ، کەر کەسێکیش جارێك لە جاران شتێکم لەگەڵ بڵێت ئەوا چاو نابڕێتە ناو چاوم.

-باوکە هەندێك توتنی پایپم نادەیتێ. هەندێك جار بیرێر وا دەڵێت. بەڵام ئەو هەرگیز سەیرم ناکات. بیرێر سەری پایپە بەتاڵەکەی خۆیم بۆ درێژدەکات و منیش کیسەی توتنەکەی دەدەمێ بۆئەوەی بەشی خۆی توتن تێبکات. پڕ بە دڵ پێمخۆشە پێیبڵێم: "ها بگرە ڕۆڵەکەم، بەڵام میهرەبان بە، جارێکی تر کە شتێك بە باوکە پیرەکەت دەڵێیت چاو بڕە ناو چاوی".

بەڵام من هەرگیز ئەمەم پێنەووتووە. زمانم ئەستوورەو ناکەوێتە گۆ.. نازانم زمانم چ دەردێکییەتی، من هەرگیز ناتوانم ئەوەی لە دڵمدایە پێیبڵێم، ئاخر پێش ئەوەی ئەو شتە ڕووبدات کە ڕوویدا زمانیشم تێکچوو. بۆ ماوەی چەندین ساڵە هەستدەکەم تابێت زمانم ئەستوورتر دەبێت و لە دەممدا ناگەڕێ. من گەلێك شتی زۆرم لەسەر خۆم بارکردووە، کە ویستوومە بیاندرکێنم، بەڵام تەنها ووشەیەك چییە کە بێ بەهایە زمانم ڕێگەی دەرچوونی نەداوە. ئێستا هەر لەم کاتەدا کە گەڕاومەتەوە دەخوازم بە ژنەکەم و منداڵەکان و منداڵی منداڵەکانم بڵێم: بۆچی هەمووتان وازتان لە چاوبڕینە چاوی من هێناوە؟ بۆچی هیچ قسەیەکم لەگەڵدا ناکەن؟ ئەوەی کە ڕوویدا هەرگیز ڕووی نەدەدا گەر ئێوە جار جارێ چاوتان ببڕیایەتە ناو چاوم و بۆ جارێك لە جاران بتاندووانمایە". تازە گوزەشت! زمانم هەرگیز نابێتەوە بەوەی کە هەبوو، تازە نابێت بە شتێکی تریش..

من تا ئێستا تەنها کەسێکم لە ژوورەکەدا بێ جووڵە دانیشتووم و هەموو ئەوانی تریش بە پرتاو بەلامدا دێن و دەچن.

-ئەننا، تۆ دەزانیت گۆرەوییەکان لە کوێن؟ ژنەکەم وا دەڵێت و چاودەبڕێتە ناو چاوی ئاننا. جووتێ گۆرەوی بدە بە براکەت.

-کاتم نییە! ئاننا هاوار دەکات، لە کاتێکدا خەریکی ئامادەکردنی سەبەتەیەکی گەورەیە لە خواردن کە خۆیی و دەزگیرانەکەی دەیانەوێت

بە سەفەری ئۆتۆمبیل لەگەڵ خۆیان بیبەن، زۆ بە پەلەش چاو دەبڕێتە ناو چاوی هەردووك لە ژنەکەم و کوڕەکەم.

جووتێك گۆڕەویم بۆبێنە، دووبارە بیرێر هاوار دەکاتەوە. ئەم ماڵە بە جەهەنم چێت کە چ جۆرە ئافرەتێکی تێدا دەژی. ها.

-ئارام بە، ژنەکەم وای پێدەڵێت.

ژنەکەم بە دیار تەباخەکەوە دانیشتووەو پرچی لوول دەکات. سووژنەکەی خستە سەر تەباخەکەو دواتر هەستاو چووە ژوورێکی تر. پاش کەمێك ژنەکەم بە جوتێك گۆڕەوییەوە گەڕایەوە و هەڵیدا بۆ بیرێر. ژنەکەم چاو دەبڕێتە ناو چاوی کوڕەکەم و دەڵێت:

-بەهەمان ڕەنگی قاتەکەشتە، زۆر جوان لێی دێت؟

-دەستخۆش دایکە گیان، وای پێدەڵێت و چاو دەبڕێتە ناو چاوی و پێدەکەنێت. ئەمە بەختە کە پیاو دایکێکی ئاوا نایابی هەبێت.

بیرێر لە ژوورەکەی خۆیدا ونەدەبێت و ژنەکەم دەگەڕێتەوە بۆ لای تەباخەکەو سووژنەکە هەڵدەگریٚ و بە ڕۆژنامەیەك ساردی دەکاتەوە. پەڵەی گەورەو قاوەیی لە ڕۆژنامەکەدا دروستدەبێت. ناهێڵێت پەڵە قاوەییەکان هێند تۆختر بن، قژەکەی دەئاڵێنێتە دەوری سووژنەکەو لوولی دەکات. ژنەکەم دەچێت بۆ دانیشتنی ئاینی، خەتیبێکی وا مەزن هاتووە، ژنەکەم هەر لەویادا ئاوا بە ئینگرید دەڵێت.

-گەر دەتەوێت، دەتوانیت جووتیٚ گۆڕەویی حەریر لە من قەرز بکەیت، ئینگرید وا بە دایکی دەڵێت و چاو دەبڕێتە ناو چاوی.

-ئەوەی بۆ ئاهەنگی سەما دەگونجیٚ بۆ دێر دەستنادا، ژنەکەم وا دەڵێت.

-من لە کلێسا خەڵکی وام دیوە گۆڕەویی تەنکیان لە پێدا بووە، ئینگرید دەڵیٚ.

-لە کلێسا، بەڵیٚ! ژنەکەم وا دەڵێت و خنەیەکی بۆ دەکات و چاو دەبڕێتە ناو چاوی کچەکەی. من کەسی وام دیوە دەموچاوی وا سواغداوە هەر لە سۆزانی چووە، بەڵام شتی لەم جۆرە لە دانیشتنی ئاینیدا روونادات.

-کەیفی خۆتە چۆنت دەوێت با وابێت، ئینگرید دەڵیٚ. هەر چۆنێك بێت گۆڕەوییەکان هیچ عەیبێکیان نییە، هەروەها ڕەنگیشیان ڕەشە.

لە پڕا هارالد بە هەناسەبڕکیٚ لە دەرەوە بە پرتاو خۆی دەکات بە ژووردا. هارالد لە کۆنسۆم کار دەکات. ئێوارەی شەموانیش کاتژمێر پێنج دایدەخەن، بەڵام ئێستا کاتژمێر گەیشتووە بە شەش و چارەك. هەنووکە ئەو پەلەیەتی بۆ گەیشتن بەو شەمەندەفەرەی دەچێت بۆ شار.

-ئەی هاوار بۆ خاتری خوا لە بیرتان نەچووبێت قاتە قاوەییەکەم بخەنە ژێر ئتووەکەوە! هەر لە ناو دەرگاکەوە هاوار دەکات و چاو دەبڕێتە ناو چاوی ژنەکەم و ئاننا و ئینگرید. ئینگرید ئەوە تۆ ئتووت کردووە، بەڕاستی من پێتا ڕادەپەرمووم بۆ کاری ئاوا، هارالد وا دەڵێت و دەست درێژ دەکات و دەست بە ژێر چەنەی ئینگریددا دێنێت. بەراستی تۆ کچی تەنگانەیت، وا دەڵێت. ڕۆژی دووشەممە قتوویەك ئەنەناست بۆ دێنمەوە.

-جا ئەوە کەمترین شتە کە ئینسان داوای بکات، ئینگرید وا دەڵێت و زەردە دەیگرێ، هارالدیش زەردەیەکی بەڕوودا دەکاتەوەو چاودەبڕێتە ناو چاوی.

ئەودەم هارالد فرتە دەکات بۆ ژووری کوڕەکان. من وەکو پێشتر ڕۆژنامەکەم بە دەستەوەیەو بێ جووڵە دانیشتووم. تەنانەت هارالدیش ڕووی بە رووی مندا وەرنەچەرخاند. لە پڕا گوێم لێیە چۆن چۆنی ئەوان لە ژووری کوڕەکاندا بەسەر یەکتریدا هەڵدەشاخێن. هەر ئێستا بیرێر قەرەوێتەیەکی بەدەستەوەیەو بەلەز دێتە دەرێ.

-بڕوانە دایکە! بیرێر هاوار دەکات. کچەکان سەیر دەکەن! ئەو شاگرد دووکاندارە نەفرەتییە هەموو ڕۆژێك باشترین قەرەوێتەکانی منی بەکارهێناوە. توخوا ئەمە نەگبەتی نییە. من پێویستە قەرەوێتەیەکی نازدارم هەبێت کاتێ کە دەچم بۆ ئەگلەنجە، چونکە پیاو هەرگیز نازانێت کە لەوێ چی ڕوودەدات. من خۆم بینیومە کە جاری وا هەبوو بەبێ چاکەت و هێلەك دابنیشیت و نان بخۆیت، بۆیە پیاو پێویستە قەرەوێتەیەکی گەلێ کیبارانەی لەملدابێت بۆئەوەی هەست بە کەمی نەکات. ئایا هیچ ئتوویەکتان بەسەر تەباخەکەوە دانەناوە؟ باشە، کەوابوو بیکەن بە خاتری خواو ئتووەکەی بخەنە سەر!

-ئارام بگرە برا! هارالد واپێدەڵێت و بە لوتبەرزی و هەنگاوی درێژەوە دێتە ژوورێ. هارالد چەکمەجەی دۆڵابێکی دەرهێناوەو بە باوەشییەوە گرتوێتی و لەسەر مێزی چێشتخانەکە دایدەنێت. هەر کام لەمانە دڵت دەیخوازێت بیبە، هارالد وا دەڵێت. تۆ دەبینی من هێندە خوا حەز بکات قەرەوێتەم هەیە. قەرەوێتەکەی تۆ دەبێت لە کاتی جیاکردنەوەدا کەوتبێتە ناو ئەوانەی منەوە.

-مەگەر خوا بزانێت کە من چەند قێز لەم شاگرد دووکاندارە دەکەمەوە! بیرێر هاوار دەکات و پشت لە چەکمەجەکە دەکات. ئتووەکەی لەسەردانێ. ئینگرید! خۆ هێشتا لەو باوەڕەدایە کە من یەکێك لەو قەرەوێتە قێزەونانەی ئەوم دەوێت. تا ئێستا دەرکی بەوە نەکردووە کە حەزی من و ئەو خەرەندێکیان بەینە. ئاخر بەڕاستی تۆ چۆن شاگردێکیت! بیرێر وا دەڵێت و ڕووی خۆی وەردەچەرخێنێت و چاودەبڕێتە ناو چاوی هارالد. قەرەوێتەی جەنابت ناشیاوترین و قێزەونترینە، باشە.

-تۆ خۆت لە کاری من هەڵمەقورتێنە، ئەی تایت کوڵێنەری نەفرەتلێکراو، هارالد هاواری بەسەردا دەکات.

-تایت کولاندن، مەگەر خوا بزانێت کە چەند کارێکی هێجگار باشە. بیرێریش هاوار دەکات. ئەوە یەکێکە لە باشترین کارەکانی ناو هەموو کارگەکە. ئەمەش سەد و نەوەد و نۆ پلە سەروترە بەراورد بە کارە نەفرەتییەکەی تۆ.

-هێندە ئاگر خۆشمەکە، ئاننا هاوار دەکات، لە کاتێکدا خەریکی خەیار قاژکردنە بە قاژی باریك و دەیانخاتە ناو شووشەی سرکەوە.

تەنها هەر منم لە ژوورەکەدا بێ جووڵە دانیشتووم. من تەنها کەسێکم کە کەس نامدوێنێت. من تەنها کەسێکم لە ژوورەکەدا کە لە چاوی کەسیاندا نابینرێم. من تەنها کەسێکم لەم ژوورەدا کە بێدەنگم.

-من ناتوانم "مایۆنیس"ەکە بدۆزمەوە! ئەننا هاوار دەکات و چاو دەبڕێتە نێو چاوی ژنەکەم. خۆ لە لیستی کڕینی شتومەکەکاندا لە بیرت نەچووە مایۆنیس بنووسیت؟

-نەخێر بێگوومان، ژنەکەم وا دەڵێت. هەنووکە لە پرچ لوولکردن بۆتەوەو چووە لەبەردەم ئاوێنە گەورەکەدا وەستاوەو خۆی بە ئاوێنەکە پیشاندەدات. بگەرێ پێش ئەوەی هاوار بکەیت، ژنەکەم وا بە ئاننا دەڵێت. ئایا تۆ لەو بڕوایەدایت کە قژم زۆر لوول بووبێت؟ ژنەکەم وا بە ئینگرید دەڵێت و چاودەبڕێتە ناو چاوی.

-بۆ دانیشتنی ئاینی، نەخێر، دایکە، ئینگرید وا دەڵێت و ئتووەکەی گەرمکردووەو خەریکی ئتووکردنی قەرەوێتەکەی بیرێرە.

بیرێر ڕاوەستاوەو تێیدەڕوانێت. گرانترین کراسی لەبەرکردووە کە بایی سی و پێنج کرۆنە. دەست بەسەر سنگی خۆیدا دەهێنێ و دەڵێت: قوماشەکەی هێندەی پێستی ژنێك نەرمە.

-کاتێك پیاو دەچێت بۆ ئەگلەنجە پێویستە کراسێکی گرانبەهای لەبەردابێت، بیرێر وا دەڵێت. چونکە پیاو هەرگیز نازانێت چی لەوێ ڕوودەدات.

لە پڕا بیرێر ڕوو بەلای مندا وەردەچەرخێنێت و سەیری سەر سنگم دەکات. یەکسەر منیش چاودادەگرم و سەر دەژەنمەوە بەسەر ڕۆژنامەکەداو هەست بە دڵم دەکەم کە چۆن بە قایمی دەست دەکات بە لێدان.

تا سیانزەهەمین تریەی دڵم دەژمێرم بەبێ ئەوەی هیچ شتێك رووبدات. بەلاَم لە حەڤدەهەمیندا بیرێر روو بەلای ژنەکەمدا وەردەگێڕێ، ژنەکەم تا ئەو کاتەش لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وەستابوو سەیری قژی دەکرد تا بزانێت بەرێکوپێکی لوول بووە. بیرێر چاودەبڕێتە ناو چاوی ژنەکەم و دەڵێ:

-تۆ لەو باوەڕەدایت کابرا "سنووس"ی هەبێت؟ پیاو هەرگیز نازانێت چی لە ئەگلەنجە ڕوودەدات. جاری وا هەبووە بە دەوری مێزێکدا دانیشتووین و هێندەی هەڵماتێك سنووس لە ژێر لچماندا بووە. ئەو کەسەشی تا دواهەمین کەس توانیوویەتی خۆی ڕابگرێت ئەوا قاپێك شەرابی بردۆتەوە. ئەمەش بەڕاستی یارییەکی گەلێك خۆشە.

-نا، کابرا ئەم زەمانە سنووسی نییە، ژنەکەم وا دەڵێت.

-بێگومان خۆ تۆ نەبوویت کە خۆت ڕاگرت و قاپە شەرابەکەت بردەوە؟ ئینگرید دەڵێت.

-باشە کچی باش تۆ باوەڕ بەچی دەکەیت، ها؟ بیرێر وا دەڵێ و بەسمتی ئینگریددا دەکێشێ بۆ ئەوەی تووڕەی بکات.

-واز لەم کردەوانەت بێنە، ئینگرید وای پێدەڵێت. لەگەڵ ئەوەشدا هانێ قەرەوێتەکەت بگرە.

خوای گەورە، من بیرم کردەوە، ئەمە بۆچی وای لێهات؟ بۆچی تەنها هەر من بێ جوڵە دانیشتووم؟ بۆچی هەر من لە چاوی هیچ کەسێکیاندا نابینرێم؟ بۆچی بە تەنها هەر من کەس لەگەڵم نادوێت؟

خۆ ئەو دەمیش هەر ئاوا بوو پێش ئەوەی ئەو شتە ڕووبدات کە ڕوویدا، کەواتە ئەمەی کە

ئێستا ڕوودەدات خەتای ئەو ڕووداوەی پێشوو نییە کە ڕوویدا. من ئەو کاتەش وەك ئێستا دانیشتبووم و خۆم وا پیشان دەدا کە ڕۆژنامە دەخوێنمەوە. ئەو کاتەش هیچ کامیان لەگەڵم نەدەدوان و کەسیش چاوی نەدەبڕییە ناوچاوم. زۆر باشم لەبیرە. تاوێك پێش ئەوەی کە ئەو شتە ڕووبدات دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە: ئەم ماڵە هەر چۆنێك بێت ماڵی منە. من ئەم خانووەم بە مەچەکەکانی خۆم دروستکردووە. هەر وەك کۆیلەیەك کارم دەکرد بۆ ئەوەی ئەم خانووە بۆ ئێوە بنیاتبنێم. هەر کە لە شەفتی کارەکەم دەبوومەوە بە پاسکیل دەچووم بۆ سەر زەوییەکەو تا تاریك دادەهات کارم دەکرد. زۆربەی ڕۆژانی پشووش هەر لێرە بۆ دە تا دوانزە سەعات ڕەنجم دەدا.

بەڵێ، ئەو کاتەش پڕاوپڕ وەك ئێستا وابوو. ئەوە هەر من بووم بێ جووڵە دادەنیشتم، ئەوەش هەر ئەوان بوون کە لەو ناوەدا دەهاتن و دەچوون و بە سۆز و گرژییەوە چاویان دەبڕییە ناو چاوی یەکترییەوە. ئینگرید دەچوو بۆ سەماو هارالد دەچوو بۆ شار. بیرێر دەچوو بۆ ئەگلەنجە و ئەننا دەردەچوو بۆ سواری ئۆتۆمبیل. هەموویان دەچوونە دەرێ. ژنەکەشم دەچوو بۆ دانیشتنی ئاینی. خەتیبێکی وەها مەزن هاتووە، ژنەکەم ئەو کاتیش هەر وای بە ئینگرید دەوت. ئەو کاتیش ژنەکەم ئەمەی لای من باس نەدەکرد. ژنەکەم هەرگیز باسی خواکەی خۆی بۆ من نەدەکرد.

—خوا، بەڵێ، سەرباری هەموو ئەمانەش تەنانەت خواش چاو نابڕێتە چاوی من. ئەویش ئەمە ناکات. ئەو خوایەی کە هەمووان لە منداڵییەوە گوێمان لە ناوی دەبێت کە باسی دەکەن، هەر لە قوتابخانەوە گەلێك شت دەربارەی فێردەبین، ئینسان هەست بە نزیکبوونەوە دەکات لێی کە باوەڕی پێدێنێت. بێ لەوە جارو باریش لەو ماوەیەی کە مرۆڤ تیایدا دەژی ناوی دەبرێت.

—تەنانەت خواش وەك هەموو ئەوانی تر وابوو بۆ من، ئەویش هەرگیز چاوی نەبڕییە ناوچاوم. نا، ئەویش هەرگیز هیچی بە من نەوتووە. گەلێك جاران ویستوومە قسەی لەگەڵ بکەم و پێیبڵێم:

—سەیری چاوەکانم بکە، خوای گەورە، قسەم لەگەڵدا بکە. کورە من هێجگار تەنهام. بەڵام ئەو هاوارەم لە پای خودادا تەنها هەر لە سنگمدا دەمایەوەو بۆ خۆی خەفەدەبوو.

کەچی من هەرگیز ئەمەم بە خودا نەوت. کاتێك دەمەوێت شتێك بە خودا بڵێم زمانم ئەستوور دەبێت و نایەتەگۆ. بەڵام ئەو ئێوارەیەی کە ئەوە ڕوویدا کە دەبوو ڕووبدات. بیرمدێت هەر ئاوەها دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە: تۆ بڵێی بەڕاستی ئەوان چارەی منیان نەوێت؟ ئایا حەز بە باوکیان ناکەن کە ژیان و ماڵێکی ئاوهای پێبەخشیوون؟ بە بیرم دێتەوە کە من دانیشتبووم و تەمەنام دەخواست نەخۆشبم، دەمویست بەدەم ئازارەوە گرمۆڵە ببم تا ببینم کە چی ڕوودەدات. بێگومان ئەوان هەردەم خزمەتم دەکەن؟ بەڵام ئایا ئەوان چاودەبڕنە ناوچاوم؟ تۆ بڵێی جلەکانم لەبەر دابکەنن و بمخەنە ژێر پێخەفەکەمەوە؟ بڵێی ئەوان لێگەڕێن ئیتر نەچن بۆ سینەما، بۆ شار، چوون بۆ ئەگلەنجە، سەفەر بە ئۆتۆمبیل، چوونە

دانیشتنی ئاینی؟ تۆ بڵێی ئەوان بە دیار پێخەفەکەمەوە ڕابوەستن و چاو لە چاوانم ببڕن و قسەم لەگەڵدا بکەن؟ تۆ بڵێی ئەوان ئیتر قەرەوێتەو گۆرەویی و کیسەی خواردن لە بیر بکەن؟ تۆ بڵێی ژنەکەم لەبری لوولکردنی پرچە ماش و برنجییەکەی شتێکم بۆ لێبنێت و بیکات بە دەممەوە؟

لە بیرمە ئەو دەم من ئاوا بیرم دەکردەوە. بەڵام من خۆم نەخۆش نەخست و دەستم بە ناڵەناڵیش نەکرد.

ئەوجا ئینگرید چوو بۆ سەما، هارالد چوو بۆ شار، بیرێر چوو بۆ ئەگلەنجە و ئاننا‌ش بە ئۆتۆمبیل سەفەری کرد. هەموویان چوونە دەرێ. هەروەها ژنەکەشم چوو بۆ دانیشتنی ئاینی. من لەسەر قەنەفەکە دانیشتبووم و خۆم وا پیشان دەدا کە ڕۆژنامە دەخوێنمەوە. نیسی و بێرتیل لەبەردەم مێزی چێشتخانەکەدا دانیشتبوون و پشتیان لە من کردبوو سەرقاڵی زەمقلێدان بوون لە چەند گۆڤارێکی ئەللەش. ئەوان تەنانەت بۆ تەنها جارێکیش چییە داوایان لە من نەکرد سەیری ئەو پارچە کاغەزانە بکەم تا بزانم کە چۆن توانیویانە بیلکێنن بەیەکەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێك ڕووینەدابوو لەو شتەی کە بەرەو ئەوە دەچوو ڕوویدات. کوڕەکان چرای چێشتخانەکەیان ڕاکێشابووە خوارەوە بۆ سەر مێزەکە. ڕووناکییەکی خڕی بەهێز کەوتبووە سەر ملە شۆڕبوەکانیان. ئەوان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە من لەسەر قەنەفەکەم دانیشتووم و ڕۆژنامەکەم بەدەستەوەیە. بیریان لەوە نەدەکردەوە کە هیچ ڕووناکییەك نایەتە سەر ئەو ڕۆژنامەیەی کە بەدەستی منەوەیە. بەڵام ڕەنگە ئەوان لەو باوەڕەدا نەبن کە من دەخوێنمەوە؟ ئاخر کەنتۆرێك چ پێویستی بە ڕووناکییە ئەگەر ڕۆژنامەیەکیشی بەدەستەوە بێت..

سەرەتا دەستەکانم کەوتنە لەرزین. دەبوو ڕۆژنامەکە فڕێبدەمە سەر زەوییەکە بۆ ئەوەی بەدەستمەوە لەتوکوت نەبێت، نەشمدەویست وا بکەم. بەڵام بەهەرحاڵێك کاتێك کە ڕۆژنامەکەم بەردایە خوارێ دەستم ڕاتەکی. کۆم بوومەوەو هاوارێکی وا زۆرم بۆ هات کە لە تاوا پەنجەکانم خستە ناو دەممەوە. دەمویست زمانم لە بنا دەربکێشمە دەرەوە چونکە نەیدەتوانی گوێرایەڵیم بکات. بەڵام لە پڕا بیرمکردەوە: لەوانەیە هیچ دەنگێکیش نەیەتە دەرەوە چونکە خۆ من هیچ کەسێکم نییە تا هاواری بۆ بکەم؟ لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە بێت کە زمانم ساڵ لە دوای ساڵ ئەستوورتر و ڕەقتر دەبێت؟ ناتوانم ڕوو لە هیچ کەسێك بکەم، چونکە من بۆ هیچ کەسێك بوونم نییە. نە بۆ خودا نە بۆ ژنەکەم، نە منداڵەکانم یان منداڵی منداڵەکانم یان کرێکارەکانی هاوڕێم. کەس هەست بە من ناکات. هیچ چاوێك چاوەڕوانی من نییە. من ببم یان نەبم چ ڕۆڵێك بۆ خەڵکی دەگێڕێت، دێتەوە بیرم من ئەو کاتە ئەوەندە نائومێد خۆمم دەبینی کە هەرگیز پێشتر بەو ڕادەیە بێ ئومێدی وام بە خۆمەوە نەبینیبوو. بەڵام ئەو کاتە، بە تایبەتی ئەو کاتەم بەبیر دێتەوە، کە بیرم لە شتێکی تر دەکردەوە: هەڵدێم، لە هەر هەموو شتێك هەڵدێم! وا بیرمکردەوە. بۆی هەڵدێم! ڕادەکەم بۆ دارستانەکە! با بەدوامدا بگەڕێن! با هەرچی خەڵکی "سولفافۆش"ە کۆی بکەنەوەو هەر

هەموویان بە دارستانەکەدا بە دوامدا بگەڕێن. با بە زنایەکی هێجگار گەورە بێن و هەموو دارستانەکە پەیبکەن بە شوێنمدا و بانگم بکەن:

-گۆستاڤ ئەندەشۆن، هۆو، تۆ لە کوێی؟

بەڵێ، زۆر بە باشی دێتەوە بیرم، کە هەر کەمێك پێش ئەو ساتە چۆن چۆنی بوو. بە بیرم دێت لەسەر نوکی پێ لە چێشتخانەکەوە چوومە دەرێ. ئیتر وورده وورده ئەو شتە دەستی بە روودان کرد، ئەوەی کە روویدا.

بەناو سلفافۆشدا دەرچووم. من نامەوێت لەوە زیاتر تەنهاتر بم و بێ جووڵە لە ژوورەکەدا دابنیشم. نامەوێت لەوە زیاتر خۆم وا پیشان بدەم کە رۆژنامە دەخوێنمەوە. نامەوێت تەنها هەر بۆ خودی خۆم بوونم هەبێت. من دەمەوێت کەسێك بمدوێنێت و چاوانی ببڕێتە ناو چاومەوە. دەمەوێت مانایەکم هەبێت بۆ کەسێك، هیچ نەبێ بۆ کەسەکانی خۆم، بەڵێ، بۆ هەموو خەڵکی ئێرە لە سولفافۆش. دەمەوێت ئەوان هەموویان بە بازنەیەکی ئێجگار گەورە بێن و هاوار بکەن:

-گۆستاڤ ئەندەشۆن، هۆو.. تۆ لە کوێی؟

من بەناو دارستانەکەدا ڕامکرد. توولە ڕێگای داوێنی گردەکەم گرتەبەر، دنیا تاریك و نوتەك بوو، هیچ ئەستێرەیەك بە ئاسمانەوە نەبوو. توولە ڕێگاکەم بزرکرد، ڕێکردن بەناو دەوەنی چڕدا وەك رۆیشتن وایە بەناو سووتوو بارینــدا. هەموو شتێك رەش دەچووەوە. گەڵاکانیش هەروەکو چڵوسکی تەڕ دەیاندایەوە بەناو چاوانمدا. بەڵام سەربارى هەموو ئەو شتانە من ناخم روونـاك بوو، لەبەرئەوەی ئومێدێك لە ناخمدا بڵاچەی دەدا، ئاه! بیرم کردەوە. دەبێت چەندە لە قوڵایی ناخمەوە بەختەوەربم کاتێك کە گوێم لە دەنگی سەدان مرۆڤ دەبێت، بە بازنەیەکی ئێجگار گەورە دێن و بانگم دەکەن:

-هۆ گۆستاڤ ئەندەشۆن، هۆو، تۆ لە کوێی؟

بیرم کردەوە: تاوەکو بە تەواوەتی نەگەنە ئاستم، من هاوار ناکەم و بڵێم: "ئەوەتام!" ئەوسا هەر هەموویان بەرەو رووم دێن و چاو دەبڕنە ناو چاومەوەو پێمدەڵێن:

چۆنیت، گۆستاڤ؟ هەموومان گەلێك دڵمان لات بوو. گۆستاڤ. چییە ئەوە ڕێت وێڵ کردبوو. گۆستاڤ؟ ئێمە خەریك بوو بە هێجگاری هیوا براوبین لە دۆزینەوەت. گۆستاڤ، ئێستا چۆنیت، گۆستاڤ؟ پێویستە تەندروستیت چاکبێتەوە، گۆستاڤ. ئێمە ئەوەندە شاگەشکە دەبین بە چاکبوونەوەی تۆ نەبێتەوە گۆستاڤ.

من لە خۆشیاندا بەناو دارەکاندا ڕامدەکرد، بەسەر چیاکەدا هەڵزنام و هەموو شتێك لە سەمایەك دەچوو. نەوەستام تاکو گەیشتمە سەر ترۆپکی چیاکە. ئالەوێدا چوومە سەر دارسنەوبەرێك. ئەوکاتە هێندە تاریك بوو لە تاوا لە جێگەکەی خۆم تۆتکەم گرت. چونکە دەمویست بەتەواوەتی ئەو بازنە ئێجگار گەورەیە بە چاوی خۆم ببینم کە لە سەدان مرۆڤ پێکهاتووەو هەموان پێکەوە ڕێدەکەن و بانگم دەکەن:

-گۆستاڤ ئەندەشۆن، هۆو، تۆ لە کوێی؟

بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر سنەوبەرەکە مامەوە چونکە بیرم لەوە دەکردەوە کە کاتێکی زۆر دەخایەنێت تاکو کەسێك بتوانێت دەرکەوێت. بەهەرحاڵ تا سەحەر کەوت هیچ ڕووینەدا.

دابەزیمە خوارەوەو لەسەر گوونییە قەوزەیەکی ووشك ڕاکشام. هەر زوو خەو بردمییەوە. کە لە خەو ڕابووم خۆر بە ئاسمانەوە بوو. خێرا بە سەر دار سنەوبەرەکەدا هەڵزنامەوە، چونکە نەمدەویست کاتێك کە دێن تەنانەت سوچێکی زنجیرەی ئەو بازنە گەورەیە چییە لە دەستم بچێت. بەڵام وا سەعات لە دوای سەعات تێدەپەڕێت بێ ئەوەی شتێك ڕووبدات. برسیم بوو، بەڵام دڵی خۆم بەوە دەدایەوە و دەمووت:

-هەر ئێستا ئەوان دێن. هەر ئێستا ئەوان بە بازنەیەکی ئێجگار گەورە بەسەر مەشقی دادوەری شار دێن. پیرو جوان. هەموو کەسێ، ئەوانەی کە کاریان نییە یاخود نەخۆش نین، هەر ئێستا دێن و هەڵدەزنێن بەسەر شاخەکەدا. ئاخر پیاو دەبێت زۆر بە ووردی پێچ و پەنای درەختەکان و پشتی گاشە بەردەکان و دارە ڕماوەکان بپشکنێت. سەدەها چاو بۆم دەگەڕێن.

خۆر گەیشتە تەوقی ئاسمان و دواتر دابەزییەوە خوارێ. خۆر وون بوو، کازیوە بەسەر ئەودیوی چیادا ڕژا.

-خودایە، چەند دڵم بە خۆم سووتا؟ بۆچی نەهاتن؟ بیرم دەکردەوە. بۆچی ئەوان بە بازنەیەکی گەورە نەهاتن و بانگیان نەکردم.

من هەر گوێم شلکرد و گوێم گرت، بەڵام گوێم لە هیچ شتێك نەبوو کە پەیوەندی بە منەوە هەبێت. لە کۆتاییدا من بووم بە گومانکارێکی بێ هاوتا. ئەو ئێوارەیە ئاسمان گەلێك ڕوون بوو، ئەستێرەکان و مانگی چواردەم بینی. ئایە ئەوە هەر تەنها منم کە بە بوونی خۆم دەزانم؟ بیرم کردەوە. ئایە تەنها من هەر بۆ خودی خۆم بوونم هەیە یاخود بۆ کەسانی تریش لەم ژیانەدا؟ دەستەکانم کەوتنە لەرزین. وەك لاڵێك چاوم بڕییە مانگ. ئەوجا شتێك هاتە سەر تەوقی سەرم، گیانلەبەرێکی نەبینراو دەمی نا بە تەوقی سەرمەوە. هەستم بە مشەمشی دەکرد. هاوسەنگییەکەم ئاڕاستەیەکی تری وەرگرت.

ئاهـ ئەوەتا، بەرەو دەمی داپچڕاوی مانگ هەڵدەلوشرێم! دەستم لە چڵێکی دار سنەوبەرەکە گیر کردوو هەوڵمدا خۆم بگرم. پێشتر هەرگیز هەستم بە شتێکی وا ترسناك نەکردبوو وەك ئەو کاتە کە هەستم پێدەکرد: من بوونم نییە! وام هەستکرد. هەر لەبەر ئەوەشە کەوا دەکەومە ناو خڕێتی دەمی مانگەوە. من هەر تەنها بۆ خودی خۆم بوونم هەیە. هیچ کەسێکی تر بە بوونی من نازانێت. ئەوانەی کە لە ماڵەوەن دەرکیان بەوە نەکردووە کە من لەوێ نەماوم. خۆ ئەو کاتەی کە لەوێشم هەر درکم پێناکەن. ئەوان لەو باوەڕەدان کە من هەتاکو ئێستاش هەر لەسەر قەنەفەکە دانیشتووم و خۆم وا پیشان دەدەم کە ڕۆژنامە دەخوێنمەوە. بەڵێ، باشە ئاخر ئەوان چۆن بزانن کە ئیتر من لەوێ نیم. ئەوان هەرگیز سەیرم ناکەن و قسەم لەگەڵدا ناکەن! من تەنها پارچە موبیلەیەکم لە ژوورەکەدا، ئەوان بەوەیان نەزانیوە کە پارچە موبیلەکە ڕێی گرتۆتە بەر و ڕۆیشتووە. چونکە ئەو پارچە موبیلەیە پارچە موبیلەیەکی وەها زیادەبوو کە ئەوان هەرگیز پێویستیان پێی نەبوو بەکاری بهێنن.

ناکرێت ئەمە بە ڕاست بگەڕێت. من نامەوێت لە دەمی مانگدا بخنکێم. نامەوێت بەر ڕم

بــــدرێم و بـــەر نـــووكی ڕمـــی بریـــسكاوەی ئەستێرەكان بكەوم. من دەمەوێت لەسەر زەوی بژیم. دەمەوێت لە سولفافۆش بژیم. دەمەوێت لای كەسەكانی خۆم بەهایەكم هەبێت. دەمەوێت بە بازنەیەكی هێجگار گەورە بێن و بانگم بكەن:

-گۆستاڤ ئەندەشۆن، هۆو، تۆ لە كوێی؟

دەمەوێت ئەوان بمدۆزنەوەو هەموویان بێن بۆ لام و پێمبڵێن:

-چ شانسێكە، كە ئێمە تۆمان دۆزییەوە، ئەندەشۆن. ئێمە گەلێ نیگەرانی تۆ بووین، ئەندەشۆن. ئەگەر تۆ لەناوبچوویتایە زیانێكی گەورەبوو بۆ ئێمە، ئەندەشۆن. تۆ جێگەی شكۆمەندیت بۆ سولفافۆش، ئەندەشۆن. تۆ یەكێك بوویت لەوانەی، كە یەكەم كەس بوو خانووی خۆی بە دەستی خۆی دروستكرد، ئەندەشۆن، هەروەها تۆ منداڵگەلێكی گەلێك ڕێك و پێكت بۆ جیهان خستۆتەوە، ئەندەشۆن. تۆ گەلێ سەعاتت لە ژیانی خۆتدا بۆ كرێكاران تەرخانكردووە، ئەندەشۆن. تەنانەت تاقە دەنگدانێك چییە تۆ لەسەر قەنەفەكەت تۆتكەت نەگرتووەو هەمیشە ئەركی هاوڵاتیبوونی خۆت بەجێهێناوە، ئەندەشۆن:

بێ ئومێدی لە ناخمدا بۆتە تاریكەسەڵا، بیرم كردەوە:

-ئەمە ناكرێت ڕاستبێت! دیارە من ناوم گۆستاڤ ئەندەرشۆن نییە. دەنا بەم شێوەیەی ئێستام بوونم نەدەبوو، خۆ دەبوو كەسێك منی بە بیردا بهاتایەتەوە، دەبوو ئێستا بە بازنەیەكی هێجگار گەورە بهاتنایە.

هەر چۆنێك بوو توانیم نیگام دوور لە دەمی زەردی ئاسمان وەرچەرخێنم. توانیم لێوە مژۆكەكانی ئەو گیانلەبەرە نادیارە بە تەوقی سەرمەوە هەڵبكەنم. كاتێك دووبارە چوومەوە سەر زەوییەكەو ڕاوەستام، دەمودەست سەربەرەوخوار بە شاخەكەدا غلۆربوومەوە. بەناو دارستانە گەورەكەدا ڕامكرد و پاشان بە ناو دەوەنە چڕەكاندا. گەڵاكان هەروەك چلۆسكی تەڕ دەیاندا بە دەموچاومدا، چونكە لەوێدا سەرتاپا تاریك بوو، هەروەك ئەوە وابوو كە بەناو سووتوو بارینداا بەناو دارستانەكەدا ڕابكەیت. بەڵام ئەم جارەیان ناخم زۆر تاریكتر بوو. ناو ناخم لەتاو بێ ئومێدی بوو بووە تاریكەسەڵا.

كاتێك هاتمە خوارەوە بۆ ناو سولفافۆش و چاوم بە یەكەمین خانوو كەوت هاوارێك لە ناخمەوە هاتە دەرەوە. هاوارەكەم گەلێك ترسێنەر دەهاتە بەرگوێ. لە سەرەتادا خۆشم باوەڕم نەدەكرد كە ئەو نركەو ناڵەیە لە منەوە دێتە دەرێ. من نەمدەویست هاوار بكەم، بەڵام كەچی هەر هاوارم دەكرد. بەناو سولفافۆشدا ڕامدەكرد و دەمقیژاند. من نەمدەویست وابكەم، بەڵام بەهەر حاڵێك ئەو هاوارە هی من بوو.

زۆرینەی خەڵكی هەر زوو ڕاكشابوون و خەوتبوون، بەڵام هەندێكیان هێشتا هەر لە دەرەوە بوون و بەخەبەر بوون. خۆشم گەلێكیانم بەو لوورە لوور و نەعرەتە نامرۆڤانەییەی خۆم بێدار كردەوە. بەڕاكردن بە جادەی "كاسێرن"دا هاتمە خوارێ و دوور بەرەو گەڕەكی ڤیلاكان چووم، خەڵكی كەوتنە غاردان بە شوێنمدا، بەڵام من گەلێك تیژ ڕامدەكرد و دەمویست زوو بگەمەوە ماڵێ، دەمویست فریابكەوم و بچمەوە ماڵێ و داوای ئەوەیان لێبكەم كە چاوبڕنە

ناوچاوم، بۆیان روون بکەمەوە کە منیش لەو دنیایەی ئەواندا کەسێکم و بوونم هەیە. بۆ ئەوەی چیتر لەناو ئەو هەڵلوشینە گەورەیەی ئاسماندا نەتاسێم و مانگ قوتم نەدات. بەلاّم لەوێدا. لە سیلەی جادەی گەڕەکی ڤیلاکاندا ئەندەش یۆنسۆنم پێگەیشت و هاواری لێکردم:

-گۆستاڤ ڕاوەستە! ئارامت بێت، گۆستاڤ!

ئەندەش دەستی لێگیر کردم بەلاّم من بۆکسێکم دا بە کاکیلەیدا و بە پشتا غلمکردەوە. پاشان دەستمکردەوە بە ڕاکردن. بەلاّم هێندەی نەبرد خەڵکێکی زۆر دەستیانکرد بە ڕاکردن بە دوامدا.

-چییە سەرخۆشە؟ یەکێکیان هاواری کرد.

-ئەم تیژپەڕە گوستاڤ ئەندەشۆنە، یەکێکی تریان هاواری کرد.

-چییە سەری شڵەقاوە؟ یەکێکی تریان ووتی.

-دەمێکە سەری شڵەقاوە، یەکێکی تریان هاواری کرد.

من هەموو ئەم شتانەم باش دێتەوە بیر.

خەڵکەکە گەیشتن پێم و گەلێکیان خۆیان هەڵدایە سەرم. فریاکەوتم شەقێك بسرەوێنمە ناوگەڵی یەکێکیان و لووره لووری پێبخەم، هەروەها فریا کەوتم بۆکسێك بە یەکێکی تریاندا بکێشم و لاری بکەمەوە. بەلاّم ئەوان ئەوەندە زۆرتر بوون.. بە دەرزەن دەهاتن و خۆیان هەڵدەدایە سەر سەرم، ئیتر قۆڵ و قاچمیان لە پشتەوە چەماندەوەو بەرزیان کردمەوە.

-ئارامبە گۆستاڤ، یەکێکیان هاواری کرد.

-هیچ نییە گۆستاڤ. یەکێکی تریان هاواری کرد.

-تەلەفونیان بۆ ئەمبولاّنس کردووە، هەمدیس یەکێکی تریان هاواری کرد.

-بەدوای دکتۆریشدا ناردوویانە، هەمدیسان یەکێکی تریان هاواری کرد.

بۆ ناو چێشتخانەکە هەڵیانگرتم. ژنەکەم تازە لە کۆبوونەوەی ئاینی ئێوارانی یەك شەممەی گەڕابۆوە. بیرێر پاش ئەگلەنجە خەوتبوو، شەوی شەممە لەسەر یەکشەممە هەر هەموو هێزی فسکردبۆوەو ئەگەرچیش ئەو دەبێت بەیانی سەعات شەش بچێتە سەر کارەکەی. هارالد هێشتا لە شار نەگەڕابۆوە بۆ ماڵ، ئانناش لە سەفەری ئۆتۆمبیلی نەگەڕابووەوە. بەلاّم ئینگرید لەسەر ئەو قەنەفەیەی کە من هەمیشە لەسەری دادەنیشتم. دانیشتبوو. گۆرەوییە تەنکەکانی لە پێی داکەندبوو چاوی دەگێرا تا بزانێت گۆرەوییەکانی لە هیچ جێیەکدا نەدڕاون. کاتێك بە هەڵگرتنی منەوە هاتنە ژوورەوە ئینگرید رایکردە سەرەوە بۆ ژووری کچەکان بۆئەوەی دووبارە گۆرەوییەکانی لە پێ بکاتەوە. بێئەوەی پرسیاری ئەوە بکات کە من چۆنم. تەنها بیری لەوە دەکردەوە، کە نەیدەویست بەبێ گۆرەوی خۆی پیشانی ئەوانە بدات کە هوروژمیان هێنابووە ناو چێشتخانەکەوە.

لەسەر قەنەفەکە ڕایانخستم و هەندێکیان تا ئەو کاتەش هەر دەست و قاچمیان گرتبوو، من هێشتا دەملووراند. من نامەوێت بلوورێنم، بەلاّم چیبکەم لەناومەوە هەر لووره دەهاتە دەرێ. من نامەوێت خۆم بدەم بەسەر قەنەفەکەدا و ماسولکەکانم گرژبکەم و بە دانەکانم قەپ بگرم. بەلاّم چیبکەم هەموو ئەمانە روویاندا. خوای

گەورە، لە پڕا درکم بەوە کرد کە ئەمە دواتر دەبێتە چ بەدبەختییەکی گەورە بۆ من . لەوێدا هیچ چاوێك چاوەڕوانی منی نەدەکرد. کە دەیتوانی سەر لەنوێ رامبکێشێتەوە بۆ ناو دنیای ئادەمیزادەکان.

ژنەکەم دەستی خستبووە سەر گۆنای و دەهات و دەچوو.

-ئۆ، ئۆ، ئۆی! ژنەکەم دەیلاواندەوە.

بەلاّم ژنەکەم نەهات بەلای منەوە. چاوی نەبڕییە ناو چاومەوە، ئەو تەنها وشەیەك چییە بە منی نەووت. تەنها دەستی لەسەر گۆنای دانابوو دەهات و دەچوو هەناسەی هەڵدەکێشا :

-من دەبێت ئاوام بەسەر بێت؟

-ئارام بە خانم، یەکێك ووتی.

-هەموو شتێك قابیلی ڕوودانە، یەکێکی تر ووتی.

-هەر ئێستا دکتۆر دێت، یەکێکی تر ووتی.

-هەروەها ئەمبولانسیش، یەکێکی تریان ووتی.

دکتۆر هات. هاتە لام و دەستی لە جەستەم دا. دکتۆرەکە سەیری کردم بەلاّم تەنها سەیری سەر سنگمی کرد، هەروەها قاچم و دەستەکانم و چەناگەم، ئەویش چاوی لە چاوم نەبڕی.

-پیاوەکەت لەم دواییانەدا چۆن چۆنی بووە؟ دکتۆرەکە پرسیاری لە ژنەکەم کرد.

بەلاّم تاکە ووشەیەك چییە بە منی نەووت.

-بۆ چەند ساڵێك دەبێت پیاوەکەم خەمۆکی گرتوێتی. ژنەکەم وای ووت و دەستێکی بادا. لە ڕاستیدا پیاوەکەم هەردەم خەمۆك بووە. تەنانەت زەمانی خۆشی ئەو دەم هەر خەمۆك بوو کە داخوازیکردم. پیاوەکەم هەمیشە ناڕازیبووە، کەچیش هەمیشە خۆی وا پیشانداوە کە ڕازییە. من هەرگیز لە پیاوەکەم تێنەگەیشتووم. خۆزگە بۆ یەکجاریش ئەوەی دەیویست بیوتایە. هەمیشە هەنگاوەکانی خۆی بەدوای خەڵکی تردا ڕاستکردۆتەوەو واشی نیشانداوە کە ڕازییە، بێئەوەی هەرگیز ڕازیشبووبێت، دکتۆر. هەمیشە ویستوێتی خەڵکانی تر جێ پێی ئەم هەڵگرن، بەلاّم ئەو چی ویستووە هەرگیز لە بارەیەوە نەدواوە. دەیەوێت کە ئێمە هەست بەوە بکەین کە ئەو چی دەوێت. بەلاّم ئاخر چۆن ئینسان هەست بەوە بکات لە کاتێکدا کە ئەو هەرگیز هیچ شتێك نالێت؟ ئۆ، من هەرگیزاو هەرگیز نەمتوانیوە لێیتێبگەم! ئاخر سەختە دکتۆر، تۆ بتوانیت هەست بە خواستی مرۆڤێك بکەیت لە کاتێکدا ئەو کەسە خواستی خۆی بۆ هیچ کەسێك نەدرکێنێت.

پیاوەکەم کەسێکی سەختگیرە. ساڵ لە دوای ساڵ مەنگتر و بێدەنگتر بووە. هیچ ژنێك ناتوانێت لەگەڵیدا هەڵبکات. من سەیرم بە خۆم دێت دکتۆر کە چۆن توانیوومە تا ئێستا لەگەڵیدا هەڵبکەم. بێگومان هەرچۆنێك بێت ئەوەی کە بەسەریدا هات پێش چەند ساڵێك لەوەوبەر بوو ئەو کاتە بوو کە شەست ساڵی پڕکردەوە. ئەو دەڕۆشت و خەیاڵی بەوەوە لێدەدا کە ئاهەنگێکی زۆر گەورەی لە هۆڵی گەل بۆ سازدەکەن هەروەکو ئەوەی کە ئەو گرنگترین کەسبێت لە سولفافۆشدا. بەلاّم کاتێك کە پیاوەکەم شەست ساڵی تەمەنی پڕکردەوە، ئەو کاتە ئێمە لە سێهەمین مانگی مانگرتنماندا بووین. هیچ کەسێك بەهیچ جۆرێك خەیاڵی

بەلای ئاهەنگ گێڕان و پیرۆزبایکردندا نەدەچوو. ئێمەش ئەومان لەبیر چووبۆوە. هەموو کەس ئەوی لەبیر چووبۆوە. خۆ ئەو هەرگیز خۆشی ئەوەی کە دەیویست نەیدەدرکاند.

هەر لەویادا لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو بۆ خۆی هەر خەیاڵپلاوی لێدەدا و تەمەنای دەخواست. بەڵام با من شتێك بۆ تۆ باسبکەم دکتۆر، لەم دنیایەدا هیچ ژنێك ناتوانێت ژیانێکی تەواو بەڕێبکات بۆ هەڵهێنانی ئەو شتانەی کە پیاوەکەی تەمەنای دەکات.

—بەسە، بەسە. دکتۆرەکە پێیووت.

ئەمبولانسەکە هات. ئەو کاتە هێشتا من ڕاکشابووم و هاوارم دەکرد بەبێ ئەوەی خۆم بمەوێت هاوار بکەم. ڕاکشابووم و خۆم ڕادەپسکاند، ماسولکەکانم گرژدەکردەوە و بە ددانەکانم قەپمدەگرت. ئۆی خوای گەورە گەر ژنەکەم بهاتایەو چاوی ببڕیایەتە ناو چاومەوە! ئەگەر ئێستا بهاتایە و دەستی بخستایەتە سەر ناوچاوم و ماوەیەکی درێژ چاوی ببڕیایەتە ناو چاوم، ئەوا ئەو شتەی کە پێشتر ڕوویدا هەرگیز رووی نەدەدا! ئەوسا هەستمدەکرد کە من بۆ ئەو بوونم هەیە و ئەودەم لە نۆژەن لەدایك دەبوومەوە. بەڵام ئەو ئێستاو ئەوسا هەرگیز چاوی نەبڕییە ناو چاوم، هەر بۆیەشە من خۆم ڕادەپسکاند و هاوارم دەکرد، ماسولکەکانم گرژدەکردەوەو بە ددانەکانم قەپم دەگرت. دەمویست بانگی خوا بکەم، بانگی گرێتا و ئاننا، ئینگرید و هارالد، بیرێر و نیسێ و بێرتیل، بانگی هەموویان بکەم و پێیان بڵێم.

—سۆزتان هەبێت بەرامبەرم، قسەم لەگەڵدا بکەن، چاوتان ببڕنە ناوچاوم، هاوبەشم کەن لەگەڵ شتەکانی خۆتاندا تا منیش هەستبکەم مرۆڤم و دەژیم.

بەڵام من وشەیەکم بۆ نەدەهاتە سەر زمانم.

برینپێچەکان هاتنە ژوورەوە، بە پشتوێنێك لەسەر تەختەی ئەمبولانسەکە بەستیانمەوەو بەناو ئەو چێشتخانەیەی کە بە مەچەکەکانی خۆم دروستمکردبوو بە تەختەکەوە هەڵیانگرتم و بردیانم. ژنەکەم دەهاتو دەچوو دەستەکانی خستبووە سەر گۆنای. هەناسەی هەڵدەکێشا:

—ئۆ، ئۆ، ئۆی! ئەمە بەسەر مندا ڕوویدات!

من هیچ شتێك بەسەرمدا ڕووینەداوە! ئەوە بەسەر تۆدا ڕوویداوە نەك من. باشە چۆن شتێك بەسەر کەسێکدا روودەدات کە خۆی لە خۆیدا هیچ شتێك نەبێت؟

ئینگرید لەناو دەرگاکەدا وەستابوو دەستەکانی خستبووە سەرچاوی. ئینگرید فریای ئەوە کەوتبوو کە گۆرەوییەکانی جارێکی تر لە پێ بکاتەوە. بەڵام لە پەلە پڕوزکێدا گۆرەوییەکان لۆچیان تێکەوتبوو. من لەو باوەڕەدام کە هۆی ئەوە بوو ئینگرید شەرمی دەکرد و دەستەکانی خستبووە سەرچاوی. بیرێر هاتبووە ناو دەرگای ژووری کوڕەکان و وەستابوو، بەدەم ئەو دەنگەوە خەبەری بووبۆوەو هەر بەو بیجامەیەی کە لەبەریدا بوو هاتبووە خوارەوە، خەواڵوو توڕە دیار بوو. پێش ئەوەی چاوی بە تەواوەتی بکاتەوە خێرا هاواریکرد.

—بە نەعلەتم کردن ئەوە ئەو هەموو هەراو هوریایەتان لە چییە! ئێمە خۆتان دەزانن کە

پیاو لە ئەگلەنجە بوو‌بێت چۆن چۆنییە، من دەبێت سبەی بەیانی سەعات شەش هەڵسم و بچم بۆ کار.

خەڵکەکە دەرگاکەیان داخست دەنا زۆر لەوە زیاترم دەبینی و گوێ لێ دەبوو. ئەو دەرگایەیان کردەوە کە دەچووە سەر پردەکە. لەویادا مانگ، چاوەڕوانم بوو! دیسانەوە هەستم بە لێوە مژۆکەکانی دەوری تەپڵی سەرم کرد.

–پشتێنەکە قایم شەتەك بدەن. دەمویست هاوار بکەم.

زیاد لە ساڵێك لە نەخۆشخانە مامەوە. ئەوەتا ئێستاش دووبارە گەڕاومەتەوە ماڵەوە. هەموو شتێك تەواو هەر وەك ئەو سەروەختە وایە کە پێش ئەوەی ئەو شتە ڕووبدات کە ڕوویدا. تەنها منم لە ژوورەکەدا بێجووڵە دانیشتووم، دانیشتووم و ڕۆژنامەکەم بە دەستەوە گرتووە، ئێستا کەس چاونابڕێتە چاوم، کەسیش قسەم لەگەڵدا ناکات. ئینگرید دەچێت بۆ سەما، هارالد دەچێ بۆ شار، بیرێر دەچێ بۆ ئەگلەنجە و ئانناش دەچێت بۆ سواری ئۆتۆمبیل. هەموو دەڕۆنە دەرەوە. ژنەکەشم دەچێت بۆ دانیشتنی ئاینی. بەلام گرێتا ئەمشەو نیسێ و بێرتیل ناهێنێت بۆ ئێرەو ئەوانیش دەڕۆنە دەرەوە. ئیتر هەرگیز من گوێم لەوە نابێت کە ئەو بڵێ:

–نیسێ و بێرتیل لە ماڵی باپیرەیان دەبن، تا من و بابە دەچینە دەرەوەو کەمێك دەسوڕێینەوە.

ئەو دەڵێ کوڕەکان ئێستا ئەوەندە گەورەبوون کە بتوانن بێ ئێمە خۆیان شەو بەرنەسەر. بەلام من دەزانم کە بۆچی ئەو ئەوان ناهێنێت بۆ ئێرە، چونکە بەهۆی ئەو شتەوە بوو کە ڕوویدا. ئەوان لەوە دەترسن کە ئەو شتە جارێکی تر ڕووبداتەوە. جا کێ دەڵێت ڕوونادانەوە.. هەندێك جار هەم ئارەزوو هەم ترسی دووبارەبوونەوەی لەرزم لێدێنێت. هەتاکو ئێستاش من هیچ چاوێکم نەدیوە چاوەڕوانم بێت.

**پەراوێز:**

*لاش ئالین لە ساڵی 1915 لە شاری سوندسڤاڵ لە سوید لەدایك بووەو لە 1997دا مردووە. بە یەکێك لە چیرۆکنووسە هەرە ناودارو باشەکان دادەنرێت، کە زۆر جاران بە لاش ئالینی گەورە لە ئەدەبی سویدیدا ناوی دەهێنرێت.

خاوەنی چەندەها ڕۆمان و کۆمەڵە چیرۆکە.

**سەرچاوە:**

*Ingagon vntar mig; LARS AHLIN p.17-38, Stockholm. TIDEN Frlag*

# ماڵەکەی ئەستریون

خۆرخێ لویس بۆرخیس
لە عەرەبییەوە: سابیر شاکر

ڕەنگە تیروتانەی ئەوەم لێبدەن کە لووتم بەرزە یان تۆمەتی ئەوەم بدەنە پاڵ کە دڕندەو کێویم، لەوانەشە پێمبڵێن شێتە، ئەمجار شێت هەر پەتەڕی، ئەم پلار و تۆمەتانە قەشمەرییەك زیاتر ناهێنن، قاقایەك و تفێك! بەڵام با ڕۆژی خۆی بێ، بزانە چۆن ئەم هەتڵەبێژە[1] زمان درێژانە تەنبێ دەکەم، شەرتبێ کارێکیان پێبکەم با بەدەواری شڕی نەکردبێ، چونکە ڕاستییەکەی ئەوەیە من لە ماڵەکەی خۆم دەرناچم هەروەتر ئەوەش ڕاستە دەرگاکانی بەشەوو بە ڕۆژ لەسەر پشتن، ئاوەڵان بۆ هەموو کەس بۆ گشت گیانەوەرێکیش، کێ دەخوازێت با وەژوورکەوێ پاوپالآی وەبان چاوم، نەوەك ژنان دەیکەمە قیژە و شاتە شات، نە هاوار دەکەم و لە زیڕە دەدەم وەك ئەو هاوارو زیڕە هیسترییانەی لە کۆشك و تەلارە گەورە و زەلامەکاندا دەنگ دەدەنەوە. وتم هەر ژیانێك بژیم ئارام و گۆشەگیر، بۆیە بڕیارمدا خانوویەك سازبکەم، ماڵێك وێنەی نەبێ لە دنیادا، هەی ڕوویان ڕەش بێ، درۆ دەکەن کە دەڵێن لە میسر ماڵێك هەیە لەوەی من دەچێ، خانوویەك لە خانووبەرەی من بچێ! خورافاتێك پتر نییە، فۆرتەبازانە[2] نازانم ئەم درۆیانە چۆن دەنەخشێنن، لەوەش پیستر ئەوانەی ئەم درۆیانە هەڵدەبەستن دەڵێن ماڵەکەی چۆڵ و خاڵییە، ها ها..

ڕووت و پەتی، نە ناوماڵێکی هێژاو بەنرخ نە پۆرگ[3] و کەلوپەلێکی باش و خۆشەویست، هەر هیچ هیچ، هەی کوێرەوەبێ! بەڕاستی پێکەنینم پێیان دێ، چونکە بەندە ئیستریۆنم. جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە ئەوەی دێ بابێ نە دەرگایەك دەبینێ داخرابێ نە قفڵێك، هەموو ئاوەڵان، دەرو دەروازە هەموو لەسەر گازەرای پشت کراونەتەوە.

ئێوارەیەکیان شۆڕبوومەوە بۆ سەر شەقام و خیابانەکان و پێش ئەوەی تاریك دابێ گەڕامەوە، ئەوەی پاڵی پێوەنام وەدەرکەوم ئیحای هەرچی و پەرچی و کاڵفامەکان و ئەو

خولیا شێتانەیەم بوو بۆ دیتنی سەروسیمای لات و لەوارەکان[4]، ئەو سیما شڵە زەردانەی کە دەڵێی ناولەپی ئاوەڵاَن!

خۆر ئاوابیوو، بەڵام گریانی منداڵە رەنگ زەردەکە و نوێژە دەستە جەمعییەکان وتیان کە دەمناسن. خەڵکی نوێژیان خوێند، هەندێکیان هەلاتن، بڕێکیان بۆ سوژدە چوونە سەرچۆك، تاقمێك بە دیواری پەرستگاکەدا هەڵگژان، بڕێکی تر تاویان دایە کەمەر[5] و بەردیان چنییەوە، یەکێکیان پێموایە لە ژێر زەریادا خۆی شاردەوە و ماتەی هەڵگرت. خۆ گاڵتە نییە، دایکم شاژن بووە ناتوانم تێکەڵی رەشۆکی و رەمەکییان بم، گەرچی لە نەزاکەتی خۆم پێمخۆشە بچمە ناویان. مەسەلەکە ئەوەیە من ناوازە و تاقانەم، لینگەم نییە. گەرچی پێموایە چاکتر لە نووسین نییە بۆ گواستنەوە، دەربەستی ئەوە نیم مرۆیەك – وەك فەیلەسوفەکان– چی بۆ خەڵکی تر دەگوازێتەوە چی ئامۆتە[6]و بایەخێك، چونکە بێزاری و وەڕەزیی شتە پووچەکان لە ژیانی رۆحیی مندا جێیان نابێتەوە، من بۆ شتی مەزنتر سازکراوم. قەت حەرفێکم نەناسی، هەرگیز پیتێکم لە پیتێکی تر جیانەدەکردەوە، بێقەراری و بێ تۆتکەییم وایکرد هەست بکەم توانای ئەوەم نییە فێری خوێندەواری بم، هەندێکجار خەم لەوە دەخۆم، لە خوێندەواری، ئاخر شەوو رۆژەکان درێژن درێژ.

هەڵبەتە بۆ کەرەستەکانی سەرگەرمی و رابواردن و وەخت بەسەربردن دانەدەمام، نەخێر.. دەتگوت بەرخم بە قوچ وەردەگەڕامە دەرو دیوار، بەغار بەو دالاَن و ریواقە بەردینانەدا هەڵدەهاتم تا ئەژنۆم دەفیزانەوە[7] و لەترم دەدا و لەسەر زەوی گلۆر دەبوومەوە، لە سێبەری عەمارتەیەکدا یان گۆشەی پشتیر و تەویلەیەکدا خۆم مات و حەشار دەدا و چاوشارکێم دەکرد، ئەمما لەگەڵ خۆمدا، لێدەگەڕام لەسەربانەکان بەربمەوە تا لەشم شڵپەی بێ لە خوێندا، هەرکاتێکیش گەمەی خەوم کردبا، بە چاوی نووقاوو هەناسەی ئارام خۆم لە خەو دەدا، هەندێکجار هەر بەڕاستی دەنووستم و جارجاریش کە چاوم هەڵدێنا دەمدی رەنگی رۆژ گۆڕاوە، بەڵام گەمەی هەرە دڵخوازی من لە نێو ئەم هەموو گەمە و کایانەدا، وازی ئیستریۆنێکی تر بوو، ئەوەم لە هەموو یارییەکان پێخۆشتر بوو: یاری ئیستریۆنێکی تر وام خەیاڵدەکرد هاتووە بۆ دیدار و سەردانم و منیش ماڵەکەی نیشاندەدەم و بەڕێزەوە پێیدەڵێم: ئێستا بفەرموو با بگەڕێینەوە بۆ ڕاڕەوەکانی ئەندەروون، یان ئەمێستە لە دالاَنێکی ترین، یان – ئێستاکانێ کۆگای لمەکانت نیشاندەدەم، یان – ئێستە بە چاوی خۆت دەبینی چۆن نهۆم و چینی سەر زەوی لە چەند بەشێك پێکدێ – هەندێکجار دەکەومە هەڵەوەو هەردووکمان وێکڕا لە تریقەی پێکەنین دەدەین.

هەر خەیاڵی ئەم یارییانەم نەدەکرد بە تەنیا، نا، بەڵکو لە ماڵەکەش رامام و بۆم دەرکەوت هەر بەشێك لە بەشەکانی ماڵ چەند پاتە دەبێتەوە: هەر شوێنێك لە هەمانکاتدا شوێنێکی ترە، تەنیا خەزێنەیەك نییە یان تاقە حەوشێك یان تاکە ئەستێڵکێك یان یەك ناندێن و ئاشپەزخانە – لە ژمارە نایەن – چواردە ناندێن و چواردە

عـەمار و چـوارده حەوشـە و چـوارده حـەوزن. رامام، ماڵەکە بە ئەندازەی دنیایە یان چاکتر و روونتر بڵێم هەر بە خۆی جیهانە.

وێڕای ئەوەش بە عەمارەکاندا رابردم، ئەو ڕاڕەوانـەم هـەڵبوارد کـە لـە بـەردی خۆڵەمێشی دروستکراون، لە حەوشەکان پەڕیمەوە و سەرم لـە شـەقام دەرێنـاو پەرسـتگا و زەریاکـەم دیـت لەمـەش تێنەگەیـشتم، لـە مێـشکمدا نـەگونجا، شــاش مــام[8]، تــا خــەونێکی شــەوانە بــۆی روونکردمـەوە کـە چوارده پەرسـتگا و چـوارده زەریان کە هەموو شتێك چەند پاتە دەبێتـەوە — چواردەجار، بـەڵام پێدەچـێ تـەنیا دوو شت لـەم دنیایەدا چەند بارە نەبێتەوە، لە ئاسمان خۆری رەنگامـە و لـە خـوارێ ئیـستریۆن. رەنگـە مـن خوڵقێنەری خۆر و ئەستێرەکان بم، من ئەم ماڵـە گەورەو حەوش و حەسارەم رۆنـابێ، بـەڵام یادم نییە هەر نۆ ساڵ جارێك نۆ پیـاو دێنـە ماڵەکـەم تـا رزگاریـان بکـەم لـە خراپـە و بـەدکاری. لـە قـوڵایی راڕەوە بەردینەکانـدا دەنـگ و هەسـتی پێیـان دەبیـستم و شـاد و بەختـەوەر هەڵـدێم و دەکەومــە ســەرو ســۆراخیان. بــەرەو پیرییــان دەچــم. ئاهەنگەکــە چــەند چــرکەیەك زیــاتر ناخایەنێ یەك لە دوای یەك بەردەبنەوە بێئەوەی دەســتم خوێنــاوی بــێ کاتێــك بــەلادادێن دەمێننــەوە، لاشــەکان یارمــەتیم دەدەن تــا راڕەوێکـی تـر جیابکەمـەوە. نـازانم کـێن، بـەڵام دەزانم یــــەکێکیان لەســــەرەمەرگدا وتــــی فریادڕەســەکەم دێ، لــەو ســاتەوە تــا ئێــستا گۆشــــەگیری ئــــازارم دەدا، چــــونکە دەزانم فریادڕەســـەکەم هێــشتان زرپ و زینـــدووەو دواجار رۆژێك دێتە سەر زەوی!

گەر گوێم توانیبای هەرچی دەنگێك هەیە لە دونیادا بیچنێتەوە، ئەو ساتە منیش دەمتوانی ترپـەی پێـی جیابکەمـەوە! خۆزگـە دەیـبردم بـۆ شـوێنێك کـە دەرگـا و ڕاڕەوی کـەم بـێ. داخـوا فریادڕەســەکەم چـییە و رەنـگ و رووخـسار و قەڵافـەتی چـۆنە؟ کەڵەگایــە یــان مــرۆ؟ یــان کەڵەگایەکە سەرەکەی سەری بنیادەمە؟ یان لە خۆم دەچێ؟.

**فەرهەنگۆك:**

1–هەتڵەبێژ: ئەو کەسەی قسەی هەڵەشە و پەڵەشە دەکا.

2–فۆرتەباز: درۆزن.

3–پۆرگ: پێخەف.

4–لاتو لەوار: غەوغایی – هەرچی و پەرچی.

5–کەمەر: بەرد–کەڤر.

6–ئامۆتە: وەعزو ئامۆژگاری.

7–دەفیزانەوە: شل دەبوون.

8–شاش مام: حەپەسام.

**سەرچاوە:**

کوب الحليب، مختارات من قصص امريكا الاتينية، ترجمـة/ طلعـت شـاهين، دار الكرمـل للنـشر و التوزيـع، الطبعة الاولى: عمان 1987– لاپەرە 56–58.

# له بیرەوەرییەکانی پزیشکێك

ئانتوان چیخۆف

له فارسییەوە: حەمە رەسول حەسەن پوور

پرۆفیسۆر برووسکەیەکی لە کارخانەی لیالیکۆفەوە پێگەیشت. داوای لێکرابوو هەرچی زووتر بۆ بینینی نەخۆشێك بچێت. کچێك بە ناوی لیالیکفا کە بە گوێرەی زانیاری خاوەنی کارخانەکە بوو، نەخۆش کەوتبوو، ئەو برووسکە دوور و درێژو بێ سەروبنە جگە لەمە هیچی دیکەی لێدەرنەدەکەوت. بەم شێوەیە بوو پرۆفیسۆر دکتۆر "کۆرۆلۆف"ی سەرپزیشکی بەشەکانی خەستەخانەی بە مەبەستی بینینی نەخۆشەکە ناردوە.

ئەو پێویستبوو لە وێستگەی شەمەندەفەری مۆسکۆ جێگەیەك بگرێت و دوو وێستگە دواتر دابەزێ و نزیکەی چوار کیلۆمەترێك بە سواری ئەسپ رێگە ببڕێ بۆ ئەوەی بە شوێنی نیشتەجێبوونی نەخۆشەکە بگات. لەو وێستگەیەی بڕیار بوو دابەزێ، گالێسکەیەکی سێ ئەسپی چاوەڕوانیبوو. گالێسکەچی کلاوێکی رازاوە بە پەڕی تاوسی لە سەر بوو، وەك سەرباز وەلامی پرسیارەکانی دکتۆری بەدەنگی بەرز دەدایەوە: "نەخێر قوربان!"، "بەڵێ قوربان!"...

شەوی شەممە بوو، رۆژ لە ئاوابووندا بوو. کرێکارەکان پۆل پۆل لە کارخانە دەهاتنە دەرو بەرەو وێستگە دەچوون و کڕنۆشیان بۆ ئەسپی ئەو گالێسکەیەی کۆرۆلۆف سواری ببوو، دەبرد. دکتۆر لە سەیرکردنی دیمەنی دەوروبەردا نقوم بووبوو: کێڵگەکان، رۆژئاوا بوون، هاوینە هەوارەکانی ئەملاو ئەولای جادەکە، ریزی درەختەکانی (غان) بێدەنگی زاڵ بەسەر دەشتەکەدا.. وایدەهاتە بەرچاو هەنووکە دارستان و دەشت و هەتاویش لە رۆژی پشووی کۆتایی حەتوودا بە نیازن لەگەڵ کرێکارەکاندا پشوو بدەن، لەوانەشە لەدەرگای خوا بپاڕێنەوە..

دکتۆر لە مۆسکۆ لەدایکبوو بوو و هەر لەوێش خوێندبووی و ژیابوو، ناسیاری لە گوند

نەبوو و کارخانەی بەلاوە سەرنج راکێش نەبوو، تا ئەو رۆژەش بۆ هیچ کارخانەیەك نەچوو بوو. بەلأم زۆر جاری وا هەڵکەوتبوو بابەتێك سەبارەت بە کارخانەیەك بخوێنێتەوە یاخود لە میوانی خاوەن کارخانەکاندا لەگەڵیاندا پەیڤیبوو. هەر جارەی لە دوور، یان نزیکەوە چاوی بە کارخانەیەك کەوتبا.. لای خۆی بیری دەکردەوە بە گوێرەی یاسا لەودیوی دیوارەکانی بەرواڵەت ئارامدا هیچ شتێك جگە لە نەزانی بێئەملاوئەولا و خۆویستی بێواتای خاوەنکار و ماندوو بوونی تاقەت پڕوکێنی کرێکاران و شەروکێشە و مەیخواردنەوەو چەندان جڕوجانەوەری کە هیچ بەدی ناکرێ. ئێستاکە کرێکارەکان لە رەوشێکی تێکەڵ بە ترس و رێزدانانەوە خۆیان لە رێگەی گالێسکەکە لادەدەن و رێگەی بۆ چۆڵ دەکەن، لە رواڵەتەکانیان و کڵاو خوودە و هەڵسوکەوتیاندا، هێمای سەرخۆشی و نارەحەتی دەروونی و دڵەڕاوکێ و پیسو پۆخڵی لەشیان هەست پێدەکرێت.

گالێسکەکە چوە نێو کارخانەکەوە، خانووی بچووکی کرێکاران و رواڵەتی ئافرەتان و جلووبەرگ و پەتووە هەڵواسراوەکان بە پەلە بە پێش گالێسکەکەدا تێپەڕدەبوون. گالێسکەچی بێئەوەی تۆزقاڵێك لە خێراییەکەی کەمبکاتەوە بێ پسانەوە هاواری دەکرد: "هۆی، بالەك!". حەوشی دەشتەکی کارگەکە، وشك و قاقر و بێگیا و گۆڵ بوو. پێنج بینایەی زەبەلاح دوور لە یەکتری، چەند دانە مەخزەنی کەلووپەل، چەندین بینایەی تەختە و هەموویان تۆز و خۆڵ گرتوو کە وەك لیتەی خۆڵەمێشی دەچوون، جەمەلۆنی سەوز و سووری ماڵە کارمەندەکان و باخچە بچوکەکانیان کە مرۆڤی وەبیر سەوزەڵانی نێو دەشت و هاموون دەخستەوە، لێرەو لەوێ بەرچاو دەکەوتن. گالێسکەچییەکە گالێسکەکەی لەپڕێك بەرامبەر بە خانووە رەنگ رەملێیەکان کە بەم دواییانە بۆیەکرابوون، راگرت. لە حەوشەی پێشەوەی خانووەکەوە باخچەیەکی بچووك و چەند درەختی بچووکی یاسەمەنی رەنگ بنەوشی تۆز و خۆڵگرتوو بەدیدەکرا. پلیکانەکانی دەرگای چوونە ژوور بۆنی بۆیەی تازەیان لێدەهات. لە هۆڵ و وخچانە و پێش دەرگاکە دەنگی چەند ئافرەتێك دەبیسترا کە دەیانگوت:

-فەرموو ئاغای دکتۆر.. فەرموو بۆ ژوورەوە، چاوەڕوانت بووین، خوا شوکر ئاخرەکەی تەشریفت هێنا.. خەم و خەفەتمان لە رادەبەدەرە.. لەملای جەنابی دکتۆریشەوە ئاخ هەڵکێشان و ورتەورت ماڵەکەی پڕکردبوو. خاتوو "لیالیکفا" خانمێکی بەساڵاچووی کەم تا کورتێك گۆشتن و کراسێکی ئاوریشمی رەشی قۆڵ مۆدێرنی لەبەردابوو. بەلأم کولمەکانی سادەبوون و نەخوێندەوارییان لێدەباری. بە نارەحەتی و دڵەڕاوکێوە لە دەمووچاوی دکتۆر ڕامابوو و نەیوێرا دەستی بۆ لا درێژبکات. لە پەنای ئافرەتێکی ژیر و لاواز و قژ کورت کە چاویلکەیەکی پەنس و بلووزی رەنگینی پۆشیبوو، راوەستابوو، کارەکەری ماڵەکە بە ناوی "کریستینا دیمیتری یۆنا"وە بانگی دەکرد.

دکتۆر بە گومانەوە بۆی دەرکەوت دەبێت مامۆستای ماڵەوە بێت. وەك زانرا

پێشوازیکردنی دکتۆر لەسەرشانی ئەم ژنەی کە بە خوێندەوارترین کەسی ماڵیێ دەژمێردرا، دانرابوو، چونکی هەرکە دکتۆر چووە ژوورەوەو دەستیکرد بە شیکردنەوەی هۆی نەخۆشییەکە ئەویش بە دەستنیشانکردنی هێندیێ وردەکاری بێبایەخ و لە هەمانکاتدا بە پێویستی نەدەزانی باسی نەخۆشەکە و باری دەروونی ئەو بکات.

کاتێکی خاتوو "لیالیکفا" بیێ جووڵە لە پەنا دەرگاکەوە وێستا بوو چاوەڕوانی دەکرد، دکتۆر و خانمی مامۆستا دانیشتن و سەبارەت بە نەخۆشەکە دوان. دکتۆر لە کۆی وتەکانی "کریستینا دیمیتری یۆنا" بۆیدەرکەوت نەخۆشەکە کیژۆڵەیەکە بەناوی "لیزا". نزیکەی 20 ساڵ تەمەن، تاقە کچی خاتوو "لیالیکفا"یەو و تەنیا میراتگری بنەماڵەکەیەتی. ماوەیەکی زۆرە نەخۆش و دەردەدارە و پزیشکی زۆر دەرمانیان بۆ کردوەو لە شەوی رابووردووەوە تا ئەمڕۆ بەیانی لێدانی دڵی هێندە بە تەوژم بووە هەموویان لە ترسی ئەوەی بمرێت چاویان نووقاندوون. خانمی مامۆستا جار ناجارێك دەستی بە لێوەکانی دادەهێناو بە دەنگی بەرز دەیگوت:

–دەتوانم بڵێم "لیزا" لە منداڵییەوە نەخۆشە. دکتۆرەکان دەڵێن نەخۆشییەکەی دەروونییە. بەڵام کاتێك منداڵبوو دکتۆرەکان بوون بە هۆی ئەوەی ملەخڕە بگرێت. من وای بۆدەچم نارەحەتیەکەی ملە خڕە بێت.

پاشان چوونە ژووری نەخۆشەکە، کیژێکی باڵق و درێژ و بەخۆوە بوو، لە ناشیرینیان هیچی لە دایکی کەمتر نەبوو. چاوی بچووك، دەمولێوو چەناگە یان، لەبەری پێیانەوە تا چەناگەی بە پەتوو داپۆشیبوو: "لیزا" لەم کاتەدا دکتۆری هێنایەوە یادی بوونەوەرێکی دەردەداری چارەرەش، چونکی بەزەییان پێدادێت دەرمانی دەکەن. هەرگیز بڕوای نەدەکرد ئەم کچە میراتگری ئەم کارخانە گەورەیە و بینایە جۆراو جۆرانە بێت. رووی لە کچە گەنجەکە کرد و گوتی:

–ئەمەش ئێمە، هاتووین چاکت بکەینەوە، سڵاو!

ئەمجار خۆی پێناساند و دەستە زل و ساردەکەی کچەی گووشی. نەخۆش لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشت، لەبەرئەوەی دەمێك بوو عادەتی بەم چەشنە لێڕوانینی دکتۆرەکان گرتبوو، خۆی نایە ژێر دەست دکتۆر بۆئەوەی چاوی لێبکات. پاشان وتی:

–دەزانی، دڵە کوتەمە.. لە دویێ شەوێوە هێندە تووشی ترسان بووم، نزیکبوو دڵم راوەستێت! دەرمانم بدەیە.

–دەتدەمیێ، ئارامبەوە!

"کۆرۆلۆف" چاوی لێکرد و شانی هەڵتەکاندو وتی:

–دڵت هیچی نییە. ئیشەکەی رێکو پێکە و جێگەی نیگەرانی نییە. لەوانەیە دەمارەکان هێندێك سووڕابن، ئەویش شتێکی وا نییە. ئێستا وا بزانم لە قەیرانەکەت تێپەڕاندبێت. هەر بۆیە بە ئاسوودەییەوە لێی درێژبەو بخەوە.

لەم کاتەدا چرایەکیان بۆ ژوورەکە هێنا. کیژە گەنجەکە چاوی چووککردنەوە، لە پڕ سەری لە نێو دەستانی گرت و لە پرمەی گریانی دا. ئەو کاریگەرییەی وەك بوونەوەرێکی چارەرەش و دەردەدار لەسەر دکتۆری دانابوو

به جارێك كاڵبۆوه، به چەشنێك "كۆرولۆف" نه چاوه وردەكانی دەدین نه ناقۆڵایی خوارەوەی چەناگەی، بەڵكوو ڕەوشێكی ئارام و بەژانی قەڵافەتێكی بەدیدەكرد كەژیرانەو داچڵەكێنەر بوو. هەنووكە بە كیژێكی شیاوی دەزانی و حەزی دەكرد نەك بە دەرمان و ئامۆژكاری كردنو بەڵگە هێنانەوە، بگرە بە پەیڤێكی سادەو ساكار و میهرەبانی ئامێزەوە ئارامی بكاتەوە. دایكی سەری كچەی بە سینگی خۆیەوە گووشی، ڕەنگ و ڕوخساری پیرەژن بێ هیوایی و پەژارەی لێنیشتبوو! ئاخر ئەو دایكێك بوو شیری دابۆیە، گەورەی كردبوو و لە هیچ شتێك بێ بەهرەی نەكردبوو، ژیانی خۆی لە پێناوی ئەودا دانابوو، بۆ ئەوەی كچە جگەرگۆشەكەی زمانی فەرانسی و مۆسیقا فێربێت، دەیان مامۆستای ماڵەوەی بۆ گرتبوو، هەمیشە شارەزاترین دكتۆری بۆ دەهێنا و ئێستا بە هیچ شێوەیەك هۆی ئەم هەموو دەرد و ڕەنجكێشانەی نەدەزانی. بۆیە شپرزەو نیگەران بوو، شێواو دەست و پێی خۆی گومدەكرد و هەست بە گوناح و داماوی و شێواوی لە گۆناكانی بەدیدەكرا, دەتگوت لە بەئەنجامگەیاندنی كارێكی زۆر گرینگدا كەمتەرخەمی نواندووە، یاخود لە ئامادەكاری یەكێكی تردا بۆ كیژەكەی، كە خۆشی نەیدەزانی كێیە، درێغی كردووە. هەروا كە سەری كچەی بە سینگییەوە دەگووشی، گوتی:

"لیزا"ی ئازیزم، دیسان دەستیپێكرد.. دیسان.. ئازیزی دڵەكەم باڵندە بچووكەكەم، قسان بكە.. ئاخر چی بووە؟ بەزەییت بە دایكتدا بێت، دەی قسە بكە!

ئیدی هەردووكیان ڕۆندكیان باراند. دكتۆر لەسەر لێواری قەرەوێڵەكە دانیشتبوو، دەستی نەخۆشەكەی گرت و دڵخۆشی دایەوەو گوتی:

-بەسە. ئەسرین ڕشتن چ سوودێكی نییە هیچ شتێك لە دونیادا نرخی ئەم فرمێسكانەی نییە. تكایە ئارام بن..

ئەمەی وت و لای خۆی بیری كردەوە: "كاتی ئەوەیە مێردێكی بۆ پەیدا بكەن.."

"كریستینا دیمیتری یۆنا" وتی:

-پزیشكی كارخانەكەمان "پۆسیۆم دۆبرۆم"ی بۆ "لیزا" دانابوو، بەڵام نەك چاكنەبوو بگرە خەراپتریش بوو. وابزانم ئەگەر دەرمانی دڵ.. (ناوی دەرمانەكەم لەیاد نییە)ی بدەنێ كاریگەر بێت.

دیسانەوە سەبارەت بە نەخۆشی كچەكە دوا. هێمای هەوڵ و كۆشیش بە ڕوخسارییەوە دیاربوو. قسەی لە قسەی دكتۆری دەكردو نەیدەهێشت دكتۆر قسەكانی بكات. بە چەشنێك دەتگوت وەك خوێندەوارترین ئافرەتی ماڵەكە ئەركی سەرشانییەتی لەگەڵ دكتۆر ئەویش لە بواری زانستی پزیشكیدا بێ پسانە زماندریژی بكات. "كۆرۆلۆف" هەستی بە خەمناكی كرد و كاتێك لە ژوورەكە دەچووە دەر بە خاتوو "لیالیكفا"ی وت:

-لە ڕەوشی تەندروستی كچەكەتدا شتێكی تایبەتی بەدیناكەم. لێیگەڕێن پزیشكی كارخانەكە چارەسەرییەكەی درێژە پێبدات. دۆزینەوەو چارەسەرییەكەی تا ئێرە ڕاست بووەو من هۆیەك بۆ گۆڕینی پزیشكی چارەسەری كچەكەتان بەدیناكەم، باشە بۆ دەبێت بیگۆڕن؟!

نەخۆشـــی کـــچەکەتان مەترســـیدار نییـــە.. شتێکی ئاساییە.

لـەم کاتـەدا بـە شـێنەیی دەسکێـشەکانی لەدەستی دەکرد. خاتوو "لیالیکفا" بیَ جووڵە ڕاوەستا بوو و بە چاوی پڕ ئەسرینەوە سەیری دەکرد، دکتۆر درێژەی پێدا:

–نیو کاتژمێر بۆ وەرێکەوتنی شەمەندەفەری کاتـژمێری (1) مـاوە هیـوادارم بیگـەمیَ، خـاتوو "لیالیکفا" پرسی:

–ناکریَ ئەمشەو لای ئێمە بمێنییەوە؟

هـەر بـەدەم فرمێـسك باراندنـەوە چـاوی لـە دەرگای دەرەوە دەکرد لێی زیاد کرد:

–شـــەرمیَ دەکـــەم ببمـــە مایـــەی دەردی سـەریتان. بـەڵام تـوبی خـوا بمێننـەوە، هـەر ئـەم منداڵـە شـك دەبـەم.. نـازانی دویَ شـەو چـەندە ترساین.. ئێستاش هەست بە دڵەڕاوکیَ دەکەم.. توبی خوا تەشریف مەبە..!

دکتۆر بەنیاز بوو بڵێت، پێویستە بگەڕێتـەوە چـونکی لـە مۆسـکۆ کـاری هەیـە، ئـەمجار بنەماڵەکەشـی چـاوەڕوانن بگەڕێتـەوە. حـەزی نەدەکرد ئێـواریَ و شـەوێکی بێئـەوەی پێویست بکات، لە ماڵە خەڵکیدا تێپەڕ بکات، بەڵام هەر کـە چـاوی بـە سەروسـیمای خـەماوی دایکەکـە کەوت، بێئەوەی هیچ بڵێت بە ئاخ هەڵکێشانەوە دەستکێشەکانی لە دەستی داکەند.

بـەم بۆنـەوە گـشت چـرای سـاڵۆن و ژووری میوانانیـان هـەڵکرد. دکتـۆر چـووە پـشت مێـزی پیانۆیەکـەو تاماوەیـەك پـەرتووکی نۆتـەکانی هەڵدایـــەوە، پاشـــان ســـەیری تـــابلۆو وێنـــە هەڵواســـراوەکانی دیوارەکـــەی کـــرد، تـــابلۆی زەیـتیو چوارچـێوەی زەرکفت، دیمـەنی شـێوە دوورگـەی کریمـە و دەریـای خرۆشان و کەشتی بـچووك و لـە خواترسـێکی کریـستان بـوون و هـــەموویان ویـــشك و نـــاقۆڵا و بێواتـــا ڕەنـــگ کرابـوون.. بـەڵام ڕوخـسارەکان تێـك قوویـاو و چـــاویان سەرســـامگرتوو بـــوو، بەداخـــەوە قیافەیـــەکی ســـەرنج ڕاکـــێش و دڵگیریـــان تێدانـەبوو.. بـۆ وێنـە ئاغـای "لیـالیکۆف"ی بـاوکی "لیـزا"ت دەدی بـە تـەوێڵی کـورت و سەروســـیمای لەخۆڕازیـــەوە میـــداڵێك و نیـــشانەیەکی خاچـــی ســـووری بەملییـــەوە هەڵواسـیبوو، لـە چوارچـێوەیەکی ئاڵتوونیـدا دانیـــشتبوو و بـــەرگی فـــەرمی لـــە ئەندامـــە ناقۆڵاکەیدا بۆی دەگریا. بە کورتی فەرهەنگێکی هـەژار و ڕازاندنەوەیـەکی نارەسـەن و، ڕسـوا، هـــەروەك جلووبـــەرگی فـــەرمی "لیـــالیکۆف"، شـەوقی کـەڤ ژوورەکـان و چلـچراکان دەمـاری دکتۆری دەبزاوت، ڕێك چیرۆکی ئەو بازرگانەی وەبیر دەهێنایـەوە کـە میداڵـەکانی لـە سـینگی دەداو دەچووە گەرماو.

لـە پـێش خانەکـە سـرتە سـرتێك هاتـە بـەرگویَ یـەکێکیش پرخەیـەکی لەسـەر خـۆی دەکـرد. لـە پـڕا دەنگێکـی بـۆڕ و پچڕپـچڕی زەنگدار کە وێنەی تا ئێستا هەرگیز نەبیستبوو، لـــەلای ڕاســـتی حەوشـــەکەوەی هاتـــە بـەرگویَ، دەنگێـك بـوو کـە دەنگدانەوەکـەی ناخۆشـــبوو. بـــیری کـــردەوە: "بـــەهیچ نرخێـك ئامـادەنیم لـەوەها شـوێنێکدا بـژیم" و دیـــسانەوە دەســـتی بـــە هەڵدانـــەوەی لاپـــەڕەکانی دەفتـــەری نۆتەکـــە کـــرد. "کریـستینا دیمـیتری یۆنـا" بـە ئـارامی هاتـە ژوورەکە و وتی:

-جەنابی دکتۆر خواردن ئامادەیە تەشریف بێنە سەر مێزەکە.

مێزە گەورەکە پڕ لە خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆر بوو، بەلاّم تەنیا دەوری و کەوچك و چەتاڵیان بۆ دووکەس دانابوو. بۆ دکتۆر و "کریستینا دیمیتری یۆنا". خاتونی مامۆستا بە پەلە خواردنی دەخوارد و لە کاتێکدا لە سەرەوەی چاویلکەکەیەوە چاوی لە دکتۆری دەکرد وتی:

-کرێکارەکان زۆرمان لێ رازین. زستانان شانۆیان پیشان دەدەین و کرێکارەکان خۆیان دەوری تێدا دەبینن. کۆڕی کتێب خوێندنەوە ساز دەکەین و چاخانەی زۆر باشیشمان هەیە. ئەوان زۆر بە جیدی لایەنگرمانن، بە چەشنێك کاتێك رەوشتی تەندروستی "لیزا" بەرەو خەراپبوون چووبوو ڕێ و ڕەسمی دووعایان بۆ پێك هێنا. راستە نەزان و نەخوێندەوارن بەلاّم خۆ هەستیارن.

-سەرنجم دا، پیاوێك لەم ماڵەدا نیە.

-بۆچوونەکەت بە تەواوی راستە. "پیوتەر نیکانڤیچ" نزیکەی شەش مانگ لەمەوبەر عومری خۆی بەئێوە داو ئێمەی بە تەنیا هێشتەوە. ئێستا ماوینەوە سێ کەس.. هاوینان لێرە دەبین بەلاّم زستان بۆ دەوروبەری مۆسکۆ دەگەڕێینەوە، بۆ پۆلیانکا دەچین، خۆم یازدە ساڵە لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا دەژیم. ئیتر لە خۆیانم.

خواردنەکەیان بریتیبوو لە ماسی "چاڵباش"، شفتەی مریشك و خۆشاوی میوە. خانمی مامۆستا دەیخوارد و جاروبار دەمی بە دەستە بچووکەکەی پاکدەکردەوەو دەیگوت:

-ئاغای دکتۆر تکات لێدەکەم شەرم مەکە، فەرموو، تکایە!

وا دیار بوو لەم ماڵەدا بە ئاسوودەیی ژیان دەکات. کەش و هەوای دەرێ فێنك ببوو، بەیان لە کازیوەی دابوو، هێڵی عەمبار و بینایە تەختەکان و پێنج بینای سەرەکی کارخانەکە و دووکەڵکێشە درێژەکانیان بەرەبەرە لە هەوای تەم و مژاویدا دەردەکەوتن. کارخانەکە بە بۆنەی رۆژی یەکشەمۆی کۆتایی حەوتووەوە لە پشوودانادا بوو پەنجەرەکانی تاریك بوو.

تەنیا لە خانوویەکدا زۆپایەك دایساوو دووکەڵی دەچۆوە دەرێ و لوولەکەی جاروبار پریشکە ئاگری لێ بەرز دەبۆوە. لەولای حەوشەکەوە لە دوورەوە بۆق دەیان قراند و هوزارێك سروودی دەچڕی.

"کورۆلۆف" چاوی بریبووە بینا سەرەکییەکەی کارخانە و بۆ جارێکی دیکە بیری لەم شتە دەکردەوە کە هەموو جارێ بە بینینی کارخانە بە مێشکیدا دەهات: گریمان کردم شانۆ و کۆڕی کتێب خوێندنەوەیان بۆ کرێکارەکان سازکردبێت، یاخود پزیشکیان بۆ دامەزراندبن و کارچاکیان بۆ کردبن، بەم رەوشەوە ئەو کرێکارانەی دکتۆر لە رێگەی کارخانەکە دیبوونی بە ڕواڵەت لەگەڵ ئەوانەی بە منداڵی دیبوونی و ئەو دەم شانۆ و چاکسازی لە ئارادانەبوو، هیچ جیاوازیان نەبوو.

ئەو وەك پزیشکێك چارەسەری دەردە بێدەرمانەکانی دەکرد. کارخانەکەش وەك دەردێکی بێدەرمان دەهاتە بەرچاوو لە هەمانکاتدا چاکسازی ژیانی کرێکارەکانی

بەشـــــتێکی زیـــــادە نـــــەدەژمارد بـــــەڵام ئـــەم هەنگاوانـــەی بەرامبـــەر بـــە نەخۆشـــی بێدەرماندا دادەنا.

هـــەروەك لـــە دوو پەنجـــەرە ئەرخەوانییەکـــە رامابوو لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە:

"دیـــارە دەبێـــت لـــەم کـــارەدا خـــراپ لێتێگەیشتنێك لە ئارادا بێت.. هەزار و پێنسەد تا دوو هەزار کرێکار بێئەوەی چرکەیەك پشوو بدەن، لە رەوشێکی ناساغی و بەدوور لە پاکوو خـــاوێنی کارخانەکـــەدا بـــە رشـــتنی ئارەقـــەی تەوێڵیان قوماشی خەراپ بەرهەم دەهێنن. تەنیا بۆ ساتێك جاروبار هەلیان بۆ دەرەخسێت لە چوار دیواری چاخانەکەدا خۆ لە چنگ ئەم مۆتەکەیە رزگار بکەن. لەم نێوەدا نزیکەی سەد کەسیش چاودێری بەسەر کارەکانیاندا دەکەن. ئەم تاقمە تـەنیا مـاف کـوژی، سـزادان و بـێ حورمەتی بە کرێکارەکانیان لە دەست دێت. لەم نێوەدا تەنیا دوو سێ کەس کە ناویان خاوەن کارخانـــە و ئەربابـــە و دەســـت لـــە رەشـــوو سـپی نـادەن و لـە هـەموو قوماشـێکی خـەراپ بێـزارن و لـە دەست رەنجی هـەموو ئـەم خەڵکە سوودمەند دەبن.

بەڵام چ سوودمەندییەك؟ خاتوو "لیالیکفا"و کچەکەی "لیزا" مرۆڤی چارەرەشن و مرۆڤ زگی پێیان دەسووتێت چاویان لێبکا.

لـەم نێوانـەدا تـەنیا ئـەم قـەیرە کـچە گەمـژە چـاویلکە لـە چـاوە، واتـا "کریـستینا دێمـیتری یۆنا"یـە سوود لـەم هـەموو نیعمەتە وەردەگرێ. کەواتە دەکرێ بەم ئاکامە بگەی کە پێنج بینای کارخانە سەرگەرمی کارکردنن و قوماشی خراپ بەرهـەم دێـنن و لـە بـازارە رۆژهەڵاتییەکانـدا دەیفرۆشن، بۆئەوەی "کریستینا دێمێتری یۆنا" بتوانێ ماسی چاڵباشی لـێ بخـواو و باشـترین خواردنەوە بنۆشێ؟!

لە پڕ دەنگێکی سەیر کە بەر لە خواردنی نانی ئێوارەیش گەیشتبۆوە بەر گوێ هەمدیس لـە هـەوادا دەنگیدایـەوە. لـە پـەنا خانوویـەکی کارخانەکـــەدا یـــەکێك لـــە پارچـــە ئاســـنێکی رادەکێشا و لە پڕ دەنگدانەوەکەی بە چەشنێك کپـــدەکرد کـــە وەك دەنگـــی "دڕ.. دڕ.. دڕ.." دەگەیشتە بەرگوێ. نزیکەی سی چرکە دواتر دیسانەوە لە خانوویەکی سەرەکی کارخانەکەوە دەنگێکی لە چەشنی "دڕین.. دڕین.. دڕین..." لە هەوادا دەنگیدەدایەوە. بە گوێرەی زانیاری ئەوان چاوەدێری کارخانەکە بوون و کاتژمێری یـــازدەی شـــەویان رادەگەیانـــد پاشـــان لـــەلای بینایەی سەرەکی کارخانەکەوە دەنگێکی وەك: "ژاك.. ژاك.. ژاك.."گەیـشتە بـەر گـوێ و بـەم چەشـــنە لـــەلای دوو خـــانووە ســـەرەکییەکەی دیکەشـــەوە و لـــە ســـەربانەکان و لـــە پـــشت دەروازەی هاتنە ژوورەوەی کارخانەکە دەنگی جۆراوجـۆر بـەرگوێ گەیـشت. هـەروا بزانـە شـەیتان، ئـەو شـەیتانەی لێـرەدا هـەم خـاوەن کارخانـە بـوو. هـەم خـاوەنی کرێکارەکـان و لـە هەمانکاتـدا فێڵـی لێـدەکردن و دێـو ئاسـا و بـە چاوی ئەرخەوانییەوە لە بێدەنگی شەوەزەنگدا ئەم دەنگانەی دەردێنان. دکتۆر لە حەوشەکەوە دەرکـــەوت و بـــەرەو ســـەحرا چـــوو. لـــەلای دەروازەکەوە دەنگێکی بۆڕ گازی کرد:

-کێی؟

لـــە دڵـــی خۆیـــدا گـــوتی: "رێـــك وەك بەندیخانەیە" و وەڵامی چاودێری کارخانەکەی

نەدایەوە. لە سەحرادا قڕەی بۆق و ئاوازی بولبولان باشتر دەبیسترا و بۆنی شەوێکی بەهار چاکتر هەستپێدەکرا. دەنگی تەقەتەقی شەمەندەفەرەکان لەلای وێستگەی هێڵە ئاسنەکەوە دەهات، کەڵەشێری خەواڵوو لە شوێنێکەوە دەیانخوێند. بەم حاڵەوە شەوێکی ئارام و جێهان لە خەوێکی خۆشدا لێی خەوتبوو.

لە سەحراکە شوێنێکی نەك زۆر دوور لە کارخانەکەدا، چاوی بە هێندێ داروپەردوو کەوت کە بۆ دروستکردنی خانوویەکی دارینی نوێ لەسەر یەکیان دانابوو. دکتۆر لەسەر تەختەکاندا نیشت و لای خۆی بیری کردەوە: "لێرە تەنیا خاتوونی مامۆستا باش رایدەبوێرێ و کارخانەکەش تەنیا بە مەبەستی خۆشگوزەرانی ئەو لە کاردایە. بەڵام نا! تەنیا رەنگ و روخسارێکی بە درۆیە، لێرەدا گشت شتێ تەنیا و تەنیا لە خزمەت شەیتاندایە".

بیری لەو شەیتانە کردەوە کە خۆی بڕوای بە بوونی نەبوو، سەیری ئەو دوو پەنجەرەیەی کرد کە رووناکییان لێوە دەهات، وای هاتە بەرچاو کە شەیتان خۆی، ئەو بە توانا نادیارەی پێوەندی نێوان زۆردار و لاواز، واتا ئەم هەڵە گەورەو لە باشبوون نەهاتووەی خوڵقاندووە، بە دوو چاوی ئەرخەوانییەوە لەم ڕاماوە.

یاسای سروشت دەڵێت دەبێ زۆردار ژیانی لاواز تێکبدات، بەڵام ئەم واتایە تەنیا لە لاپەڕەی رۆژنامەکان و کتێبی منداڵە قوتابییەکاندا زووتر دێتە نێو مێشکەوە لە کاتێکدا ئەو شۆڕبا شێلمەی سەرچاوەی ژیانی رۆژانەیە و ئەم هەرەج و مەرەجەی شتی بچووك و بێبایەخەی تان و پۆی پێوەندی نێوان مرۆڤەکان پێك دێنێ، ناکرێ بە یاسای سروشت بژمێردرێ. بەڵکوو دەبێ بەناوی نەزانی لۆژیك و دەرك نەکردن ناودێر بکرێ. چونکی لەوەها کاتێکدایە زۆردار و بێ هێز لە ئاست هێزێکی ڕێکخەر و نەناسراو بەدوور لە ژیان و لەگەڵ مرۆڤی نەناسراودا، سەر دادەنەوێنن و وەك یەك دەبن بە فیدای پێوەندی یەکتری. "کۆرۆلۆف" کە لەسەر تەختەکان دانیشتبوو و چووبووە نێو ئەم بیرو هزرانەوە، بەرە بەرە بە بیریداهات، ئەم هێزە نەناسراو و نهێنیە لە تەك خۆیدایە و سەیری دەکات. لەم کاتەدا ئاسۆ لە رۆژهەڵاتەوە خەریکی رەنگ بزرکانبوو، کات بە پەلە تێدەپەڕی. کەس لە پەنایدا بەرچاو نەدەکەوت، وەك ئەوەی هەموو کەس و هەموو شتێ لەناو چوویێت، پێنج بینایەی سەرەکی کارخانەو دووکەڵکێشە بەرزەکانیان لە ئاسۆی خاکی رەنگدا، دیمەنی تایبەتیان بەخۆوە گرتبوو، کە لەگەڵ دیمەنی هەر ئەم خانووانە لە روشنایی رۆژیدا جیاواز بوو. لەم ساتەوەختەدا موەلیدەی کارەباو هەڵم و جیهازی تەلەفوون و هی تری ژێر سەقفی ئەم بینایانەی هەموو فەرامۆش کردبوو و بەجێگەیان خانووی دارینی چاخی بەردین و بوونی هێزێکی توورە و تۆسن و نائاگای بە مێشکدا دەهات..

دەنگدانەوەی لە گوێ ناخۆشی: "دڕ.. دڕ.. دڕ.." هەمدیس لە هەوادا بڵاوبۆوە. دوازدە جار و پاشان نزیکەی نیوچرکە بێدەنگی و ئەمجارەیان: "دڕن.. دڕن.. دڕن.." لە کۆتایی حەوشەکەوە بەرزبۆوە. لای خۆی بیری کردەوە: "ژیانێکی چەند خەمبارە!" و هەر لەم کاتەدا لە

شـــــوێنی دواتـــــرەوە: "ژاك.. ژاك.. ژاك.."ی خەمناك گەیشتە بەرگوێوە.

لەسەریەك چوار چرکەی خایاند بۆ ئەوەی چـاودێرەکان کاتـژمێری دوازدە رابگەیـەنن و دیـسانەوە بێـدەنگی بـاڵی بەسـەر ناوچـەکەدا کێشا. وەك ئەوەی هەموو شتێك لە ناوچەکەدا لەناو چووە. "کۆرۆلۆف" چەند چرکەساتێکی تر دانیشت پاشان گەڕایەوە ئەو ژوورەی بۆی دیـاریکرابوو، بـەڵام تـا ماوەیـەك نەچـووە نێـو پێخەفەکەیـەوە. لـە ژوورەکـانی دیکـەدا دەنگـی چرپەچرپی خـەڵك و سرتە و تەقـەی قاپقاپـە و رۆیـنی بە پێخاوسی دەگەیشتە بەر گوێ. لای خـۆی بـیری کـردەوە: "نـەکا لیـزا دیـسان تێکچووبێت؟!"

لە ژوورەکەی هاتەدەر بۆئەوەی سەری کچە نەخۆشەکە بدا، ژوورەکان رۆشتبوون، تیشکی کزی هەتاو کە توانیبووی بە نێو مژی بەیانیدا بێتـە سـاڵۆنەکە، لـە دیـوار و کـەڤ ژوورەکانیـدا بـوو. دەرگـای ژووری "لیـزا" کرابـۆوە. کـچە گەنجەکـە, قـژ ئـاڵۆز لەسـەر قەنەفـەی نزیکـی قەرەوێڵەکـەی دانیـشتبوو و"رۆب دۆشـامبیر"ی لەبەردابوو و قوماشێکیشی لە خۆی پێچابوو. دکتۆر لێی پرسی:

–چۆنی؟

–سوپاس!

نەبزی گرت. پاشان ئەو تاڵە قژەی هاتبۆە سەر تەوێڵی کچە لایدا و گوتی:

–ناخـەوی، هـەوای دەرێ زۆر خۆشـە، بەهار هـاتووە و بولبـول چـریکەیانەو بـەڵام تـۆ لـەم ژوورە نیـوە تاریکـەدا لێـی دانیـشتوویت و خـوا دەزانێ بیر لە چی دەکەیەوە؟!

"لیـزا" لـە سـەرو سـیمای دکتـۆر رامـابوو و گوێی بە قسەکانی دەدا.

لـــە چـاوە خـــەمبار و هۆشـــیارەکانییەوە دیاربوو گەرەکیەتی شتێك بە دکتۆری بڵێت.

"کۆرۆلۆف" پرسی:

–زۆر تووشی ئەم حاڵەتە دەبیت؟

لێوی بزاوتن و گوتی:

–بەڵێ، زۆر جار هەموو شەوێك تێکدەچم.

لـەم کاتـەدا چاودێرەکان کاتـژمێری دوویـان راگەیانـد. دووجـار لـە وەرەقـە ئاسـنەکەیان دا. دەنگێکـــی وەك: "دڕ.. دڕ.. دڕ.." بـــەرزبۆوە و کچەکە ڕاچڵەکی. دکتۆر پرسی:

–ئەم دەنگانە نارەحەتت دەکەن؟

کەوتە بیرکردنەوەو پاشان وەڵامیدایەوە:

–نازانم، لێرە لە هەموو شتێك نارەحەتم، لە هەموو شتێك. دەزانی، لە دەنگی تۆدا چەشنە هاوخەمییەك هەستپێدەکەم. هەر کە تۆم بینی نـازانم بـۆ چ و بـە چ هۆیەکەوە هاتـە بـەر چاوم دەکرێ باسی هەموو شتێ بەلای تۆوە بکەم.

–بێژە، تکات لێدەکەم!

–حەزدەکەم بیروڕای خۆمت بۆ بەیان بکەم. بیرناکەمـــەوە مرۆڤێکـــی ناســـاغ بم، بەڵکـــە دووچاری نیگەرانی و ترس و دڵەڕاوکێ بووم و دیـارە زۆر سروشـتییە و جگـە لەمـەش نـاکرێ شـتێکی دی بێـت. تەنانـەت سـاغترین مـرۆڤیش ئەگەر دزێك بەلای پەنجەرەکەیدا بڕوا، ناتوانێ نیگەران نەبێ و نەشڵەژێت.

لێـرەدا لـە ئـەژنۆی خـۆی رامـابوو بزەیـەکی شەرمنانەی کردو و درێژەی بە قەسەکانی دا:

–زۆر جار داوو دەرمانم دەدەنێ، دیارە لەم لایەنـەوە سوپاسـیان دەکـەم و بـە سـوودبوونی

دەرمانەکەش لەبەرچاو ون ناکەم بەڵام هەمیشە حەزم دەکرد نەك لەگەڵ دکتۆردا بەڵکوو لەگەڵ برادەرێکی تێمبگات و بە قەناعەتم بگەیەنێ ئایا باش بیردەکەمەوە یاخود نا، قسە بکەم و دەردی دڵی لەگەڵدا بکەم.

—چما برادەرت نین؟

نا تەنیای تەنیام. دیارە دایکم هەیە و خۆشمدەوێت. لەگەڵ ئەوەیدا تەنیام، چ دەکرێت. وا دیارە بەشم هەر ئەمەیە. مرۆڤە تەنیاکان زۆر دەخوێننەوە بەڵام کەم دەدوێن و کەمیش دەژنەون.. و ژیان بە شتێکی نهێنی دەزانن. ئەوان سۆڤ مەسلەکن و زۆر جار لە شوێنێکدا شەیتان بەدیدەکەن کە بوونی نییە.

—زۆر دەخوێنییەوە؟

—بەڵێ زۆر، ئاخر دەزانی کاتم زۆرە لە بەیانییەوە تا ئێواریێ، بە رۆژ کتێب دەخوێنمەوە و کە شەو داهات هەستپێدەکەم مێشکم بەتاڵە و بە جێگەی بیرکردنەوە پڕە لە تارمایی.

—شەوانە خەون دەبینی، یان مۆتەکە دەتگرێت؟

—نا، بەڵام هەستیان پێدەکەم..

جارێکی دی بزەی هاتێ و بە خەمباری و هۆشیار چاوی بڕییەوە دکتۆر، "کۆرۆلۆف" وایزانی کچە گەنجەکە بڕوای پێ پەیدا کردووەو گەرەکیەتی بەراستگۆییەوە دەردی دڵی لا بکات. بیری دەکردەوە "لیزا"ش وەك خۆی بیردەکاتەوە بەڵام کچە بێدەنگبوو و لەوانەشە چاوەڕوانی ئەوە بووبێت دکتۆر دەست بە قسە بکا. "کۆرۆلۆف" دەیزانی دەبێ چ بڵێت: بە پێویستی دەزانی "لیزا" ئەو پێنج خانووە سەرەکییە و بە ملیۆن پارەیە (ئەگەر پارەیەك لە ئارادا بێت) و هەروەها ئەو شەیتانەی شەوانە بێدارەو سەیری دەکا، هەرچی زووترە جێبهێڵێت. لێی روونبوو "لیزا"ش لەسەر ئەم ڕایەیە، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە بوو پێویستی ئەم کارە لە زبانی کەسێکی جێگەی بڕوای بژنەوێت.

تێمابوو مەبەستەکەی بە چ زمانێك بەیان بکات و چۆن؟. زۆر جاریوایە شەرم لە تاوانباران دەکەن هۆی تاوانبارییەکەیان لێ پرسیار بکەن. شەرمیش لە سامانداران دەکەن لێیان بپرسن ئەم هەموو سامانەیان بۆ چییە و تەنانەت ئەگەر بزانن دەبێتە مایەی چارەرەشیشیان، دەستبەرداری نابن؟

تازە بە تازە ئەگەر لەمبوارەوە دەست بە قسە بکەن لە رووداوان و شەرمی حزووری دەبێتە هۆی ئەوەی هاڤپەیڤینەکەیان دوور و درێژ بێت ماندوویان بکات.

"کۆرۆلۆف" لای خۆی بیری کردەوە: "چۆن و لە کوێوە دەستپێبکەم؟ یاخود لە بەرژەوەندیدایە هیچی پێ بڵێم؟". کەوابوو مەبەستەکەی ناراستەوخۆ لەگەڵ "لیزا"دا هێنایە بەر باسکردن:

—تۆ وەك خاوەن کارخانەو میراتگرێکی ساماندار، هەست بە نارەزابوون دەکەیت، بروات بە مافداری خۆت نییە و هەر بۆیەشە خەوت لێناکەوێت. دیارە ئەم رەوشە باشترە لەوەی رازی بای و باش خەوتبای و وات بە بیردا بهاتایە کە رەوشەکەت بە دڵە. دژە خەوییەکەت جێگەی رێزەو دەکرێت بڵێی هێمای باش لە دژە خەوییەکەتدا بەدی دەکرێت. لە راستیدا ئەم

گفتوگۆیەی کە ئێستا لە نێوان من و تۆدایە زۆر نەگونجاو بوو لە نێوان دایك و باوکی ئێمەدا روویدا. ئەوان هەر کە شەو دادەهات سەریان دەنایە سەر سەرین و بۆی دەخەوتن. قسەیەکیشیان پێنەبوو بە یەکتری بڵێن، بەلاّم ئێمە واتا نەوەی خۆمان خەراپ دەخەوین، ئەشکەنجە دامانەدەگریّ، زۆر قسان دەکەین و هەردەم گەرەکمانە داخۆ ماڨ ئێمەیە یاخود نا؟ بەلاّم دڵنیات دەکەمەوە هەر ئەم بابەتە لە روانگەی کوڕ و نەوەکانمانەوە بابەتێکی چارەسەرکراوە. ئەوان روانگەی باشتر لە ئێمەیان دەبێت. پەنجا ساڵ دواتر ژیانێکی باشتر چاوەڕوانی مرۆڤە. بەلاّم زۆر حەیف تەمەنی ئێمە هێندەی بە بەرەوە نەماوە بۆ ئەوەی ئەو رۆژە بە چاو ببینین. زۆر سەرنج راکێش دەبوو ئەگەر مرۆڤ توانیبای چاوی بەو رۆژە بکەوێت.

–فکر دەکەیەوە کوڕ و نەوەکانمان چدەکەن؟

–نازانم، لەوانەیە گەشت شەتیّ وێڵکەن و بڕۆن.

–بۆ کویّ بچن؟!

دکتۆر بە پێکەنینەوە وەلاّمیدایەوە:

–بۆ کویّ؟ هەرچییەکی حەزیان لێبوو. بۆ مرۆڤی ژیر و باش جێگە زۆرە.

ئەمەی گوت و چاوی لە سەعاتەکەی کرد دڵی زیادکرد:

–نزیك بەیانییە. پێویستە بخەوی. جلەکانت بگۆڕە و بە ئاسوودەیی لێی بنوو. لە کاتێکیدا دەستی کچە گەنجەکەی بۆ ماڵئاوایی دەگووشی، لێی زیاد کرد:

–بە ناسینت پێخۆشحاڵم. تۆ مرۆڤێکی باش و سەرنج ڕاکێشی. شەو باش!

پاشان چووە ژوورەکەی و لەسەر قەرەوێڵەکەی پاڵکەوت بۆ ئەوەی بخەوێت.

بەیانی ئەو شەوە، کاتێك گالێسکە ئامادە بوو بوو، هەموو لایەك بە مەبەستی بەڕێکردنی دکتۆر ئامادەبوون. لەبەردەرگاکە "لیزا" وەك رۆژانی جەژن بەرگی سپی پۆشیبوو، گوڵێکی لە قژیدابوو، خەمناك و رەنگ بزرکاو دەهاتە بەرچاو، وەك رۆژی پێشتر نیگای خەمناك و هۆشیارانەی لە دکتۆری بریبوو و بزەی دەهاتیّ و بە چەشنێك دەپەیڤی هەروەك بیەوێت قسەیەکی تایبەتی و گرینگ لەگەڵ ئەودا، تەنیا لەگەڵ ئەودا بێنێتە بەر باس. هەوێردە سروودیان دەچڕی و دەنگی زەنگی کڵێسەکان دەبیسترا. پەنجەرەی خانووە سەرەکییەکان بە شادمانییەوە دەبریسکانەوە. "کۆرۆلۆف" بە سواری گالێسکە بە حەوشەی کارخانەو ئەو ڕێگەیەی دەچووەوە بۆ وێستگەی شەمەندەفەردا تێدەپەڕ دەبوو. ئیتر نە لە بیر کرێکارەکاندا بوو نە ناوخۆییە دارینەکان و نە شەیتان، بەڵکوو بیری لە سەردەمێك دەکردەوە، کە لەوانەیشە زۆر دوور نەبێت، ژیانیش بە وێنەی ئەم بەیانی رۆژی یەکشەممۆیە رۆشن و شادی بەخش بێت. یاخود بیری دەکردەوە چەندە خۆشە مرۆڤ لە بەیانییەکی ئەوتۆدا لە گالێسکەدا بخەویّ و هەتاوی بەهاری جەستەی گەرم داهێنیّ.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری "جدول شماره 91"

# شیعری فەرەنسی

ژاك پریڤێر

لە فەرەنسییەوە: فەرهاد پیربال

**پرژ و بڵاو *Fatras***

**گیاوگوڵ بخۆن**
**زووکەن**
**ڕۆژێك دادێ**
**گیاو گوڵ دەتانخۆن**

**ئەی جوانی**
**کێ دەتوانێ ناوێکی خۆشتر**
**بۆ تۆ بدۆزێتەوە:**
**ناوێکی ئارامتر،**
**نەسڕێتەوە،**
**خرۆشێنتر؟**

**ئەی جوانی**
**زۆربەی جار من ناوت دەبەم**
**کار لە پێناو بڵاوکردنەوەت دەکەم**
**ساخبێری تۆ نیم ئەمن**
**ئەی جوانی**
**من فەرمانبەری تۆم.**

**ژنێك و پیاوێك**
**هەرگیز یەکتریان نەدیوە**
**زۆر لە یەکتر دوور دەژین**
**لە دوو شاری جیاوازدا**
**ڕۆژێك**
**هەمان لاپەڕەی هەمان کتێب دەخوێننەوە**
**لە هەمان کات و**
**لە هەمان چرکەکانی**
**یەکەمین دەقیقەی**
**دووایین کاتژمێری ژیانی خۆیان.**

**ئەی ئەو بەردانەی**
**بەسەر ئەو ژنە ڕاهیبە ساردەوە پاڵکەوتوون!**

**ئەمە من نیم گۆرانی دەڵێم**
**ئەو گوڵانەن کە من دیومن**
**ئەمە من نیم پێدەکەنم**
**ئەو شەرابەیە کە خواردوومەتەوە**
**ئەمە من نیم دەگریم**
**ئەوینە لە دەست ڕۆشتووەکەمە.**

لەناو کەلەبەرەکانی بیرەوەریدا
خۆمان دەشارینەوە
لەناو کێوەکانیشیدا
بزر دەبین.

خۆشحاڵم
دوێنێ پێی گوتم
کە خۆشی دەوێم.
خۆشحاڵم و سەر بڵند
ئازاد ئازاد عەینەن ڕۆژ، چونکە
ئەوەی نەخستە سەر قسەکانی
کە ئەو خۆشەویستییە هەمیشەییە.

ئەوە وێنەی چ ڕوخسارێك
دەنێرنە ناو ئاوێنەکەوە
کە ئەم چرو چاوانەیان بۆ
دەنێرێتەوە؟

پشیلە لە چاو مرۆڤ
زۆر کەمتر دەژی
گرنگ نییە ئەگەر زۆرتریش بژی
خۆ ئەسپ لە بیستساڵی دەمرێ.

ئینجا خوا
سەری ئادەم و حەوای سوڕماند
پێی گوتن
"تکایە بەردەوام بن
خۆتان لەبەرخاتری من سەغڵەت مەکەن
وا بزانن من هەرنیم، چ دەکەن بیکەن".

کاتێ کابرای خەیاڵ پلاّو دەگەڕێتەوە ژیان
زەردەخەنەیەکی بۆ دەکا هەندێ جار ژیان
زۆربەی جاران بەلاّم
هەق و حیسابی خۆی لەگەڵ دەکات و
تووڕ هەڵدەداتە دەرەوە.

باران
لە ئاسمانەوە ناباریّ
باڵندە
وەك ئێمە
گیانەوەرێکی زەمینییە

لێوەکانتم
لە کتێبەکانی خۆم
خۆشتر دەوێ.

*****

**چەند دارستان..**

چەند جەنگەڵی سەر زەمین لە ڕیشەوە
هەڵکێشران و
قەتڵوعام کران
بنبڕ
خاپوور کران
چەند دارستان بوونەتە قوربانی
لە پێناو دروستکردنی کاغەز بۆ ئەو هەموو
ملیارد ڕۆژنامانەی کە ساڵانە
سەرنجی خوێنەران ڕادەکێشن
بۆ مەترسیی لەناوچوونی
دارو درەخت و دارستانەکان.

*****

**سەرچاوە:**

*Jacques Prevert: Oeuvres Completes*, *Gallimard, Paris: 1992*.

# دوو قەسیدەی ئارتیوور رامبۆ

له فەرەنسییەوە: سمکۆ ناکام

-1-

**گزنگ**

**ئاوێزانی گزنگی هاوین بووم.**
**له بەرەی کۆشکەکاندا هێشتا هیچ نەئەبزووت. ئاو مردبوو. کامپی سێبەرەکان ڕێی دارستانیان جێنەئەهێشت. کەوتمە رێ،هەناسە بزێو و شلەتێنەکانم بە ئاگا ئەهێنایەوە، زمرووت و یاقووتەکان سەیریان ئەکرد و، باڵەکانیش بێ شەقە رائەبوون.**
**له رێچکە بە تیشکی نۆبەرەو رەنگلێبڕاو تەنراوەکەدا یەکەم کار دەستم دایێ گوڵێ بوو کە ناوی خۆیم لا ئەدرکێنێ.**
**بەدەم تاڤگە قژ زەردەکەوە پێکەنیم، کە لە دوو توێی سەروەکاندا پرچی لێ بژ کردبۆوە. لەسەر لوتکە زیوینەکە ژنەخواوەندم ناسیەوەو.**
**ئەوسا لە رێی باخاندا بەدەم قۆڵوەشاندنەوە تاراکانم یەکە بە یەکە هەڵمالی. لە پێدەشتەکەدا رازیم لای کەڵەشێر ئاشکرا کرد. لە شارە مەزنەکەدا بەناو قوللەی زەنگەکان و گومەزەکاندا هەڵئەهات. منیش چەشنی سواڵکەرێکی راکردوو بە سەر شۆستە مەڕمەڕەکانی بەندەردا هەڵمئەبڕی.**
**له سەرووی رێگاکەدا، نزیك بە پەڵەیەکی تەڕی تارا بەسەردا کە لە دەورم بوو, کەمێ لەشی زەبەلاحیم هەست پێکرد. گزنگ و منداڵەکە لە خوار دارستانەکەوە بەربوونەوە.**
**دەمەو بە ئاگاهاتنەوە نیوەڕۆ بوو.**

-2-

## پێشەکیی دیوانی "وەرزێ لە دۆزەخدا"ی ئارتیوور ڕامبۆ

جاری جاران، ئەگەر چاکم لە یاد بێ، ژیانم زیافەتێ بوو کە گشت دڵەکانی تیا ئەکرانەوە، گشت شەرابەکانی تیا هەڵئەقوڵان.

ئێوارەیەکیان جوانیم لەسەر ئەژنۆم دانیشان، تاڵم دیەوە، بەر جنێوم دا.

خۆم دژ بە دادپەروەری چەکدار کرد.

هەڵاتم. ئەی پیرێژنە جادووگەرەکان، ئەی کلۆڵی. ئەی کینە، خەزنەکەم بە ئێوە سپێردراوە.

بۆم لوا هەر هیوایەکی ئینسانی لە گیانمدا کە هەبێ سەرەونگووم کەم.

بەرابەر هەر شادیێ وەك جانەوەری دڕندە نهێنگرانە قەڵەمبازم دا بۆ ئەوەی ملی بشکێنم.

جەللادەکانم بانگ کرد، تا بەدەم فەوتانەوە قەپاڵ لە قۆناغی تفەنگەکانیان بگرم.

پەتاکانم بانگ کرد بۆ ئەوەی بە لم، بە خوێن هەناسەم لەبەر ببڕن. بەدبەختی خوام بوو. لەناو قوڕدا ڕاکشام، بە هەوای تاوانەکە خۆم وشك کردەوەو، چەند سووڕێکی رند شێتی هەڵپەڕیم.

بەهاریش پێکەنینە جاڕزەکەی دەبەنگی بۆ هاوردم.

هێند نییە، خەریکبوو دوا نووزەم لێدەربچێت، خەیاڵم بۆ ئەوە چوو کە چاو بۆ کلیلی زیافەتە دێرینەکە بگێڕم، بەڵکو ئارەزووی خواردن بکەم.

خێرەومەندی ئەو کلیلە بوو. ئەم خستنە دڵەوە ئەوە ئەسەلمێنێ کە خەوم دیبوو.

".. بە کەمتیاری ئەمێنێتەوە.. هتد" هاوار ئەکاتەوە ئەو ئەهریمەنەی تاجی هێند نازەنینی خەشخاشی لەسەر سەرم دانابوو. بە تەواوی شەهیەتەکانت، بە خۆپەرستیت و بە گشت خەتا مەزنەکان مەرگ چنگ خە.

ئاخ، یەجگار زۆرم چەشت. بەڵام ئەی شەیتانی ئازیز، لێت ئەپاڕێمەوە وا توورە گلێنەتم لێ زەق مەکەرەوە. بەدەم چاوەڕوانیی ئەو چەند هەرزە خوێرێتییەی بە سەرمەوە ماوە، تۆیێ کە لە نووسەردا نەبوونی توانای هەڵدان و دەرسدادانت بە دڵە، ئەم چەند پەڕە یەجگار ناحەزەی دەفتەری بەنەحلەتبوونم بۆ تۆ دائەماڵم.

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆڵگاکنیپەر

له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

"سێ خوشکەکە" هەرای ناوەتەوە، دوێنێ دوای پەردەی چوارەم زۆر ئافەرین کرا، ڕۆژی




چواردەهەم دەڕۆین بۆ پترۆزبورگ، بلیتی دوونمایش پێشتر تەواو بوە. بە "خاڵ ڤانیا" دەست پێدەکەین.

* * * * *

**کنیپەر**

**10ی فێبروەری**

**مۆسکۆ**

دوێنێ و ئەمڕۆ چاوەڕێی نامەی تۆ بووم و سەرئەنجام گەیشت، چەندە جیاوازی نێوان ژیانی تۆ و ئەم ژیانە بێ سەرەو بەرەیەی من هەیە لێرە! تۆ لەوێ ئازاد و ئاسوودەیت، هەستی بەهێزت هەیە و منیش لێرە زۆر بەشەکەتی وەرزەکە تێدەپەڕێنم و گوێ بە هیچ نادەم و تەنیا بە ئومێدی روناکیەکی کەمم کە لە دوورەوە دەدرەوشێتەوە، واتا پشووی هاوینە

کە لە شوێنێکدا بە ئاسانی پێك بگەین، ئەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم، ئەمەندە پەرۆشی بینینتم کە وا دەزانم تا بەیەکدەگەین بۆ چرکەساتێکیش خۆم پێناگیرێت، ئەمەیش خەونەکانی منە! .. ئەی تۆ خەون بە چییەوە دەبینیت؟

ئەمڕۆ "مەلی دەریا"مان نمایش کرد، دوای چوارەم پەردە بوە هەراو زەنا، سبەینێ دوای "سێ خوشکەکە" بڕیارە ماڵئاوایی لە بینەران بکەین، دەتوانم وێنای ئەوە بکەم کەچی روودەدات، هەموویان لە بارەی "سێ خوشکەکە"وە قسە دەکەن، قسە لەسەر چیخۆف دەکەن، قسە دەکەن..

* * * * *

**چیخۆف**

**11ی فێبروەری**

**ڤلوچیك – تەلەگراف**

تەلەگراف بۆ "ئودسا"[1] (ئوتێل) لەندەن بکە. دەرۆم بۆ یاڵتا – سلاو.

**کنیپەر**

**12ی فێبروەری**

**مۆسکۆ**

ئازیزم تەلگرافێك و نامەیەکتم پێگەیشت. کەواتە بەمزوانە لە یاڵتا دەبیت، بۆ نەڕۆیشتیت بۆ ناپۆلی؟ بابڵێین رەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە زستانی ئیتالیا خراپە و خانوەکانیشیان لەبەر زریانێکی زۆردان و زۆپایشیان نیە، من خۆم هەمیشە بە نائومێدییەوە دەلەرزیم، مرۆڤ تەنیا لە شەقام و بەرخۆردا لەشی گەرم دەبێتەوە، تۆ بەم زوانە لە یاڵتا دەبیت و منیش زیاتر هەست بە نزیکیت دەکەم، وا هەر ئێستا لە ژووری میوان دانیشتووم و نامەت بۆ دەنووسم، هەموو لایەك بێدەنگە، "ئادوچکای" چکۆڵەو ئازیز لە ژوورەکەی تەنیشتمدا خەتوە، لەم شەش هەفتەیەدا زۆر ئالوودەی بووم و دوورکەوتنەوە لێی سەختە بۆ من، سەماوەری سەرمێزەکە گیزە گیزیەتی، هەموو شوێنێك پڕە لە کەرەسەی یاریی منداڵەکە. کەس لە ماڵەوە نیە، هەموو شتێك بێدەنگە و منیش دەمەوێت وردە وردە بیری خۆم کۆبکەمەوە، دوو بەیانی بەرەو پترۆزبورگ دەچم، دەبێت جانتاکانم زۆرشت کۆبکەمەوە، کارم زۆرە، دەبێت هەرشتێکی بچووك و هیچ و پووچیش لە بیرنەکەم، تەنانەت پارچە جلێکیش.

دوێنێ وەرزی "سێ خوشکەکەمان" تەواو کرد، حەوت جار نمایشمان کرد، گشت کابینەی باڵکۆنەکان پڕبوون، هەموویان بلیتیان کڕیبوو، دوێنێ شەو هەرای نایەوە، هەر باقە گوڵ بوو بە "لیلینا" و "ئاندریڤا" دەدرا، دوای پەردەی چوارەم هەموو ئەندامانی کارەکە سەریان بۆ بینەران دانەواند، بینەران شێت ببوون، تێکڕا گوڵ سەرتەختەی شانۆکەمان بەرەو لای خەڵکەکە دەهاویشت، چەپڵە رێزان و دەست خۆشی لە گوێماندا دەزرنگایەوە، بەڵام من هەمیشە لە ساتەوەختی وادا هەست بە ناڕەحەتی دەکەم، دوێنێ حەزم لە گریان بوو، زۆر هەستم بە تەنیایی دەکرد. نەمتوانی لەسەرەتاوە هەستی خەم و پەژارەی خۆمت بۆ باس بکەم. بێجگە لەمە زۆر شەکەتم و بۆ دوا نمایش هەموو توانام بەخت کرد. لە دوا نمایشدا بینەران دەوریاندام، دەستیان گوشیم،

کـچەکان ماچـیان کـردم، منیـان خـستە سـەر شـانیان و لـە هۆڵەکـە بردیانمـە دەرەوە خـەرێك بوو شێت بم لەبەر گەرما و شتەکەیشم زۆر پـێ ناخۆشــبوو ئــەوان "ماشــا"یــان لــە مــن جیــا کـردەوە، شـەو لەگـەڵیا بـووم، ئـەمڕۆ چـووم بـۆ شت کـڕین، سبەینێ هـەموو ڕۆژەکـەم بـۆ ئـەوە داناوە بـەپێ بڕۆم، دەبێـت لـە پترۆزبـورگ چـاك بحەسێمەوە بۆ ئەوەی بتوانم ڕۆژی نۆزدەیـەم لـە "خالێ ڤانیا"دا باشتر و بە توانایەکی نوێوە ڕۆڵ ببینم.

چـەند نامەیـەکم بـۆ نـاپۆلی بـۆ ناردوویـت، "نمیرۆڤیچ"یش تەلەگرافی بۆ کردوویت و بۆ تا ئێستا هیچ لای تۆوە نیە؟ لـە خـۆم دەپرسـم کـە ئایـا بەڕاسـت چـوە بـۆ نـاپولی یـان نـا، بـەو مانایـەی کـە دەشـێت ئـەم نامەیـە زووتـر لـە نامــەکانی ئیتالیــا بگاتــە دەســتت و ئەوســا تێدەگـەیت "سـێ خوشـکەکە" چ سـەرکەوتنێکی گـەورەی بەدەسـت هێنـاوە، هـەم نمایشنامەکەو هــەم پیــشاندانەکەی چ هەســتێکی زۆر قــووڵی وروژانــدوە (...) مــن زۆر بەخۆشــیەوە ڕۆڵــی "ماشا" دەبینم، ڕاستت دەوێت ئەو یارمەتیەکی مــەزن بــوو بــۆ مــن، مــن لــەوە گەیــشتووم چ ئەکتەرێکم، من خۆم ناسیوە، سوپاس چیخۆف! ئافەرین!!!

ئۆڵگاکەت.

شـانۆی هونـەری لـە چواردەهەمی فێبروەری "1901"دا یەکەم سەفەری بۆ پترۆزبورگ کرد، هـەموویان لـە مەترسـی ئـەم کـارە ئاگـاداربوون، ڕەفتـاری سـوکایەتی پێکردنـی خانەدانـەکانی پترۆزبورگ لەگەڵ "بازاڕیەکان"ی مۆسکۆدا وەك یەك وا بوون.

لای ئەوان کارێکی هونەری کە لـە مۆسکۆوە هاتبێـت نابـەجێ بـوو چـیخۆف کـە هـەر لـە بنەڕەتـەوە بـڕوای بـە ڕەخنـەگرانی پترۆزبـورگ نەبوو، بۆ ئۆڵگای خۆشەویستی تەنیا پێشبینی خەم و ئازاری دەکرد.

* * * * *

**کنیپەر**

**15 فێبروەری**

**سنت پترۆزبورگ**

لە پترۆزبورگم ئازیزم، بە قەڵەم ڕەساس بۆت دەنووسـم چـونکە مەرەکەبەکـەم تـەواو بـووە و براکەم و براژنم لە ژووری خوارەوە نان دەخۆن و دەرگاکـــەیان داخـــراوە، ئـــەم بەیانیـــە بـــە شەمەندەفەری خێرا گەیشتمە ئێرە. سـەرێکم لـە ماڵـەوە دا، پیاسـەیەکم بەشـاردا کـرد، سـەرم لـە شـانۆ داو وا ئێستا دوای وەنـەوزێك هەسـتاوم، لــە ژمــارە 16 شــەقامی "مورســکا"[2] ژووری ژمـارە 37 دام. دەبێـت بـەم ئادرەسـە نامـەم بـۆ بنووسیت. بیستوومە ئەم ژوورە فـەرش کراوانـە زۆر باشن. بابزانم تـا چـەند ڕۆژێکـی دی ژوورێك بە بڕی 60 ڕۆبڵ دەگرم، بەڵام ئێستا بە ڕاستیی خـەرجیم گـەلێك زۆرە، ئـەم جـۆرە تەنیاییـە زۆر چـاکە، هــیچ نــەبێت دەتــوانم بحەســێمەوە، ســەفەرەکەم تـا ئێـرە بـاش بـوو "ئانـدریڤا" و "ستانسلافسکی" و "نمیرۆڤیچ" واگونێکیان بە تایبەتی گرتبوو. بەیانی ڕۆژی سەفەرەکەمان لە ژووری میوانەکەیاندا دانیشتم، بە دەنگی بـەرز ئەو دوو وتارەم خوێندەوە کە لـە "نۆڤۆڤیرمای" بڵاوکرابوونـەوەو ڕەخنـەیان لـە ئێمـە گرتبـوو. "پترۆزبـورگ" شـێت بـوە، هـاتنی ئێمـە هـەراو

زەنای دروست کردووە، چاوەڕوانی کارێکی تایبەتن کە بێگومان بێ ئومێد دەبن، بلیت هێند خێرا دەفرۆشرێت کە باوەڕ ناکەیت. خوا دەزانێت چی روودەدات؟!! من گەلێك نیگەرانم، وا هەست دەکەم یەکەمجارمە "خاڵ ڤانیا" نمایش دەکرێت، بیر لە دەورەکەم دەکەمەوە، دەڵێی دەورێکی تازەیە. رۆژی نۆزدەیەم کردنەوەیە و بیستەم "مرۆڤە تەنیاکان" پێشکەش دەکەین، بیست و یەکەم "خاڵ ڤانیا" و بیست و دووەم "مرۆڤە تەنیاکان" ئایا بیرم دەکەیت. دوای یەکەم نمایش نامەت بۆ دەنووسم (...) بە پەرۆشەوە چاوەڕێی نامەیەکتم. سەفەرەکەی تۆ چۆن بوو؟ حاڵی خۆت چۆنە؟ (...) ماچێکی گەورەت بەسەردا دەپرژێنم. لەبری ئەوە ماچم دەکەیتەوە؟ نوسەرەکەم لە باوەش دەگرم.

تووتەڵەکەت

* * * * *

**کنیپەر**

**20 فێبروەری**

**سنت پترۆزبورگ – تەلەگراف**

سەرکەوتنێکی مەزن بۆ چیخۆف و شانۆ، تەندروست و خۆشحاڵ بیت، هیچ نامەیەکت نەگەیشتووە.

* * * * *

**چیخۆف**

**20 فێبروەری**

**یاڵتا**

ئازیزترینم، خۆشەویستە دەگمەنەکەم، ئامێزێك و ماچێکی گەورەت بەسەردا پەخش دەکەم، دوو هەفتەیە لەسەفەر بووم و تۆ نامەت نەبوو، وردە وردە هەستم دەکرد بەرانبەر بە من ساردیت، لە پڕێکدا گشت نامەکانت لە مۆسکۆ و پترۆزبورگ و دەرەوەی وڵاتەوە دابارین. بۆیە زوو ئیتالیام بەجێهێشت سەرما و بەفر بوو، بێجگە لەوە بەبێ نامەی تۆ ژیان بە تەواوی ناخۆش و دنیام لێ تاریکبوو، لە یاڵتا توانیم هەواڵی "سێ خوشکەکە" بخوێنمەوە، لە ئیتالیایش تەنیا (ئەگەر و بەلامەکەیم) بیستبوو. پێدەچوو سەرنەکەوتووبێت، چونکە هەرکەسێك رۆژنامەکانی خوێندبوەوە قسەیەکی لەسەر نەدەکرد، تەنیا "ماشا" لە نامەکانیدا تاریفی لێ دەکرد. بەهەرحاڵ (...)

* * * * *

**کنیپەر**

**21 فێبروەری**

**پترۆزبورگ –شەو**

دڵم بۆ دیدارت زۆر تەنگە ئانتوانی ئازیزم! زۆر حەزدەکەم دەربارەی رووداوەکانی ئەم چەند رۆژە قسەت لەگەڵدا بکەم. ئێستا زۆر تەنیام، "کۆستیا" و ژنەکەی ئەمرۆ بەرەو مۆسکۆ رۆیشتن.

"خاڵ ڤانیا"مان بۆ دووەم جار نمایش کرد، بینەران بە گەرمیەوە پێشوازیان لێکرد. بەڵام رۆژنامەکان بێ شەرمانە برژاندیانین، بە ڕاستی بێ شەرمانە. چۆن برژاندنێك! رەخنەی بێ مانا، بە تەواوی لەت و پەتیان کردین، رەخنەکان گەوجانە و ژەهراوی بوون. بەڵام ئێمە خۆمان گرتەوەو بەردەوامبووین لە سەر نمایشەکە. لە یەکەم نمایشدا هەموومان دەستە

پاچە بووین، وەك منداڵانی قوتابخانە "مرۆڤە تەنیاكان"یش چ وەك دەق و چ وەك نمایش زۆری پێ كرا.

شەو داكەوتوەو رۆژی من تەواو بووە، "سانین" هەموو رۆژنامەكانی پیشاندام – كەڵكاوەژۆیەكی ترسناك – هیچ كام لە ئێمەی ئەكتەر باش باس نەكراوە بێجگە لە "سانین" و "ستانسلاڤسكی" "مایرهۆڵد" و من لەت و پەتكراوین.

"ئاندریڤا" و "مسكوین"[3]یش هەروا. بە كورتی ئازیزەكەم ترسناكبوو. رێك و راست پێت بڵێم ئەمڕۆ زۆر ناڕەحەتم، ئەسڵەن ناتوانیت وێنای بكەیت چەندە بە سووكی تەماشای شانۆی ئێمە دەكەن. تەواو غەمبارم، هێرش دەكەنە سەر هەموو پرۆژەكەمان "ئەلنا"یان وردوخاش كردووە، بێگومان هەمان رەفتار لەگەڵ "سێ خوشكەكە"یشدا دەكەن. وەلێ من سەرسەختم، رەنگە هەموو ئەمانە لە قازانجی من بن(...)

ئێستا خۆرئاوای رۆژی بیست و دووەمە، دوێنێ نەمتوانی نامەكەم تەواو بكەم، هەر دڵ و سەرم پێوە نەبوو، بێگانە نەبووم پێت ئانتۆن؟ لەبیرت نەكردووم؟ خۆشەویستی منت لەسەر دەرنەكردووە؟ تەلەگرافەكەتم لە كاتێكی زۆر شادمانیدا پێگەیشت. دوای نمایشێكی سەركەوتوانەی "خاڵ ڤانیا" ئەمە سەركەوتنی تۆیش بوو، بینەران جەختیان دەكرد تەلەگرافێكت بۆ بنووسین، كە پەردە لادراو "نمیروڤیچ" تەلەگرافەكەی بۆ تۆ نووسرابوو خوێندەوە هەموو هاواریان لێ هەستا: "زیاتر بنووسە، زیاتر هاندانی تیا بێت" بینەرەكان بە پێچەوانەی هێرشی رۆژنامەكانەوە ئێمەیان خۆش دەوێت (...)

باشە، خەوێكی خۆش (...) بنووسە. سەدەهایە لە تۆوە نامەم پێ ناگات، ئەمە یانی چی؟

تووتەڵەكەت

* * * * *

چیخۆف

22 فێبروەری

یاڵتا

خۆشەویستم، ژیان لە پترۆزبورگدا چۆنە؟ وا دەزانم بەمزوانە باری هەمووتان لەم شارەدا تێك دەچێت و لە سەرما و باسە بێ كەڵك و سووكەكاندا بێزار دەبن. خۆشەویستە بێ چارەكەم. هەموو ئەم شتانە ماندووت دەكەن، دوێنێ تەلەگرافێكم لە "نمیروڤیچ"ەوە پێگەیشت، تیایدا دەڵێت "مرۆڤە تەنیاكان" سەركەوتوو نەبوو. مانای وایە كێشەیەك لە ئارادایە. چی دەبێت با ببێت. دڵنیام ئیدی ئارەزووی چوونە "پترۆزبورگ" لەسەرت نادات (...)

بۆ نانووسیت؟ تا ئێستا نامەیەك و تەلەگرافێكی تۆم پێ نەگەیشتووە. حاڵت باشە. سوپاس بۆ خودا. خۆشحاڵبە. بێگومان تا هەفتەی چوارەمی چلەی رۆژو بلیتتان فرۆشتووە. دوای ئەوە چی؟ ئایا بۆ مۆسكۆ دەگەڕێیتەوە؟ بۆم بنووسە ئازیزەكەم (...)

باوكت ئانتونی.

* * * * *

**چیخۆف**

**23 فێبرووەری**

**یاڵتا**

ئەکتەری گچکە و ئازیزم، تووتەڵە بێ هاوتاکەم، بۆ لەمن تووڕەیت، بۆ نامەم بۆ نانووسیت؟ بۆ نامەم بۆ نانووسیت؟ تەلەگراف پارەی تێدەچێت؟ تۆ 25 ڕۆبڵ بدە بە تەلەگراف من سوێندی شەرەفت بۆ دەخۆم کە 25 ساڵ خۆشم بوێیت.

سێ ڕۆژە نەخۆشم، رەنگە زۆر گرنگ نەبێت. تەندروستیم کەمێك چاکترە. نەخۆش و تەنیا بووم، لە نێو ڕۆژنامەکانی پترۆزبورگدا تەنیا "نوڤو ڤریما"م پێدەگات. بۆیە بە هیچ جۆرێك ئاگام لە سەرکەوتنتان نییە، ڕۆژنامەی تر و ئەو لاپەڕانەی لە بارەی شانۆگەریەکەتانەوە شتێکی نووسیوە بۆم بنێرە. رەنگە بۆ تۆ زەحمەت بێت چاویان دەردەهات.

نەتنووسیوە دەتەوێت چەند لە پترۆزبورگدا بمێنیتەوە، لەوێ کێ دەبینیت، چی دەکەیت (...). لێرە هیچ ڕووی نەداوە، کەواتە ئەی ئەکتەری شکۆمەند و چکۆڵەم، من چاوەڕێی نامەتم. (...)

**باوکت**

* * * * *

**کنیپەر**

**24ی فێبرووەری**

**پترۆزبورگ**

ئاگات لێیە دوانامەت لە حەوتی فێبروەریدا نووسیوەو ئەمڕۆ بیست و چواریەتی و هێشتا نامەیەکی تۆم پێ نەگەیشتووە. دەبینیت بە چ تووڕەییەکەوە نامە دەنووسم، باشبوو لەسەری نەڕۆیشتم، چونکە دوای چەند سەعاتێك سەرئەنجام نامەیەك لە باوکمەوە گەیشت. نامەکەت، ئانتوانی ئازیز، توانای بەدڵم دایەوە. دوێنێ ڕۆژێکی ناخۆشبوو. خۆزگا ئەم سەفەرو چلەیە زوو بڕوات، دەبێت دوای چەند چرکەیەکی تر بڕۆم و لە "ئەلنا"دا ڕۆڵ ببینم. ڕۆژنامەی "ڕوسیا" زۆر کێویانە لەسەر نواندنی منی نووسیوە، بۆ ئەمەندە تووڕەن؟ منیان بە ئەکتەرێکی دەرەکی و بێگانە داوەتە قەڵەم. بەلای ئەوانەوە دەبوو من لە دەورەکەمدا "جانەوەرێکی هەوەس باز"بم. (چ قسەیەکی نەفرەتیە!)

بۆیە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە من ئەکتەر نیم و نەمتوانیوە ببم بە کەسایەتی. لە حاڵێکدا کە بەرای من، ئەم کاراکتەرە بێزارکەرە، تەریك و نەگونجاوە. ئەو تەنیا بۆ "ئاستڕۆف" کە "ئەروستوکراتیەکی" بێکارەیە، هەوەسباز دێتە بەرچاو (...)

* * * * *

**کنیپەر**

**25ی فێبرووەری**

**پترۆزبورگ — تەلەگراف**

تەلەگراف بکە، نامە نەگەیشتوە. سەیرە!

* * * * *

**چیخۆف**

**26ی فێبرووەری**

**یاڵتا**

سێ نامەم ناردووە. بە خۆشیەوە چاوەڕێی تەلەگرافم. حاڵم زۆر باشە.

* * * * *

چیخۆف

26ی فێبروەری

یاڵتا

ئازیزترینم، ئەمڕۆ 26ی فێبروەرییە و هەرنامەت نەگەیشتوە! بۆ؟ ئایا قسەیەك بۆ وتن نیە، یان بڵاوكراوەكانی پترۆزبورگ وایان تووڕە كردوویت كە ئێمەیشت لەیادكردووە؟ ئازیزم ئەم شتانە گەلێك بێ بایەخن. من تەنیا "نوڤو ڤرمیا" دەخوێنمەوە، هەر گوێ بە ڕۆژنامەی پترۆزبورگ نادەم. زۆر پێشتریش دەمزانی. من نە پێشتر و نە ئێستا بێجگە لە گاڵتەجاڕی چاوەڕێی شتێكیتر لە "نوڤوڤرمیا" ناكەم. (...)

حاڵم باش نەبوە، دەكۆكم و.. وەلێ ئێستا چاكترم و تەنانەت بۆ پیاسەكردنیش چووم بۆ ڕۆخی دەریا. (...)

ئانتونی باوكت

* * * * *

كنیپەر

1ی مارت

پترۆزبورگ

بەیانیت باش ئازیزم. بەهار بەڕێوەیە! لەم كاتەدا كە بۆت دەنووسم، پەنجەرەكە نیوە كراوەیە و خۆر لە درەوشانەوەدایە. هەوا تەواو گەرم بوە. دەتوانم لە دەرەوە گوێم لە دەنگ و تەقەتەقی تایەی ئەرەبانەكان بێت. هەوا كاری خۆی كردووە. وەك ئەوە وایە بۆ گەڕان چووبم. چونكە هەوای ژوورەوە وەنەوزم پێدەدات، من شەیدای ئەم حاڵەتەم، بەهاری ڕاستەقینە بەمزوانە دەگات. بیستوپێنجی مانگ ساڵیادی دیدارمان بوو. هەستت پێكرد؟ داخ لە دەستی تۆ! ئێمە پەنجاهەمین نمایشی "خاڵ ڤانیا" و سەدەمین نمایشی شانۆگەریەكی چیخۆفمان تێپەڕاند "نمیروڤیچ" گوڵی زۆر دەگمەنی نارد بۆ شوێنی خۆگۆڕین (...) دوای نمایشەكە شامپانیامان خواردەوەو ئاسایی یەكەم پێكمان بە سڵامەتی تۆ بوو. لەگەڵ ژاوەژاوی ڕۆژنامەكانیشدا ورەمان چاكە.

لەبارەی سەركەوتنمان لە نێو بینەراندا چ گومانێك نییە، ئەوان دەڵێن تا ئێستا لە پترۆزبورگدا شانۆ بەم جۆرە هەستی نەوروژاندووە، "خاڵ ڤانیا" و "دوژمنی گەل" ئەستێرەی درەوشاوەن. دوێنێ "سێ خوشكەكە"مان نمایش كرد. زۆرباش بوو، بە چاكی پێشوازی لێكرا. وەك دەڵێن لە نمایشەكەی مۆسكۆ باشتر بوە، چوارەم ڕۆژی مارت یەكێتی نووسەران ئێوارە خوانێكیان لە "كونتانا"[(4)] بۆ سازداوین. ریكلامەكەت لە ڕۆژنامەدا بڵاوبۆتەوە، زۆرباش نییە؟ ڕۆژی شەممەیش بۆ میوانی عەسر بانگهێشتیان كردووین.

دوێنێ لە ڕۆڵی "سێ خوشكەكە"دا جانانەبازیم كرد و لە كۆتایی نمایشەكەدا ئیتر لەپێكەوتم. دیسان دەیڵێمەوە، ئەوە ڕۆڵی دڵگیری منە. تۆیش هەستی پێدەكەیت؟ شانۆ شەكەتی كردووم، فەزایەكی كراوەم پێویستە، دەمەوێت دوای ئەم زستانە سەخت و قورسە و دوای ئەم هەموو كێشمە كێشە سیەكانم پڕ بكەم لە هەوا. كە نامەكەم تەواو كرد بۆ پیاسە و گەڕان دەچمە دەرەوە. حەزم لە دیمەنی "پترۆزبورگ"ە، پێم خۆشە بە كەناری رووبارەكەدا پیاسە بكەم، خەڵكەكەی، شۆستە

پانەکانیم پێ جوانە، هەموو شتێك ئاوو هەوای ئەوروپایە، بەڵام تۆ حەزی لێ ناکەیت، وانیە؟
* * * * *

**چیخۆف**

**1ی مارت**

**یاڵتا**

ئازیزم، رۆژنامەکان مەخوێنەرەوە ئەگینا دیق دەکەیت. لێگەرێ با ئەمە وانەیەك بێت بۆ تۆ. تەنیا گوێ لەم شکۆمەندە ئاقڵەی خۆت رابگرە. من وتم و بە دڵنیاییشەوە وتم کە لە "پتروزبورگ"دا چی دەقەومێت — دەبوا گوێت لێ بگرتمایە. ئیتر شانۆتان ناڕواتە پتروزبورگەوە، سوپاس بۆ خودا.

من شەخسی خۆم واز لەشانۆ دەهێنم، ئیدی هیچ بۆ شانۆ نانووسم. لە ئەڵمانیا، سوید و تەنانەت لە ئیسپانیادا دەشێ نمایشنامە بنووسیت، بەڵام لە ڕوسیا شانۆ نرخی نییە، هیچیان بەرناکەوێت شەق خواردن نەبێت. نە لە سەرکەوتنیان خۆش دەبن نە لە نوشوستیان.

ئەمە یەکەمین جارتە پەلامار دەدرێیت و توانجت تێدەگیرێت. بۆیە وا نارەحەت و بێزاریت، بەڵام هەموو شتێك دەگوزەرێت و رادێیت.

هەوای ئێرە زۆر چاکە، گەرم، هەتاو، درەختەکانی قەیسی و بادام شکۆفەیان کردووە. بۆ هەفتەی پیرۆز چاوەڕێتم ئەکتەری چکۆڵە و بێچارەو ستەم دیدەکەم کە قەدریان نەگرتوویت. چاوەڕێتم، چاوەڕێتم، لە بەینی 20 و 28 دا پێنج نامە و سێ تەلەگرافم بۆ ناردوویت، داوام لێکردبوویت تەلەگرافم بۆ بکەیت و نەتکرد (...)

باری تەندروستیم باشە باوەڕت بێت. لە ئامێزت دەگرم.

**باوکت**

* * * * *

**کنیپەر**

**2ی مارت**

**پتروزبورگ**

حاڵت باش نییە؟ ئانتوانی ئازیزترینم؟ هەست بە تەنیایی دەکەیت؟ ئازیزە بێنەواکەم! خۆزگا لێرە بویتایەو چاودێریم بکردیتایە، نازم هەڵدەگرتیت و دڵم دەدایتەوە! دوێنێ دوو تیکەم لە "روسیا" بۆ ناردیت. بەڵام ئەم رۆژنامە لاکۆڵانانە هەموویان بێ کەڵکن. بۆیە هیچیان ناکڕم و بۆت نانێرم. بۆ زەحمەت بە خۆت دەدەیت و تەلەگرافم بۆ دەنێریت، لە تەلەگرافەکەدا چیت بۆ نووسیوم؟ لێرە هیچ شتی تایبەت روونەداوە. دەژین ، نمایشی شانۆ دەکەین، هەموو باشین.

ئەمڕۆ "خاڵ ڤانیا" نمایش دەکەین و پاش هەفتەیەکی تەواو پشوو دەدەین.
* * * * *

**کنیپەر**

**3ی مارت**

**پتروزبورگ — 2ی بەیانی**

ئەگەر تەنانەت دوو دێڕیشت بۆ نەنووسم ناتوانم بنووم، هەر ئێستا لە میواندارییەکەی یەکێتی نووسەران گەڕاومەتەوە، دانیشتنەکە زۆر سادە و دڵکارانەبوو. زۆر کەس هاتبوون، هەموو تاریف و دەستخۆشیان لە شانۆکەمان

دەكرد. دەربارەی ئێمەی ئەكتەر هەستیاریەكی زۆر هەبوو! لە ڕادەبەدەر هەستم جوولاً، "وین بێرگ"[5] وتاری كورتی پێشوازی خوێندەوە، وتی ئەمە یەكەمین جارە بتوانین پەیوەندی نێوان ئەدەبیات و شانۆ ببینین و.. هتد. چەپڵە (...)

بەلاّم من لە جەژنی پاكدا نایەم بۆ "یاڵتا" دەزانیت بۆ، بیری لێ بكەرەوە. تۆی زۆر خۆشەویست داوەتیت كردووم و نایەم! كەچی تێناگەیت؟ (...)

تووتكەكەت

* * * * *

جیابوونەوەی "ماشا" و "ڤرشنین"دا كرد و هەموو ئەوانەی ناو هۆڵەكە كە 150 كەس بوون چەپڵەیان بۆ لێدام، لە بارەی پەردەی چوارەمیشەوە زۆر شتم بیستوە. گەلێكیان كە باسیان دەكرد، دەگریان. تۆ بۆ ئەوەندە لە دەست شانۆ تووڕەیت؟ هیوادارم لەبەر ئەو قسە هیچ و پووچانە نەبێت. ئەمانە كۆمەڵە كەسێكن توانایان سنووردارە.

بەڕاست بەمانە دەڵێیت ڕەخنەگر؟ دەماری خۆت بەوانەوە ناڕەحەت مەكە. تفیان لێ بكە، (...) ئیتر بە هیچ جۆرێك بە خۆت مەڵێ باوك. بەڕاستی حەزی لێ ناكەم.

* * * * *

كنیپەر

5ی مارت

پترۆزبورگ

لە پترۆزبورگەوە نامە دوای نامەت بۆ دەنووسم كەچی دەڵێیت بە دەستم ناگات. بۆ هونەرمەندە چكۆڵەكەت كە ڕێزیان لێ نەگرتووە دڵتەنگ مەبە ئازیزەكەم. ئەگەر بلاّوكراوەكانی ئێرە توند لە سەرمان دەنووسن، بەلاّم لەبری ئەوە خەڵكی خۆشیان دەوێین و هەموو ئەوانەی پاشملە قسە دەكەن شەرمەزار بوون. ڕۆڵی منیان لە "سێ خوشكەكە"دا زۆر لا پەسەند بووە تەنانەت دوێنێ، لە نیوەڕۆ خوانەكەی یەكێتیی نووسەراندا، یەكێك باسی لە دیمەنی

**پەراوێزەكان:**

1- *odessa*

2- *murska*

3- *moskovin*

4- یەكێكە لە باشترین رستورانی پترۆزبورگ.

5- *weinberg*

**سەرچاوە:**

دلبند عزیزترینم / لا 131-143

# وێستگەکانی سەردەم

 مارکیز لە هەشتا ساڵیی تەمەنیدا

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد

 فێندەمێنتالیزم لە خۆرهەلآت و خۆرئاوا

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

 جیهانی بانانا یوشیموتو..
وردەکارییە بچووکەکانی ناوماڵو سەرشەقام

نزار ئاغری

لە عەرەبییەوە: ساکار ڕەووف

 خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی "تیرۆرستانی خودا"

جۆن والْش

لە عەرەبییەوە: عەزیز ڕەئووف

 نامەکانی دۆستۆیفسکی پێش فەرمانی تیرەباران کردن و دوای ئەوە

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

 یان هەموومان لەناو دەچین یاخود هەموومان پێکەوە ڕزگارمان دەبێ

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# مارکیز لە هەشتاساڵیی تەمەنیدا

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد


گابریل گارسیا مارکیز

ساڵی 2006 لە لەندەن و نیویۆرک و لە دەزگای چاپ و پەخشی چێلسی، کتێبێک لەبارەی ژیانی رۆماننووسی ناوداری کۆلۆمبی گابریل گارسیا مارکیز چاپ کرا. ژمارەیەک توێژەرو رەخنەگر بەشدارییان لەم کتێبەدا کردووەو رەخنەگری ئەمریکی هارۆلد بلۆم پێشەکی بۆ نووسیوە، تیایدا تیشک دەخاتە سەر چەندین لایەنی ژیانی ناوادارترین رۆماننووسی ئەمریکای لاتینی کە لە ساڵی 1982دا پاداشتی نۆبڵی وەرگرتووە. مارکیز خاوەنی شاکاری (سەد ساڵ لە تەنیاییدا)یە کە بۆ چەندین زمانی دنیا وەرگێڕدراوەو بە یەکێك لە شاکارەکانی ئەدەبی جیهانی دادەنرێت.

مارکیز لە 1928/3/6دا لە یەکێ لە گوندەکانی کۆلۆمبیا لەدایك بووە. واتە پێدەنێتە تەمەنی هەشتا ساڵییەوە. کاتێك منداڵ بوو گوێی لە حیکایەتە سیحرامێزەکانی داپیرەی دەگرت، لە ماڵێکی لادێیی پڕ لە تارمایی بەردەوام گوێی بۆ حیکایەتە میللییەکانی کۆلۆمبیا شل دەکرد، دواجار ئەو ماڵە بوو بە چوارچێوەیەك بۆ زۆربەی چیرۆك و رۆمانەکانی.

لە ساڵی 1946دا قۆناغی ئامادەیی تەواو دەکات و دەچێتە بۆگۆتای پایتەخت تا لە کۆلێجی یاسادا بخوێنێت، لەو ماوەیەدا دەستی کرد بە نووسینی کورتە چیرۆك، ئیدی نەیتوانی کۆلێجی یاسا تەواو بکات چونکە بە دڵی نەبوو، بانگەوازی ئەدەب کاریگەریی زیاتری هەبوو.

پاشان بوو بە رۆژنامەنووس و پەیوەندیی بەرەوتە پێشکەوتنخوازو کەسایەتییە چەپەکانەوە کرد، لەلایەن ئەو رۆژنامەیەی کاری تیادا دەکرد، نێردرا بۆ ئەوروپا، واتە لە ساڵی 1955 گەیشتە ژنێف و پاشان چوو بۆ رۆما، لەوێدا ناوی خۆی لە بەشی سینەمادا تۆمار کرد، بەڵام پاش چەند مانگێك رۆژنامەکەیان لەلایەن رۆگاس بینیلای دیکتاتۆر داخرا.

کاتێك گەیشتە پاریس بە تەواوی بێ پارە بوو، لە ژوورێکی پەرپووتی نهۆمی سەرەوەی شوقەیەکدا دەژیا لە گەڕەکی لاتینی کە ژمارەیەکی زۆری نووسەرانی دنیا لەوێدا ژیاون، لە ساڵی 1958دا سەردانێکی ئەڵمانیای رۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤێت و هەنگاریا دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ پاریس و ئینجا لەندەن و کاراکاس دوا جار دەگەڕێتەوە بۆ کۆلۆمبیا لەوێ کچێك دەخوازێت بەناوی مارسیدس مارشا باردۆ. لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا لە یەکێك لە ئاژانسەکانی دەنگوباسدا لە بۆگۆتا کاری کرد، پاشان چوو بۆ هاڤاناو نیویۆرك.

مارکیز لە ساڵی 1965دا دەستی کرد بە نووسینی رۆمانە ناودارەکەی "سەدساڵ لە تەنیاییدا" کە بە دوو ساڵ تەواوی کرد و لە ساڵی 1967دا لە بۆینس ئایرس بڵاویکردەوە. هەر لەو کاتەوە نێوبانگێکی گەورەی لە سەرانسەری ئەمریکای لاتینیدا پەیداکرد، ئەمە بەرلەوەی دەنگ و سەدای مارکیز بگاتە ئەوروپا کە لە دواییدا ئەو رۆمانە وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی. ئیدی مارکیز گەشتی بۆ ئیسپانیا کرد و لە نێوان سالآنی 1968 تا 1974 لە بەرشەلۆنەدا ژیا، جا لەبەرئەوەی مارکیز وەکو سەرجەم نووسەرانی تری ئەمریکای لاتینی زمانی ئیسپانی دەزانێت و پێی دەنووسێت، بۆیە لەوێدا هەستی بە نامۆیی نەکرد. مارکیز هەمیشە سۆزداریی خۆی بۆ بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی ئەمریکای لاتین نیشانداوە کە لە پێناوی دیموکراتی و لە دژی سیستمی دیکتاتۆری تێکۆشاون. لە ساڵی 1975دا مارکیز رۆمانە ناودارەکەی "پایزی پەتریارك"ی چاپکرد، ئەم رۆمانە لەیەك کاتدا لە چەند پایتەختێکدا چاپ و بڵاوکرایەوە، واتە لە بۆگۆتا و بەرشەلۆنە و بۆینس ئایرس کە چاپی یەکەمی نزیکەی دوو ملیۆن دانەی لێ فرۆشرا، دوای ئەوە لە ساڵی 1982دا پاداشتی نۆبڵی وەرگرت و نێوبانگێکی گەورەی لە سەرتاسەری جیهاندا پەیداکرد.

لە ساڵی 1986دا یەکێ لە رۆمانە هەرە گرنگەکانی بڵاوکردەوە بەناوی "خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرادا"، لە ساڵی 1989یشدا رۆمانی "جەنەراڵ لە مەتاهاتەکانیدا"، سەرباری ئەو هەمو بەرهەم و سەرکەوتن و نێوبانگە، کەچی جارێکیان دەنووسێ: لە ژیانمدا هیچ کتێبێکی خۆم جارێکی تر نەخوێندۆتەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك لە چاپکردنی پەشیمان ببمەوە.

رەخنەگری ئەمریکی هارۆڵد بلۆم لەم کتێبەدا تیشك دەخاتە سەر رۆمانەکانی مارکیز بەتایبەتی رۆمانی سەد ساڵ لە تەنیاییدا کە ژیان و بەسەرهاتی بنەماڵەیەك دەگێڕێتەوە، بنەماڵەیەك هەرسێ قۆناغی ژیان دەبینێت: منداڵی و پێگەیشتن و مردن.

لە میانی ئەو قۆناغە دوور و درێژانەدا نهێنییەکانی ئەو بنەماڵەیەمان بۆ دەردەکەوێ و خۆشی و ناخۆشییەکانیان دەخوێنینەوە، لە میانی

وێنــــــەگرتنێکی جــــــوانی ڕووداوەکـــــان و بـــــارودۆخ و ژینگــــە و کەســــــایەتییەکاندا سەرانــــــــسەری جیهانێـــــــک دەخوێنینـەوە کە بەشێکی زۆری بریتییــە لــە جیهــانی منــداڵیی ڕۆماننووس.

ئـەو خێزانـە لـە گوندەکـەدا دەیــەوێ لــە نــەفرەتێك ڕزگــاری بێــت، نــەفرەتی ســەد ســاڵ لــە دووره پەرێزیـــدا، ئـــەم ڕۆمانـــە داســـتانێکە پــڕە لـــە خـــەون و واقیـــع و تژییـــە لـــە وشـــەی ئەفسوناوی و ئەفسونی وشـە. بـا پیرە گـەورەی خێزانەکـە ئـەو گونـدە دووره پــەرێزەی بنیــات ناوه، بەرلەوەی دوچاری لافاو و مـەرگی ئاژەڵـەکان بـبن و لـە نێـو بچن، پێشتر لە ژیانێکی خۆش و سـەرەتاییدا دەژیـان، ئـەم ڕۆمانـە چەشـنێکی تـرە لـە ڕۆمـانی دۆن کیخۆتـــەی ســـێرڤانتس و لـــە مەزنیـدا دەگاتـە ئاسـتی ئـەو ڕۆمانـە، بە هـۆی ئـەوەوە مـارکیز ڕۆمـانی مــەزنی لـە سەرانسـەری ئەمریکای لاتین و بگـرە جیهانـدا دامەزراند.

لـــە ڕۆمـــــانی "پــــایزی پـەتریارك"دا نووسـەر تابلۆیـەکی کۆمیـدی ئامێزمـان پێـشکەش دەکـــات لـــەبارەی سیـــستمە دیکتاتۆرییــــەکان، بێگومـــــان ڕۆمانەکانی ئەمریکای لاتین لـەم سـی ساڵەی دواییـدا دیمـەنێکی وردو ڕاســــتیان لـــە بـــارەی سیستمی دیکتـاتۆری پێشکەش کــــردووین کـــە داپڵۆســـین و کوشـتن و ئـەتککردن و هـەموو چەشـنە تـاوانێکی تـر لـە دژی نەیارە سیاسیەکانیان سیمایەکی بەرجەســـتەی ئـــەو ڕژێمـــە دیکتاتۆرییانـــەی ئــــەمریکای لاتینن. بەڵام مارکیز شتێکی تری بۆ زیاد دەکات ئەویش لە ڕێگەی خـــــستنەڕووی وێنەیــــــەکی گاڵتـــەجاڕی و پێکەنینهێنـــەری دیکتاتۆرەکانە، لێرەدا پەتریارك دیکتاتۆرێکــــە لــــە وێنــــەی دیکتاتۆرەکانی ئەمریکای لاتین، پـــەتریارك کۆنـــە جەنەڕاڵێکـــە تەمـــەنی لـــە نێـــوان 107-232 ســاڵە، زۆرداریکــە گومــانی لــە هــەموو کــەس هەیـە و متمانـەی بەکـەس نییـە. مـارکیز لـە میـانی

پیـــــشاندانی دەبەنگیـــــەکانی دیکتاتۆردا دەمانهێنێتە پێکەنین، لـە ڕۆمـانی سـەد سـاڵ لـە دووره پەرێزیــــشدا هــــەمان ســــتایلی ســـــیحرامێزی ســـــەرنجڕاکێش دەبیـنین، مـارکیز دەیـەوێ پێمـان بڵێت: ئاخۆ دەشێت مرۆڤێك بـە دەسـەڵاتێکی ڕەهـاوە حـوکمی وڵات بکـات و نەکەوێتـە نـاو ئـەو گەندەڵییـــە گـــشتییەوە کـــە دەسـەڵاتی ڕەهـا دەیخوڵقێنێـت. دەشـێت لـەم ڕۆمانـەدا وێنـەی بینوشـــەی دیکتـــاتۆری چـــیلی ببیـــنین کـــە کودەتـــای بەســـەر ســـلڤادۆر ئەلیندیـــدا کـــرد و کوشـتی. ئـەم وێنەیـەیش لـە ڕاســــتیدا بەســــەر هــــەموو دیکتاتۆرەکـــانی ئـــــەمریکای لاتینیدا دەسەپێت.

**سەرچاوە:**

سایتی: www.albayan.ae

# فێندەمێنتالیزم لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

زانستی ئەنسرۆپۆلۆژیاو لە پێشیشیانەوە "کلۆد لیڤی شتراوس" ڕۆڵیان هەبوو لە کەمکردنەوەی بایەخ و گرنگی ژیاری خۆرئاوا. "شتراوس" دوای جەنگی دووەمی جیهانی و تاوان و دزێویەکانی ئەو جەنگە (لەوانەش هۆلۆکۆست)، بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە شارستانیەتی خۆرئاوای دەڕوانی و بەمجۆرە تێرمی شارستانی بەسەر هەموو سستمێکدا دادەبڕی، ئیتر سەرەتایی بوایە یاخود پێشکەوتوو. زۆرێك لە خۆرئاواییەکان کەوتنە ڕەخنەکردنی ئەو دیدگا ڕێژەییەی بۆ شارستانیەتەکان و پێییان وا بوو ئەم کارەی "شتراوس" جۆرێکە لە تۆڵەکردنەوە لە شارستانیەتی خۆرئاوا کە لە قۆناغی فاشیزم و نازیزمدا لە پرانسیپەکانی ڕۆشنگەری لایدا.

ئەگەر لە چوارچێوەی ئەم دیدگا ڕێژەگەراییەوە سەیر بکەین، ئەوا دەبێت سستەمی تاڵیبان وەك شارستانیەت سەیر بکەین و لە ڕیزی سستەمی سویسرایی و هۆڵەندی و ئەوروپییدا دایبنێین!! بەڵام خۆشبەختانە دامەزرێنەری بونیادگەری لە فیکری ئەوروپی هاوچەرخدا، دوا جار لەم بۆچوونانەی پاشگەز بووەو ئێستا دان بە هەندێ خەسڵەت و تایبەتمەندی ژیاری مۆدێرندا دەنێت، وەك: (ئازادی تاکەکەسی و تۆلێرانسی ئایینی و پلورالیزمی فیکری وسیاسی و.. هتد).

شایەنی باسە زۆرێك لە نوسەرانی فێندەمێنتالیزم لە وڵاتانی عەرەبیدا، بیروڕاکانی "شتراوس" و "فۆکۆ" و قوتابخانەی فرانکفۆرت و تەنانەت "هایدگەر" و "نیچە" یان بەکارهێناوە، بۆ ئەوەی بۆچوونەکانی خۆیانی پێ پشتڕاست بکەنەوە و هاوکات بکەونە وێزەی مۆدێرنە و ڕۆشنگەری و وەك یەکێك لە دەرکەوتەکانی شارستانی نەك تەواوی شارستانی لێی بڕوانن. تەنانەت ئەوەندە زیادە ڕۆییان لە ڕەخنەکانیاندا کرد، تا ئەو ڕادەیەی سیفەتی شارستانیان لە خۆرئاوا سەندەوەو کەوتنە سڕینەوەو تەکفیرکردنی

بیروباوەڕ و دنیابینی خۆرئاواییەکان. ئەم بۆچونانە لەگەڵ هەڵکشانی چەپی پەڕگیر لە کلتوری خۆرئاواو عەرەبیدا، ڕەواجیان پەیدا کرد. بەڵام دوای ئەوەی مەترسی ئەم بۆچونانە بۆ هەموو لایەك ئاشکرابوو، ئەم قۆناغە بەرەو کاڵبوونەوەو کۆتایی دەچێت. هەنووکە هەموان کۆکن لەسەر ئەوەی کە جیاوازی لە نێوان شارستانیەت و بەربەریەت، تۆلێرانسی ئایینی و دەمارگیری کوێرانە، ستەمکاری سیاسی و سستمی دیموکراسیدا هەیە.

دوای ئەوەی پرۆسەی پاکتاوی ڕەگەزی و مەزهەبی لە چەند ناوچەیەکی جیهاندا روویدا، هیچ کەس سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی مۆدێرنە، یاخود تێگەشتنی تاریکخوازی کۆن بۆ ئایین لەگەڵ تێگەیشتنی رۆشنگەری و ئەقلانیدا، لەیەك تادا دانانێت. لەم گۆشە نیگایەوە تێرمی پێکدادانی شارستانیەتەکان، مانا و مەبەستی خۆی لە دەست دەدات. چونکە ئەو ململانێیەی هەنوکە لە ئارادایە، لە نێوان شارستانیەتی مۆدێرنە وەك گشتێك لەگەڵ فێندەمێنتالیستە توندڕەو و پەڕگیرەکاندایە لە هەر جێیەك بن. کەواتە ململانێ لە نێوان ژیارە جیاجیاکاندا نییە، بەڵکو ئەوەی هەیە ململانێیە لە نێوان شارستانیەتێکی گەردوونی و مرۆڤدۆستانە لەلایەك، لەگەڵ نەفامی و ئەو تاریکخوازە قین لە دڵانەی چاویان بە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی هەڵنایەت لەلایەکی ترەوە.

بەم پێیە شارستانیەت هەر بە تەنها خۆرئاوای ئەوروپی و ئەمریکی ناگرێتەوە، بەڵکو بریتییە لە سەرجەمی ئەو توێژە رۆشنگەرانەی خواستیان پێشکەوتن و بەرەو پێشچوونە لە جیهانی ئیسلامی و ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین و.. هتد. بەمجۆرە تەنانەت لەناو خودی خۆرئاواشدا، هێزگەلێك دەبینین کە داخ لە دڵ و چاویان بەو شارستانیەتە هەڵنایەت. مەبەستم لەو هێزانەش ڕاستی توندڕۆی ڕەگەزپەرستە کە پێیوایە میللەتانێك هەن بۆ شارستانیەت دروستبوون وەك گەلانی ئەوروپایی، میللەتانێکی دیکەش هەن بۆ نەفامی و دواکەوتوویی خوڵقاون، ئەوانیش میللەتانی ئیسلامی و عەرەبین. کەواتە ئەوەی هەیە کێشە و ململانێی فێندەمێنتالیستەکانە لەگەڵ یەکدیدا، نەك ململانێ و پێکدادانی شارستانیەتەکان بێت. بۆ نموونە ئەو وەزیرە ئیتاڵیەی وێنە کاریکاتیۆریەکانی کردبوو بە سنگیەوە، هیچی لەو فێندەمێنتالیستانە کەمتر نییە کە لە خۆرهەڵاتدان. خۆش بەختانە "سلڤیۆ بیرلسکۆنی" ئەو وەزیرەی لە پۆستەکەی لاداو لە کابینەکەیدا جێی نەکردەوە.

لێرەوە ئاشکرا دەبێت ئەو ململانێیەی هەنووکە لە ئارادایە لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا و تەنانەت لە نێوان جیهانی ئیسلامی و خۆرئاوادا نییە، بەڵکو لە نێوان رۆشنگەران و دەمارگیرانی هەموو کۆمەڵگەیەکدایە. بەمجۆرە تێزەکانی "بێرنارد لویس" و "ساموێل هنتنگتۆن" دەربارەی ململانێی شارستانیەتەکان شکست دێنێت، لەبەرئەوەی ئەم ڕەهەندەیان بەهێند نەگرتووە. بەڵام لێرەدا جێی خۆیەتی بڵێین رێژەی نەزانین و دەمارگیری لە وڵاتانی ئیسلامیدا زۆر زیاترە لەوەی لە جیهانی خۆرئاوادا هەیە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تا ئێستا بزاوتی ڕیفۆرمی ئایینی و رۆشنگەری فەلسەفیمان بە خۆمانەوە نەبینیووە، وەکو ئەوەی بە درێژایی چوار سەدەی رابردوو لە ئەوروپادا رویدا. ئەمە ڕاستیەکی

حاشا هەڵنەگرەو نکوڵی لێکردنی هیچ سودێکمان پێناگەیەنێت، بە پێچەوانەوە کارێکی وا دەبێتە مایەی ئەوەی هەر بەدواکەوتویی بمێنینەوە، لەبەرئەوەی ناهێڵێت شتەکان وەکو خۆیان ببینین و ئەمەش وا دەکات ئەرکە گرنگ و سەرەکیەکانمان بیرچێتەوە.

من دەزانم ئەم قسانە زۆرێك لە کەسانی خۆ بە شتزان و سۆفستائیەکان لە کایەی عەرەبی و ئیسلامیدا جارس دەکەن، بەڵام ناچارم لە پێناو حەقیقەتدا و هەروەها لە پێناو بەرەو پێشچوونی گەلانی عەرەبی و ئیسلامیدا باسیان بکەم.. ئەوەی دەربایسی گەل و میللەتی خۆیەتی، بیریاری رەخنەگری قسە لە رووە، نەك ئەو بیریارانەی خەریکی روپامایکردنن و دنەی رۆحی دەمارگیری و شۆڤێنیزم دەدەن.

بەڵام داخۆ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ کەم و کوری و هەڵەیەك لە شارستانیەتی خۆرئاوادا نییە؟ ئایا ئەمە مانای وایە کە مۆدێرنە موقەدەسە و نابێت رەخنەی لێبگیرێت؟ بێگومان نەخێر. بەڵام بەر لەوەی رەخنە لە کەموکورییەکان بگرین، پێویستە دان بە دەسکەوت و لایەنە پۆزەتڤیەکانیدا بنێین، لە ریزی پێشەوەشدا ئازادی بیرکردنەوەو رەخنە و رادەربرین، بێگومان دەتوانین لەگەڵ ئەمانەشدا باس لە دەوڵەتی یاسا و دامودەزگاش بکەین، نەك دەوڵەتی بەرتیل و گەندەڵی.

هەروەها دەتوانین شتگەلێکی تر باس بکەین کە کۆمەڵگاکانی ئەوروپا لێی بەهرەمەندن و کۆمەڵگا عەرەبی و ئیسلامییەکانیش لێی بێبەشن، لەوانە: بیمەی کۆمەڵایەتی و تەندروستی و یەکسانی نێوان هاوڵاتیان و جیهێشتنی قۆناغی تایفەگەری و دەستەگەری و مەزهەبی کە تا ئێستاش گەلانی ئێمە بە دەستیانەوە دەناڵێنن و هەرەشە لە یەکیەتی نیشتمانیان دەکات. ئەم رستانە لە پای ئەو شتە ترسناکانەدا دەنووسم کە هەنووکە لە عێراقدا روودەدات. ئەوەی ئەم دەسکەوتە گرنگ و بەنرخانە نەبینێت، یان نابینایە یاخود خۆبەزلزانێکە کە هیچ خێرێك ناداتەوە!

خۆ ئەگەر وانەبێت، هەزاران کۆچبەر هەوڵنادەن خۆیان بگەیەننە کەنارەکانی ئەوروپا، تەنانەت ئەگەر سەریشیان تیا بچێت و نوقمی دەریابن. گەر وا نەبوایە سەدان رۆشنبیری عەرەب و موسڵمان ژیانی تاراوگەیان لە لەندەن و پاریس هەڵنەدەبژارد، بۆ قوتاربوون لە دەست ئەو ستەمکاری و دەمارگیرییەی لە سەردەمی عوسمانیەکانەوە هەیە و تا ئەمرۆ بەردەوامە. بێگومان بە ئاسانی دەتوانین رەخنە لە کەموکورییەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا بگرین، بە تایبەت ئەوەی پەیوەندی بە هاوجنسبازی و پەرگیریکردنەوە هەیە لە بەرەڵلایی و تێرکردنی حەز و ئارەزووەکان. رەخنەیەکی لەمجۆرە بە بۆچوونی من رەوایە، بەڵام نابێت کۆی شارستانیەتی خۆرئاوا بۆ دیاردەیەکی لەمجۆرە کورت بکەینەوە، چونکە ئەمە شتێکی لاوەکی و پەراوێزە. ئێمە دەتوانین رەخنەی زۆر توندتر ئاراستەی ئەو شارستانیەتە بکەین، ئەویش خود پەسەندی و داخرانە بەسەر خوددا، هەروەها دەکرێت سەرزەنشتی ئەوەشی بکەین کە داوا لە موسڵمانان دەکات لە ماوەی چوار ساڵدا ئەوە بکەن کە ئەو لە چوار سەدەدا بە دەستی هێناوە!

ئاشکرایە گۆرینی پرۆگرامی خوێندن یاخود نوێکردنەوەی بیرکردنەوە بە گشتی، لە شەوو رۆژێکدا روناادەن، بەڵکو پێویستی بە کاتی زۆرتر و زیاتر هەیە.

**سەرچاوە:**

الشرق الاوسط – 2006/1/28

# جیهانی بانانا یوشیموتو....

# وردەکارییە بچووکەکانی ناوماڵو سەرشەقام

نزار ئاغری

لە عەرەبییەوە: ساکار ڕەووف

"نزیکترین جێگایەك لێم چێشتخانەیە.گرنگ نییە لە هەر کوێ بێو هەرچۆنێك بێت، گرنگ ئەوەیە ئەو جێگایەیە خۆراکی تیا ئامادە دەکرێ".

ئەمە وتەی (بانانا یوشیموتو)ی کچە چیرۆکنووسو ڕۆماننوسە کە جوانترین دەقەکانی لە ژێر ناونیشانی (چێشتخانە)دا نووسیوە و بەمەش لە شاگردێکی قاوەخانە لە تۆکیۆ دەبێتە نووسەرێك کە بەرهەمەکانی بۆ زیاد لە 20 زمان وەردەگێردرێ.

ڕۆمانی (چێشتخانە) ڕۆمانی خواردن و چێژ و بۆن و ڕاهاتن و ئەو دەمەتەقێیانەیە کە وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە دەگێڕێتەوە.

میکاجی ساکورای ئەو کچەی پاش مردنی نەنکی، کە دوا ئەندامی خێزانەکەیەتی، خۆی بەتەنها دەبینێتەوە، هەربۆیە خێرا هاوڕێیەك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە بۆئەوەی تەنهاییەکەی بڕەوێنێتەوە. یوشی تاناشی ئەو هاوڕێی خوێندنەیە کە هەوڵێکی زۆر دەدات بۆئەوەی قورسی ئەو تەنهاییەی لەگەڵدا بەش بکات.

تاناشی میواندارى میکاجی دەکات بۆئەوەی لەگەڵیدا لە ماڵی باوکیدا بژی. میکاجی لەماڵە تازەکەدا هەست بە حەسانەوە و ئاسودەیی دەکات و چێژێکی تایبەتیش لە بردنە سەری کاتێکی زۆر لە چێشتخانە دەبینێ. لەوێ ژیان بەسەر دەبات و کات تێئەپەڕێنێ : دائەنیشێ، ئەخوێنێتەوە، ئەنووسێ، خەون دەبینێ، خواردن ئامادە دەکا، چا دەخواتەوە، چێشتخانەکە پاك دەکاتەوەو بەنێو قاپ و قاچاغ و بەهارات و داودەرمان و میوەو سەوزەدا دەگەڕێت.

دەقەکانی بانانا لەیەکەم ساتدا سادەو ناکاملْ ودوورن لە قوڵییەوە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات خوێنەر هەست بەوە ئەکات ئەمە ئەو جیهانەیە بانانا بە

پەرۆشەوە خۆی بۆ تەرخان ئەكات تا دەربارەی بنووسێ:جیهانێكی سادەی رۆژانەی ئاسان دوور لە گرێ‌و گۆڵی دەستكرد. جیهانی خودە بچكۆلەكان كە خەونی پێوە دەبینێ دوور لە كێشەی ئاڵۆزو كێشمەكێشە گەورەكان. ئەوە جیهانە پڕ میهرەكەی ناو چێشتخانەیە دوور لە هەواڵە ترسناكەكانی تەلەفزیون.

بانانا كچی بیرمەندی چەپڕەوی یابانی (تاكای یوشیموتو)یە. ناوە راستەقینەكەشی ماهوكو یوشیموتو (زۆر پێدەچێ ئەم ناوە خوازراوەی لە نووسیندا بەكاریهێناوە بەهۆی پەیوەندی مۆزەوە بێ بە چێشتخانەو خواردنەوە وە لەبەر ئاسانی زاراوەكە بە هەموو زمانەكان وەك خۆی دەڵێت).

بانانا لە ساڵی 1964 لەدایك بووە، لەماوەی كاركردنیدا لە قاوەخانەیەكی تۆكیۆ یەكەم چیرۆكی خۆی بەناونیشانی (لەژێر سێبەری مانگدا) نووسیوە.

نووسەر بایەخێكی تایبەت بە كێشە سۆزدارییەكانی گەنجان و مێردمندالان دەدات بەمەش چێژێكی زۆر لە قسەكردن دەربارەی شتە بچكۆلەكان دەبینێ. ئەو ژیانی هاوسەرێتی بەكارێكی پێویست نازانێ ئەمەش لە بەرهەمەكانیدا رەنگ ئەداتەوە،چونكە كەسایەتیەكانی پەیوەندی ناجۆر لەنێوان یەكدیدا دروست دەكەن.

زۆربەی چیرۆكەكانی بانانا چیرۆكی خۆشەویستی وردن هەروەك ئەو چیرۆكە وێنەییانەی لە گۆڤاری هەفتانەی مێردمندالاندا دەبینرێن. چیرۆكی سادەو زراڤن بەلام بە زمانێكی وردو سەرنج و وەسفێكی نائاسایی نووسراون. هەروەك جارێكیان خۆی باس لەوە دەكات كە هەست بە شەرمەزاری دەكات لەبەرئەوەی ئەو چیرۆك تەنها بۆ چێژ كات بەسەربردن دەنوسێت.

تەنها كەموكورتیەك لەم چیرۆكانەدا ئەوەیە كە چیرۆكەكانی تا رادەیەكی زۆر لەیەكتر دەچن. كەسایەتی و رووداوو و دیالۆگەكان تا رادەیەكی زۆر وەك یەكن. هەر لەوە دەچێ چیرۆكە دوای یەكەكان تەنها كۆپی چیرۆكێك بن لەگەڵ كەمێك دەستكاریدا. تەنها یەك چیرۆك بەلام لەچەند قاڵبێكی جیاوازو بە ناوی كەسانی جیاوازەوە.

كۆمەڵە چیرۆكی (رۆژانەی كویرە پیرێك) پێنج چیرۆكن دەربارەی پێنج كەس. هەریەكێكیان چیرۆكێكی نایابی خۆی هەیە كە لەوی دی ناچێت. چیرۆكەكان رەهەندی ئینسانی گشتیان هەیە. رووداوی ئازاربەخش كە بەسەر چەند ئاسۆیەكی تەماوی و ناجێگیردا دەكرێنەوە. خەونەكان بلاوئەبنەوە و ئاقارەكان لەناودەچن و كۆتاییەكانیش بێ ئومێدن. ئەمە ئەو ئەزموونەیە كە لەوانەیە هەریەك لە ئێمە لە رێگا دوورەكەی دوارۆژدا رووبەرووی بینەوە. چیرۆكی (ماڵی تارماییەكان) باس لە دوو هاورێی خوێندن دەكات كە هاورێیەتیەكی قەشەنگ كۆیان دەكاتەوە بەلام تووشی هەرەس هێنان دەبێت بەمەش دەبێتە مایەی خەم و پەژارە.

چیرۆكی (دایە) حیكایەتی ئەو كچە گەنجەیە (ماتوسوكا) كە لە خانەیەكی بلاوكردنەوەدا كار دەكات. ماسوكا پەیوەندی هاورێیەتی فراوان لەگەڵ هاوكارانی دەكات بەلام درك بە سادەیی و نەبونی مانای راستەقینەی ئەم جۆرە پەیوەندیانە دەكات هەربۆیە بڕیار دەدات واز لە كارەكەی بهێنێت و شار بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە دێیەكەی خۆی بۆناو خێزانەكەی بۆئەوەی هەموو ئەو

ســـۆز خۆشەویـــستییەی لـــە منداڵیـــەوە پـــێی بەخـــشرابوو بەدەستی بهێنێتەوە.

چـیرۆکی (منداڵـەکان) بـاس لـەو پەیوەندیـە پـاك و نـاجۆرەی کۆمـــەڵێك منـــداڵ دەکـــات کـــە نەگبەتی و بێهودەیی و پەرۆشی بۆ نادیار کۆیان دەکاتەوە.

پاڵـــــەوانی یـــــەکێك لـــــە چیرۆکەکان دەڵێت: ماڵەکەی من ئـەو شـوێنەیە کـە تیـا ئـەژیم وپێـــــوەی بەســــــتراومەتەوە . شــتەکان تێدەپــەڕن وەك چــۆن هەمیشە وابووە.

کۆمەڵـــە چـــیرۆکی (جەســـتە هەموو شتێك دەزانێ) لە سیانزە چـــیرۆکی کـــورت پێکهـــاتووە. چـیرۆکەکان دەربـارەی جەسـتەو هـەموو ئـەو گۆڕانانـەی بەسـەریدا دێـــن: خۆشـــی و ناخۆشـــی و شــــادیو ئــــازارو تــــرس و خۆشەویـستی و ڕق. جەسـتە لـە تەنهاییـدا چـەندە قـورس و لـە ئازادیـدا چـەندە سـوکە. کاتێـك جەستە دڵەڕاوکێ داگیری دەکات هەڵئەوەشێو چاوەڕێی سبەینێ دەکات کە چی بەسەردێ.

ڕۆمـانێکی دی بانانـا(پەلکـە زێڕینـە)یـە، کـە بـاس لـە ژیـانی کچێك دەکات بەناوی ئیکو. ئیکو لەگەڵ دایکیدا، کە چێشتخانەیەك بـەڕێوە دەبـات، دەژی. کاتێـك کـە ناوەنـدی تـەواو دەکـات بڕیـار دەدات بڕوات بۆ تۆکیـو و لـەوێش لـە چێـشتخانەیەکی ئەندەنوسـی کــار دەکــات.(باســەرنجی ئــەوە بــدەین کــە بــەردەوام موبــەق و چێـــشتخانەو قاوەخانـــە لـــە باســەکانی ئــەودا هەیــە). ئیکــو خـــۆی بـــۆ کـــارکردن لـــەو چێشتخانەیە تـەرخان دەکـات و بەتـــەنهایی لـــەنێو دیـــواری چێشتخانەکەو ژوورەکـەی خـۆی ژیـــان دەگوزەرێنـــێ. خـــاوەن کارەکەی داوای لێدەکات یارمەتی ژنەکـەی بـدات لـە کاروبـاری نـاو ماڵـدا ئەمـەش ئـاواتی ئـەو کـچە هێمنەیە بەڵام هەر خێرا کێشە لە نێـــــوان ژن و مێردەکـــــەدا ڕوودەداتو ئەمەش لەسەر ژیانی ئیکو ڕەنگ دەداتەوە.

(ســێبەرە بــچووکەکە) ئــەو ڕۆمانەیـە کـە ڕووداوەکـانی دوور لە یابان، ئەو شوێنەی کە زۆربەی چیرۆك و ڕۆمانەکانی بانانای تیا دروست دەبێت، ڕوودەدەن.کچە پاڵــەوانی چــیرۆکەکە کـــە لـــە ئـــەرژەنتین دەژی پـــاش ئـــەوەی بــــەمردنی خۆشەویـــــستەکەی دەزانـێ لـە تۆکیـۆ دەسـتبەجێ بڕیـــــاری گەڕانـــــەوە دەدات. دێڕەکانی ڕۆمانەکە پڕە لە سۆزو ناسـۆری کـە کەشـێکی خەفـە دەبەخـــشێتە ڕۆمانەکـــە تـــا ئەوەنـــــدەی وا دەردەکـــــەوێت مەســــەلەکە پەیوەنــــدی بــــە پرسـەیەکەوە هـەبێت بـۆ ڕووداوی مردنەکە.

(ماڵئـاوا تـسوگامی) ڕۆمـانی دوو کـچە، ماریـا (کـە بـە ڕانـاوی یەکـــەم قـــسە دەکـــات لـــە ڕۆمانەکەدا) و هاوڕێکـەی بەناوی تـسوگامی. ماریـا لـە تەمـەنی نـۆزدە سـاڵیدا ئـەو دوورگـە بچووکەی تیا دەژی جێدەهێڵێ و بـۆ خوێنـدنی زانکـۆ دەچـێتە تۆکیـۆ. پـاش چـەند سـاڵێك دەگەڕێتـەوەو لـەوێ پاڵـەوانی ڕۆمانەکە دەبینێ کە تسوگامیەو ئەمـەی دوایـی کـچێکی جـوان و ئازایـەو هـەموو کـەس حـەز بـە خۆشەویستی ئەو دەکات. یەکتر بینینـی ئـەم دووانـە کاریگـەرەو لەمێـشکدا چەسـپ دەبێـت. تسوگامی تووشی نەخۆشیەکی کوشندە دەبێت و پێش مردنی نامەیـەکی سەرسـوڕهێنەر ،کـە وەك وەسـیەتنامەیە، بـۆ ماریـای هاوڕێی جێدەهێڵێ.

ڕۆمـانی (مـانگی هـەنگوین) باسـی ژیـانی ماناکـا دەکـات کـە تەمـەنی بیـست و سـێ سـاڵە. ماناکـا لـە مـاڵێکی گـەورەی دەورە دراو بـە باخـچەیەکی فـراوان، کـە چـەند هـەنگاوێك لـە ماڵی هیروشی هاوڕێی منداڵیەوە دوورە، گـەورە بـووە. بـە مردنـی داپیـرەی هیرۆشـی دەرگاکـان واڵادەبـن لەبـەردەم ئـەم دوو

هاوڕێیە بۆ چونە ناو جیهانی دی نامۆو نوێوە.

کەسانێك دەقەکانی بانانا بە یاخیبونێك لەسەر ژیانی شارە شارستانیە جەنجاڵەکان دەبینن. ئەو شارانەی کە هەموو سۆزو پەیوەندیەکی مرۆڤانەی تیا ونەو راکردن بەدوای پارە بێ تێربوونی رۆحی وسۆزداری تیا بالادەستە. لە واقیعێکی وادا پەیوەندییە سۆزداریەکان تێکئەشکێن و کەشێکی ساردو توندو تیژ جێگای دەگرێتەوە.

ئەمە ئەو جیهانەیە کە بانانا لە چیرۆك و رۆمانەکانیدا بنیاتی دەنێت. جیهانێك کە هەموومان تیا دەژین و رووبەروی شکست و کێشەکانی دەبینەوە هەروەك چۆن تامەزرۆی خۆشییە بچووك و سەرکەوتنەکانین. ئەمە ئەو ژیانەیە کە لەسەری راهاتوین. دنیای خۆمان و هاوڕێ و خیزانەکانمانە. جیهانێك تژیە لە حەز و ئارەزوو بۆ ژیانێکی سادەی زۆر نزیك لە دەرگای چێشتخانە بۆئەوەی سیەکانمان بە بۆنی ئەو خواردنەی کە لەسەر ئاگرێکی هێمن پێدەگات، پڕبکەین.

**سەرچاوە:**

*www.daralhayat.net*




رۆمانی (ماڵئاوا تسوگامی) یەکێك لە بەرهەمەکانی بانانا یوشیموتو

# خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی "تیرۆرستانی خودا"

جۆن والش

لە عەرەبییەوە: عەزیز ڕەئووف

مێـژووی گروپـی وەهـابی لـە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، یەکێکە لە کتێبـە مێژوویـەکانی "چـارلیس ئـالین". نوسـەر لـەم کتێبـەدا دەیـەوێت توخمـە مێژووییـەکانی تـیرۆر لـە کۆمەڵگـەی ئیـسلامیدا شـی بکاتـەوە و هـەوڵ دەدات ماناکانی توندوتیژی لە مێژووی ئیسلامدا بدۆزێتەوە و ئەو ڕەگو ڕیشە شاراوانە کەشف بکات کە لـە دنیـای مۆدێرنـدا چـەمکی جیهـاد بـە مانایـەکی نـوێ لـە کۆمەڵگـەی ئیـسلامیدا دەبێتـە دەرکەوتەیـەکی تـەواو ئاشکرا و نوێ.

هەڕەشـەی تیرۆریزمـی نێونەتـەوەیی کاریگـەری لەسـەر سـەرجەم وڵاتـانی جیهـان هەیـە و سـنورەکان ناناسـێت. بابـەتی ناسین و تێگەیشتن لـە سروشـتی ئـەو کەسـانەی کـە بڕوایـان بـە تیرۆریـزم هەیە و پاساویان هەیە بـۆ کوشـتنی بەرامبـەر بـەناوی ئـاینێکی دیـاریکراو یـاخود بـە نـاوی خـوداوە بابەتگـەلێکی پێویـستە لـە چرکەسـاتی ئیـستەماندا. بـەر لـە هەرشـت دەبێت ئێمە لەوە تێبگەین کە چ مۆتیڤێك لە پشت تیرۆرەوە هەیە کـە ئیـستا بۆتـە دیاردەیـەکی تەواو جیهانی.

"تیرۆرسـتانی خـوا" گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو پیاوانەو ململانێکانیانـە لـەناو پـاکێتی ئایندا. نوسـەر دەیـەوێت بـاس لـەوە بکـات کـە تیرۆرسـتان پێیانوایـە ئـاین پـاکی خـۆی دۆڕانـدووە و دەبێـت پـاکی بگەڕێنینـەوە بـۆ ئـاین. ئـەوان پێیانوایـە دەبێـت کۆمەڵگـە بگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی زێڕین . *Golden age*

بزوتنـەوەی وەهـابی وەك ئەوەی چارلیس ئالینی نوسـەر باسی دەکات ترادسیۆنی خۆی لەسـەر ڕەتکردنـەوەی دنیـای مـۆدێرن و هـەموو ئـەو ئایدیایانـەی کـە لـە دەرەوەی قورئـان و وتـەکانی پێغەمبـەر بنیادناوە.

لـەو کردەوانەیانـدا، ئـەوان سەدان ساڵ هەوڵی ئەوەیانداوە کـە بنیادنـانی ئـازادی تێکبـشکێنن بـە یاسـاگەلی ئیسلامی. لێـرەوە ئـەم گروپـە بەدرێـژایی تەمەنی خۆی هیچی بەرهـەم نـەهێناوە جگـە لـەو

پیاوانـەی کـە کـوڕی سـەردەمی دیـاریکراو بـوون و تـەنها لـە زەمـەنی ئـاینی و بیرکردنـەوەی تایبەت بەخۆیاندا دەژیان. بۆیە ئـەوان هـەرگیز ئامـادە نـەبوون تاکـەکانی کۆمەڵگـەی خۆشگوزەران چاوەڕێیان بکات.

چـارلیس ئـالین وەك مێژوونوسـێك و نوسـەرێکی بەناوبانگی بەریتانی-هندی زۆر بـە ئامانەتـەوە کـاری لەسـەر گێڕانـەوەی ڕووداوە مێژوویـەکان کردووە.

بـە درێـژایی ئـەم کتێبـە مێـژوونوس هەوڵیـداوە کـە لـە چـەمکگەلی وەك " جیهـاد، مـەلا، مـوفتی" بکۆڵێتـەوە و ڕۆڵـی ئـەم چـەمکانە لـە مێـژووی جیهـانی ئیسلامیدا ڕاڤە بکات، بەجۆرێك کە مێژووی ئیسلامی لەسەر ئەم سـێ چـەمکە پایـەکانی لـە کۆمەڵگەدا قایم کردووە.

لێرەوە ئـەوە کـارێکی هـەروا سانا نییە بتوانین مامەڵە لەگەڵ وەها کارەکتەرگەلێکی ئیسلامیدا بکـەین کـە ڕەفاهیـەتی ژیـان بەهـەموو جوانیەکانیـەوە ڕەت دەکەنـەوە. بـەڵام ئـەوەی مایـەی تێڕامانە ئەم کارەکتەرە ئاینیانە لە تەلەفزیۆن و تەکنەلۆژیاکانەوە خۆیـان بـەیان دەکـەن، ئیشکالیەتەکە لێرەدایە کە ئەوان تەکنەلۆژیا بەکاردەهێنن و دژ بە ئەو عەقڵانەشن کە تەکنەلۆژیای بەرهـەم هێنـاوە، یـاخود دژ بـە خۆرئـاوان کـە سەرچـاوەی بەرهـەمهێنانی تەکنـەلۆژیا گەورەکانە.

ئەو مێـژووەی کـە دەسـەڵاتی وەهابیەکانی بینیوە لە کتێبەکەی ئالینـدا مێژوویەکـە پـڕە لـە "خوێن" و "تۆڵە". لـە چاپتەری کۆتـایی ئـەم کتێبـەدا ئـالین وەك گێڕەرەوەیـەك هـەوڵی داوە قسـە لەسـەر چارەنوسـی گروپـی وەهابی لەسەدەی بیست و یەکدا بکات و ئەگـەرەکانی دەرکـەوتنی ئـەم گروپـە لـە دنیـای مۆدێرنـدا شی بکاتەوە.

کاردانـەوەی داگیرکردنـی ئەفغانـستان لەلایـەن ڕوسـیـاو پرچـەکبوونی "موجاهیـدین" ی ئەفغانـستان جـارێکی تـر ڕۆڵـی هـەبوو لـە سـەرهەڵدانەوە و گەشەسـەندنی گروپـە فەندامێنتالیـستەکان کـە تـا ئـەم چرکەسـاتەش لـە زۆر وڵاتـانی جیهانـدا وەکـو قارچـك سەردەردەهێنن.

دیاردەیـەکی تـر کـە چـارلس ئـالین لـە کتێبـی " تیرۆرسـتانی خـودا"دا باسـی کـردووە ئـەو سیاسـەتە هەڵەیەیـە کـە دەسـەڵاتدارانی خۆرئـاوا لـە خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا پراکتیـزەی دەکـەن، ئەمـەش خـاڵێکی سـەرەکیە بـەوەی کـە گـەنجان لـەوەها کۆمەڵگەیەکـدا دەستبەرداری ژیانی خۆیان بن و ژیـانی خۆیـان بـۆ ڕۆژ دوایـی *doomsday* تـەرخان بکـەن. هـەر بۆیـە هـەر ئەنـدامێکی گروپـە فەندامێنتاڵەکان دەبینیت هەموو توانای خۆی تەرخان دەکات بۆ ئیفلـیج کردنـی پرۆژەکـانی خۆرئـاوا لـە خۆرهـەڵاتی ناوەڕاستدا.

"تیرۆرسـتانی خـودا" وەك کتێبێکی مێژوویی بەنرخیەکەی لەوەدایـە کـە خوێنـەر بـە خوێندنەوەی لەلایەك بە هۆکاری سـەرهەڵدانی گروپـە فەندامێنتاڵەکان ئاشنا دەبێت و لەلایەکی تریشەوە بە سیاسەتی نێودەوڵـەتی و پەیوەندیـەکان شارەزا دەبێت.

بـە خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـە خوێنـەر بـە سـێبەری ڕابـردوو لەسـەر ئیـستا و ئاینـدە ئاشـنا دەبێت.

**سەرچاوە:**

*Washington post. Book review*

*15/01/2007.*

# نامەکانی دۆستۆیفسکی پێش فەرمانی تیرەباران کردن و دوای ئەوە

هاشم سالْح

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

بەم دواییە، لە پاریسی پایتەختی فەرەنسادا، تەواوی نامە گۆڕینەوەکانی دۆستویفسکی بلاْوکرایەوە. پرۆفیسوری فەرەنسی جاك کاتو کە پسپۆرە لە ناسینی ئەم نووسەرە ناودارەی ڕوسیادا، پێشەکی بۆ وەرگێڕانە فەرەنسیەکە نووسیوە. ئەم نامانە کە یەکەمجارە بە زمانی فەرەنسی بلاْودەبنەوە، زۆربەیان لە پاشکۆی ڕۆژنامە گەورەکاندا بلاْوکراونەتەوە، بە تایبەتی لە ڕۆژنامەی "لوموند"دا.

پێش ئەوەی باس لەو نامانە بکەم، پێم خۆشە کەمێك لەسەر ئەو پێشەکیە گرنگ و درێژە بوەستم کە ئەو مامۆستایە نووسیویەتی. بەلای ئەوەوە


دۆستویفسکی

دۆستویفسکی بەهێزترین کەسایەتی ئەدەبیە کە چەرخی زێڕینی ئەدەبی روسی بەخۆیەوە دیبێت. واتا سەدەی نۆزدەیەم. ڕاستە هەندێك جار دەشێت تولستوی بیگاتێ یان بەقەد بالاْی بێت، بەلاْم جیاوازیان گەلێك زۆرە! تولستوی دەیویست گونجانێك لە نێوان گەردوون و مرۆڤدا دروست بکات تەنانەت لە

ناخۆشترین کات و لە سەردەمی تۆف و زریاندا. تۆلستۆی بەردەوام پزیسکێکی ئومێد و گەشبینی دروست دەکرد و مرۆڤی لەبەردەم قەدەر و چارەنووسی خۆیدا بە تەنیا بەجێنەدەهێشت. وەلێ دۆستویفسکی مرۆڤی هەلْدەوەشاند و دەیخستە سەر کەلْکەلْەی ئارەزووەکانی. زۆرجار لەبەردەم ترس و نائومێدی و هەلْوێستی توندڕەوانەدا ڕایدەگرت. بۆیە لە ڕۆمانەکانیدا هەمیشە کەسایەتی سەیر هەن. وەك شێت، سەرخۆش، بکوژ، تاوانبار، نەهلیستیە نائومێدەکان.. تا ئێستایش دۆستویفسکی ئەوانە لە بێزاریو دلْەڕاوکێدا ڕادەگرێت کە توانای

پێ هەڵگرتنی ئەویان نییە. دۆستویفسکی خوێنەری خۆی تەواو تووشی سەرە گێژە دەکات. لەبەرئەوەیە کە هەندێك لە ترساندا خۆی لێ دوور دەخەنەوە. بەڵام زۆر دەگمەنن ئەو رۆماننووسانەی توانیویانە وەك ئەو بەرزەفڕین، یان ئەوەندە بە قوڵاییدا بچنە خوارێ تا دەگەنە هەرێمە هەرە تاریك و ناجۆرەکانی کەسایەتیە ئینسانیەکانی وەك ئەو.

من لێرەدا تەنیا لەسەر ئەو نامانە دەوەستم کە دۆستویفسکی پێش و دوای ئەوە نوسیونی کە فەرمانی تیرە بارانکردنی بەسەرادراوە، بێگومان ئەو رووداوە کە بە دەگمەن تووشی خەڵك دێت و بەسەلامەتیش لێی دەربچێت زۆر کاری لێکردووە، ئێمە ناتوانین لە کەسایەتی ئەم نووسەرە بگەین دوور لەم رووداوە، هەروەها ئەزموونی دوای ئەوە کە دوورخستنەوەیەتی بۆ سیبریا و چوارساڵ زیندانیەتی لەگەڵ کاری قورسدا، ئەمە لە بارودۆخێکی گەلێك ترسناکدا کە بۆ مرۆڤ تاقەت پروکێنە زۆربەی هەرە زۆری نامەکانی دۆستویفسکی بۆ میخائیلی برا گەورەیەتی، پەیوەندی نێوان ئەم دوانە هێند توند و تۆڵ بوو کە بەدەگمەن لە نێوان دوو برادا رێك دەکەوێت. ئێمە گوێ بیستی ئەو چرکەساتە دەبین کە باس لە فەرمانی تیرە باران کردنەکەی دەکات و لە چ بارودۆخێکدا ژیاوە، ئەمە پێش چوونیەتی بۆ سیبریا "ماڵە مردوەکان". پاشان دەرۆمە سەر بەڵگاندنەکان، ئەمەیش بە چەند برگەیەکی یەکەم نامەی کە دوای دەرچوونی لە زیندان نووسیویەتی. ئیتر ئەمە رووناکی دەخاتە سەر لایەنی سایکۆلۆژی ئەم نووسەرە پێش ناخۆشی و کێشەکانی و راستەوخۆ دوای ئەوەیش. لە قەڵای بوتروس و بولسەوە (واتا باستیلە بەناوبانگەکەی تزار"

مێژوو: 22 دیسەمبەری 1849

براو هاورێی ئازیزم، چارەنووسی من یەکلایی بووەوە، بە چوار ساڵ و کاری قورس لە بەندیخانەی سیبریادا تۆمەتبارکرام، دوای هاتنە دەرەوەم لە زیندان دەبم بە سەربازی گیراو کە لە هەموو مافێکی مەدەنی بێ بەشم، لەوانە تا شەش ساڵ نابێت بنووسم.. چیرۆکەکەت لە سەرەتاوە بۆ دەگێرمەوە: بەرەو گۆرەپانی گشتی زیندانی قەڵایان کردینەوە. فەرمانی کوشتنیان بۆ خوێندینەوە، پاشان خاچیان پێ ماچ کردین. شمشێرەکەمانیان لەسەرماندا شکاند بەو مانایەی ئیتر ئێمە تەواو. ئینجا مردوو چۆن دەشۆرێت ئاوا شۆردیانین، پاشان براکەم کفنیان لەبەرکردین. کردیانین بە سێ ریزەوە، سێ ریز لەبەردەم دیوارەکەدا بۆئەوەی دەستریژمان لێ بکەن. من شەشەم کەس بووم. سەر بە دەستەی دوو بووم کە فەرمانی کوشتنەکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، تەنیا یەك دەقیقە ژیانم مابوو، لەو چرکە ساتەدا، کاکە، بیرم لە تۆ دەکردەوە، لەو چەند چرکە ساتەدا تەنیا تۆ لە خەیاڵمدا بوویت. ئەوسا زانیم چەندم خۆش دەوێیت برای ئازیزم.

بەڵام لەدوا چرکەی پێش ئەنجامدانی کوشتنەکەدا تەپڵ لێدرا. لێبوردنی شاهانەمان بۆ دەرچوو کە ژیانی نوێی پێ بەخشینەوە. ئایا تۆ دەتوانیت وێنای ئەو چرکەساتە بکەیت؟ کێ توانای وێناکردنی هەیە؟ بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو کارەساتەدا کە بەسەرم هات نە بێ هیوا بووم و نە ورەم بەردا. ژیان لە هەموو شوێنێکدا هەر ژیانە. ژیان لە ناوەوەی خۆماندایە نەك لە دنیای دەرەوەدا.

بۆم مەگری براکەم، تکات لێ دەکەم بۆم مەگری.. ژن و منداڵەکانت ماچ بکە و بۆ ئەوەی لە بیریان نەچمەوە باسی منیان بۆ بکە.. بەڵکوو ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکتری ببینینەوە..

ڕۆحم تووشی فەنابوونێکی وا هاتووە کە لە ناوەوەمدا وەك مەنجەڵ دەکوڵێت و ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەمەم بە خۆمەوە نەدیوە. تۆ بڵێی لەشم بەرگەی ئەم میحنەتە بگرێ؟ئەمە پرسیارەکەیە. من بە نەخۆشی دەڕۆم، وەلێ قەیدی نیە. بیدەرە دەست خوا.. براکەم مەترسە، من لە ژیانمدا بەرگەی گەلێك ناخۆشیم گرتووە. بۆیە هیچ شتێك نامترسێنێت. چی دەبێت بابێت. لە نزیکترین دەرفەتدا هەواڵی خۆمت پێ دەگەیەنم.

باشە خوا هەڵدەگرێت من ئیتر هیچ نەنووسم؟ دەبێت ژیانی ئەدەبیی من کۆتایی بێت لە کاتێکدا کە هێشتا لە سەرەتای سەرەتادام؟ ئاخ براکەم! چەندە وێنەی ژیانی ڕۆژانە و بیرۆکە لە سەرمدا دەمرن. ئەگەر وا بێت هەموویان دەبنە هەڵم و ئیدی ناگەڕێنەوە.

بەڵی، ئەگەر قەدەغەی نووسینم لێ بکرێت دەمرم، براکەم زۆرم بۆ بنووسە، تەنانەت لەسەر شتە بێ بەهاکانیش، بەتایبەتی لەسەر شتە بێ بەهاکان، ئاساییەکان، شتی ڕۆژانە، چونکە لە تاراوگەدا من لە ژیان دوور دەکەومەوە، تەواو دادەبڕێم.

بەڵام تۆ بی و خودا مەگری.

بۆم مەگری براکەم مەگری..

ئەوە بزانە کە من ورەم بەرنەداوە، هیوایش دەستبەردارم نەبوە تەنانەت لە تاریکترین چرکەساتدا، کەمێك پێش چرکەساتی تیرباران کردنەکەدا دەمزانی هەواڵەکە لە شوێنی خۆتدا دەتکوژێت.. بەڵام وا ئێستا لەوەم تێپەڕاند. ئیدی ترسی ئەوەم نەماوە. تازە لەدایك بوومەتەوە، کەس لە مانای ژیان ناگات ئەوانە نەبن کە لە دەستیان داوە یان لەوەدایە لە دەستی بدەن. کە بیر لە ڕابوردوو دەکەمەوە هەموو ئەو کاتانەم دێتەوە بەرچاو کە بە فیڕۆ چوون. بیر لە ساتەکانی بێ کاری و وێڵی و ئەو دەرفەتانەی لە کیسم چوون.. چەند هەڵەم بەرانبەر بە خۆم و ڕۆحم کردووە، کە ئەمانەم بیردێنەوە هەست دەکەم خوێن لە دڵم دەچۆڕێت. ژیان بەخشش و دیاریەکی گەلێك بەنرخە کە ئێمە بەهاکەی تەنیا لەو کاتەدا دەزانین کە خەریکە لەدەستمان دەردەچێت یان ڕووبەڕووی هەڕەشەیەك دەبێتەوە. ژیان بەختیاریە. لە هەر دەقیقەیەکدا سەدەیەك بەختیاری هەیە.. ئاخ لە هەرزەکاری! ئێستا کە ڕەوتی ژیانم دەگۆڕم وەك ئەوە وایە بە جۆرێکی تر لەدایك بم".

1854

نامەی دووەم دوای ڕزگاربوونی لە ماڵی مردوان.

کێ دەتوانێت ئەو دڵخۆشیەی دۆستویفسکی بهێنێتە بەرچاوی، کاتێك لە زیندان و کاری قورس ڕزگاری دەبێت و بۆ هەتا هەتایە سیبریا بەجێدێڵێت؟ کێ دەزانێت چ هەناسەیەکی ئاسوودەی داوەو چۆن بە یەکەمجار بۆنی شەماڵی ئازادی کردووە؟ دوای چوار ساڵ لە ئازار، کاری قورسی ڕۆژانە و پێ لە کۆت و بەنددا، دۆستویفسکی وەك مردوویەك لە گۆڕ هاتبێتە دەرەوە جارێکی تر زیندوو دەبێتەوە. ئەو زۆری بینی و گەلێك سووتا، ئەمەیش شتێك وەبەردێنێت کە ناتوانیت وێنای بکەیت. دوای ئەوەی شتەکان لە ناوەوەیدا پێدەگەن و سەقامگیر دەبن و دەبن، بەو ڕۆمانانەی کە تەنیا بلیمەتەکان بەرهەمی دێنن. دۆستویفسکی دەبێتە گەورەترین نووسەری هەموو سەردەمەکان. با گوێ لەو نامەیەی بگرین کە دوای ڕزگاربوونی لە زیندان بۆ

میخائیلی برای ناردووە: "برا.. بەم زوانە یەکتر دەبینینەوە، هەست دەکەم لەم چرکەساتەدا رۆحێکی شەفاف و بەڕەونەقم تێگەڕاوە. من خاوەنی ئایندەم، هەموو ئایندە هی منە و لە ئێستاوە دەزانم چی دەکەم، هەموو ئەو شتانەم لەبەرچاوە کە بەدیان دەهێنم. من قایلم بەم ژیانەم. تەنیا یەك شت هەیە کە لێی بترسم: مرۆڤ و هەرەمەکی.. بەڵام مرۆڤ لە هەر جێگایەك بێت هەر مرۆڤە. تەنانەت لە زیندانی کاری تاقەت پڕوکێندا، لە نێوان تاوانبار و پیاو کوژ و دزدا، مرۆڤ گەلێکم دیوە. بەڵێ دوای چوارساڵ ژیان لەگەڵیاندا، هەستم کرد هێشتا تروسکەیەکی مرۆڤایەتیان تێدایە و ئەو تروسکەیە لە ناخیاندا نەمردووە. کە بۆ دواجار لێیان جیابوومەوە گریان و هەستم کرد خۆشیان دەویێم. من لە زیندانەدا رووسیام ناسی. بەتایبەتی گەلی رووسی. وا دەزانم ئێستا لە هەر کەسێکی دی زیاتر ئەم گەلە دەناسم".

پاشان دۆستویفسکی داوای هەندێك کتێب لە میخائیلی برای دەکات، چونکە لە شوێنێکی دوورە یان وەك سەربازێك بۆماوەیەکی تر دوور خراوەتەوە. لەو ناوچە دوورە دەستانەیە کە نە کتێبیان تیایە نە کتێبخانە. بەڵام ئەو کتێبانەی کە داوای کردوون جێی سەرنج و رامانن، بەتایبەتی یەکەم کتێبیان:

"تکایە قورئانم بۆ بنێرە. لەگەڵ کتێبی (رەخنەی ئەقڵی پەتی) کانت. بێ سێ و دوو هیگڵم بۆ بنێرە بەتایبەتی ئەو کتێبەی لەسەر مێژووی فەلسەفەیە.. هەموو چارەنووسی من لەسەر ئەو کتێبە بەندە.."

دیارە خوێندنەوەی دۆستویفسکی تەنیا ڕۆمان نەبووە، بەڵکوو کتێبە ئاینی و فیکری و فەلسەفیەکانیشی خوێندۆتەوە. زۆر بایەخی بە کتێبە ئاسمانیەکان داوە و رێزی لێ گرتوون. تەنانەت چەند جارێك باسی قورئانی کردووە، بەتایبەتی لە رۆمانی شەیتانەکاندا. وەك سەرچاوەیەکی رووناکبیریشی داناوە لەسەر شاعیری گەورەی رووسی (پوشکین) هەروەها بەرگێکی قورئان لە کتێبخانەکەیدا هەبوە بە زمانی فەرەنسی کە خۆی زانیویەتی.

بێگومان دۆستویفسکی کتێبی ئینجیل و مەسیحیەت و مەزەبی ئەرتودۆکسی زۆرلا پیرۆز بووە (لە زۆربەی هەرە زۆری رۆمانەکانیدا باسی ئینجیل دەکات و لە کاتی تەنگانە و تەنانەت چەند چرکەساتێك پێش مردنی داوای ئینجیل لە ژنەکەی دەکات و لە زیندانی سیبیریایشدا تاقە کتێبێ هاوڕێی بووە، بەتایبەتی لە رۆمانی (برایانی کرامازۆف) و (تاوان و سزا)دا ئەم بۆچوونە دەردەکەوێت. هەروەها لای دۆستویفسکی مەسیحیەتی رووسی شایانی ئەوەیە ڕابەری هەموو ئەوروپا بکات بەرەو چارەسەرە گەردوونیەکان و ئەو ئاکارانەی مرۆڤ بەختەوەر دەکەن – وەرگێڕ) کەواتە رۆحی کراوەو رەندی ئەم نووسەرە مایەی سەرنج و رامانە، کاتێك کە دەیەوێت کتێبی پیرۆزی ئاینێکی تر بخوێنێتەوە کە لە مل ملانێیەکی مێژوویدایە لەگەڵ مەسیحیەتدا. ئەمە بەڵگەیە کە نووسەرە گەورەکان بە باوەڕی تەسك و دەمارگیرانە بیرناکەنەوە. پێچەوانەی ئەوانەی کە بیری تەسك و داخراویان هەیە.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (الشرق الاوسط) ژمارە 10326 رۆژی 7ی مارس 2007.

# یان هەمووومان لەناو دەچین
# یاخود هەمووومان پێکەوە ڕزگارمان دەبێ

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع



دومینیك دوفیلبان

دانەری ئەم کتێبە وەزیری پێشووی دەرەوەی فەرەنسا و سەرۆك وەزیرانی ئێستا "دۆمینیك دۆڤیلبان"ە. پێشتر چەند کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە، لەوانە "سەد رۆژەکەی ناپلیۆن"و "دزەکانی ئاگر" مەبەستی شاعیرەکانە، ئەو کتێبەی دەربارەی شیعری فەرەنسییە، ئەم پیاوە بەهۆی ئەو کتێبەیەوە سەلماندی زەوقێکی شیعری زۆرباشی هەیە، پێدەچێ لە کاتی فەراغیدا شیعر بنوسێ، وەلێ شیعرەکانی لاوازن و شوێنی بایەخنین، ئەم پیاوە لە کەسە هەر نزیکەکانی "جاك شیراك"ە.

کتێبە تازەکەی (ماسی قرش‌و نەورەسی دەریا) تەرخانە بۆ کێشەکانی ئەم سەردەمەمان. دانەر لەم کتێبەدا کاروانی مرۆڤایەتی ئەوروپا و جیهان، هەر لە سەردەمی رێنیسانسەوە تاکو رۆژی ئەمڕۆمان دەخاتە ڕوو. هەروەها دانەر قسەوباس لەو ڕووداوە سیاسیانە دەکات کە جیهانیان هەژاند، هەر لە داگیرکردنی سەدام حسین بۆ کوێت لە ساڵی 1990 تاکو 11ی سێپتێمبەری 2001 و ڕووداوەکانی دواتر، داگیرکردنی ئەفغانستان و عێراق.

"دۆمینیك دۆڤیلیان" لەم کتێبە تازەیەیدا وایدەبینێ ئێمە

لە دووڕیانێکدا ڕاوەستاوین: یا ئەوەتا هەمووومان لەناو دەچین یاخود هەمووومان پێکەوە ڕزگارمان دەبێ، چونکە هەمووومان سواری یەك كەشتی بووین، کەشتی ئەستێرەی زەوی، لەبەرئەم هۆیەیە ئەو بانگەشەی برایەتی گەردونی نێوان ڕۆژئاواو و ڕۆژهەلأت یان باکور و باشور، یاخود نێوان هەموو دژەکان دەکات، چونکە گەر کەشتییەکە نوقم بوو هیچ کەسێ ڕزگاری نابێت. لێرەوە کاتی ئەوە هاتووە بەهێز لەگەڵ بێهێز، ئاسمان لەگەڵ زەوی، حوتی زەبەلاحی ترسناکی نێو قولأیی دەریا لەگەڵ نەورەسی جوان کە بەردەوام بەسەر سەری دەریاوە دەسوڕێتەوە، ئاشتبنەوە. ئاونیشانی کتێبەکەش ئالێرەوەیە، ئیدی کاتی ئەوە هاتووە بەشەریەت لەگەڵ خودی خۆیدا ئاشتبێتەوە، ئەمەش دوای ئەوەی بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ یەکتردا لە جەنگدا بوون.

دانەر وایدەبینێ گرنگترین شتێك کە بیکەین ئەوەیە یەکەمجار لەگەڵ خودی خۆماندا ئاشتبینەوە، دواتر لەگەڵ ئەویدیکەدا ئاشتببینەوە، ئەویدیکە کە لەلایەنی ئاین و نەتەوەو زمان جیاوازە لەگەڵماندا. ئەمەش مانای ئەوەیە هەر یەکێك لە ئێمە مافی ئەوەی هەیە شانازی بە شوناس و کەلتوری خۆیەوە بکات، بەمەرجێ ئەوە نەکاتە بیانویەك بۆ ڕەتکردنەوەی شوناس و کەلتوری ئەویدیکە، یان بیکاتە بیانویەك بۆ دەستدرێژکردنە سەریان. چونکە ئەویتریش مافی خۆیەتی شوناس و کەلتورو ئاین و نەتەوەی خۆی هەبێت.

وەلێ ئەم ململانێ خوێناوییەی ئێستا هەرەشە لە هەموو ئەو شتانە دەکات، لێرەوە دانەر دەگاتە سەرکێشەی ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست و عێراق و تیرۆر و کۆنزەرڤاتیڤە تازەکان و فەندەمێنتالیزمە بەشەڕ هاتووەکان.

سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا ئاوا دەڵێ: دوای 11 سێپتەمبەر ئەولەویاتی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، هەموو ئەوەش بەهۆی کاریگەری زۆری کۆنزەرڤاتیڤە تازەکانەوەیە، ئەوانە تەنها بڕوایان بەهێز هەیە، لەو بڕوایەدا نەبوون نەتەوە یەککگرتووەکان بتوانێت چارەسەری کێشەی سەدام حسێن بکات، بۆیە تیۆرەی جەنگی خۆپاراستنیان گەلاڵە کرد و قەناعەتیان بە "جۆرج دبلیو بوش" هێنا. وەلێ گەر لێدانی 11سێپتەمبەر نەبوایە، ئایا "بوش" قەناعەتی دەهێنا؟

لێرەوە بنلادن یارمەتی کۆنزەرڤاتیڤە تازەکانیدا لە واشنتۆن بگەنە لوتکەی دەسەلأت و نەخشەو پلانەکانیان جێبەجێ بکەن. ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە کە توندڕەوی پاڵپشتی توندڕەوی دەکات و گوڕو تین بەیەك دەبەخشن. جگە لەوانە هەرەسهێنانی دانوسانی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینیەکان، یارمەتی کۆنزەرڤاتیڤە تازەکانیدا ئەولەویاتی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بگۆڕن و شتێکی ئاوایان بە بۆش وت: کاتی خۆت لەگەڵ "یاسر عەرەفات" بە فیڕۆ مەدە، وەك ئەوەی "کلینتۆن" لە کامپ دیفید کردی. کلینتۆن هەموو شان و شەوکەتی خۆی و هێزی خۆی وەك سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، خستە تای تەرازوویەکەوە بەبێ ئەوەی بگاتە هیچ ئەنجامێك، بەم شێوەیە مسداقیەتی خۆی لە دەست داو زەرەری بۆ

سەرکردایەتی ئەمریکا هەبوو کە بە گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەت دادەنرێ لە جیهاندا.

دواتر دۆڤیلبان دەڵێ: (ئیسرائیل هەرگیز ئاشتی بەخۆیەوە نابینێ، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە گەلی فەلەستین هەموو مافە زەوتکراوە ڕەواکانیان بە دەستدەهێنن. بە دەستی ناهێنێ تەنها ئەو کاتە نەبێ کە ڕێکەوتننامە لەگەڵ سوریا و لوبنان و ئێران و سعودیە و 20 دەوڵەتی عەرەبی دیکە کە تاکو ئێستا بە چاوی دوژمن لە ئیسرائیل دەڕوانن، مۆر نەکات. لێرەوە ڕێکەوتننامەی ئاشتی بە تەنها لەگەڵ فەلەستینیەکان بەس نییە ئاشتی پێویستە ئاشتیەکی سەرتاپاگیر بێت، دەنا سودی نییە. دەکرێ بڵێین گەر سوریا ڕازی بوو ڕێکەوتننامە لەگەڵ ئیسرائیل مۆر بکات، ئەوا بەپێی بیروڕای دانەری کتێبەکە دەوڵەتانی دیکەش چاوی لێدەکەن و ڕێکەوتننامەی لەگەڵ مۆر دەکەن.

فەلەستینیەکان تەنها ئەوکاتە ئاشتی و ئاسایش بە خۆیانەوە دەبینن کە هەم ئیسرائیل و هەم سەرجەم دەوڵەتانی عەرەبی، وەك کیانێکی تایبەتی و بێلایەن دانی پێدادەنێن. هەروەها پێویستە ئاشتبوونەوەیەکی مێژوویی لە نێوان ئەردەن و فەلەستینییەکان بێتەئارا. چونکە تاکو ئێستا یادگاری سێپتەمبەری ڕەشی ساڵی 1970 خوێنی لێدەچۆڕێ و تیمارنەکراوە و متمانەیەکی ڕاستەقینە لە نێوان ئەم دوانەدا بوونی نییە.

بۆ ئەوەی لەسەر شانۆی نێو دەوڵەتی ئەو پێگەیە بدەینە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە شایەنیەتی، بۆ ئەوەی گەشەکردن و پێشکەوتنی ئابوری و سیاسی بە دەستبێنێت، ئەوا لەسەرمانە سەرەتا لە دژی دیاردەی تیرۆر بجەنگێین، چونکە هیچ شتێك پاکانە بۆ بوونی ئەم ئایدۆلۆژیا توندڕەوە ناکات، ئایدۆلۆژیای مەرگ و خۆکوشتن.

دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: بەرەنگاربوونەوەمان دژ بە تیرۆر، مانای ململانێی شارستانیەتەکان ناگەیەنێ یان مانای ئەوە نییە شارستانییەتەکەمان بەرەنگاری شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی دەبێتەوە، بەڵکو مانای ئەوەیە شارستانیەتی ڕۆژئاواو شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی لەلایەکە و بەربەریەت و هەمەجییەت لە لایەکی دیکەیە. یەکەم وەلامدانەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی تیرۆر پێویستی بەوەیە چەکی کاریگەر و قورسی سەربازی و پۆلیسی و هەواڵگری تێدا بەکاربێت، ئەمە شتێکی ناچارییە و هیچ ئەملاو ئەولایەکی تێدا نییە، بەلام نابێ تەنها بەوەندەوە بوەستین، بەڵکو دەبێ بەرەنگاری هۆکارە قووڵەکانی تیرۆر ببینەوە، واتە ئەو هۆکارانەی گەشە بە تیرۆر دەدەن و هێزی پێدەبەخشن، وەك نەزانین و نەخوێندەواری، هەژاری، داخستنی ئاسۆی پێشکەوتن و گەشەکردن لە جیهانی ئیسلامی، ئەو هۆکارانەن حەزدەکەن ئایدۆلۆژیا توندڕەوەکان بلاوببنەوە.

تیرۆری قاعیدە، واتە بزوتنەوەکەی بنلادن، لەسەر ئایدۆلۆژیا زۆر توندڕەوەکان دروست بووەو گەشەی کرد، ئەو ئایدۆلۆژیانەش لەسەر لێکدانەوەی حەرفی چەق بەستووی دەقەکان راوەستاوە و هەموو شێوەکانی ڕۆشنگەری و مۆدێرنە ڕەتدەکەنەوە، بگرە هەوڵدەدەن لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا لە ڕەنگ و

ریشەوە هەڵیانکێشن، چونکە ئەوانە واتە رۆشنگەری و مۆدێرنە گلاّون و ئیشی شەیتانە. لێرەوە دانوسان و گفتوگۆ لەگەڵ قاعیدە یان لەگەڵ نوێنەرەکانی کارێکی مەحاڵە، چونکە هیچ ئەرزییەتێك بۆ گفتوگۆ لە ئارادا نییە، لە راستیدا قاعیدە لە ئێستادا بە پلەی یەکەم ئامانجی کۆمەڵگا ئیسلامییەکانە و هەوڵدەدا میللەتانی ئەو کۆمەڵگایانە لە دژی رژێمە حوکمڕانییەکانیان هانبدەن، لە پێناو ئەوەی بیانڕوخێنن و خۆیان شوێنیان بگرنەوە.

ئێمەی خۆرئاوا بۆ ئەوەی رووبەڕووی تیرۆری قاعیدە ببینەوە، پێویستە لەسەرمان چارەسەر بۆ ململانێی هەرێمایەتییە ناوخۆییەکان بدۆزینەوە، بە تایبەتی ململانێی فەلەستین/ ئیسرائیل. چارەسەی ئەم ململانێیە دەرونی خۆرهەلاّتی ناوەڕاست هێو دەکاتەوە و وا دەکات گەلانی ئەو ناوچەیە رقێکی کەمتریان لە رۆژئاوا هەبێت. لێرەوە وشککردنی سەرچاوەکانی تیرۆر، بە پلەی یەکەم داوامان لێدەکات ئەو هۆکارانە لەناوبەرین کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی تیرۆر، بەلاّم بەداخەوە کۆنزەرڤاتیڤە تازەکان بەم جۆرە لە مەسەلەکان تێناگەن، پاشان پێویستە لەسەرمان هانی چاکسازییە ناوخۆییەکان بدەین و یارمەتی ولاّتانی ناوچەکە بدەین بەرەو دیموکراتییەت و تەبەنی کردنی بەها گەردونییەکانی شارستانیەت، وەك مافی مرۆڤ و هاولاّتیبوون، هەنگاو بنێن.

هەروەها هانیان بدەین باوەڕ بە پرۆژەی فرەیی رۆحی یان ئاینیی بێنن، هەروەها دان بە فرەیی سیاسی و رۆژنامەگەری و فیکری و ئالۆگۆڕی دەسەلاّت لە نێوان دەسەلاّت و ئۆپۆزسیۆندا، بنێن. بەلاّم ئەم شتانە ناکرێ بە خێرایی بێنە دی، بەڵکو کاتێکی زۆری پێویستە. ئەوەی رۆژئاوا لە میانەی سێ سەدە بە دەستی هێناوە، ناکرێ عەرەب لە میانەی سێ دەیە بە دەستی بێنن.

دواتر سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا دەربارەی عێراق قسە دەکات و ئاوا دەڵێ: بۆ ئەوەی بە دروستی بزانین چی لەو ولاّتەدا روودەدات، پێویستە پێکهاتەی ئەو ولاّتە بە باشی بزانین. پێویستە بزانین سێ چارەکی دانیشتوانی ئەو ولاّتە شیعەن. ئەم بە شیعە بوونەش لە بەشێکیدا بۆ ئەو کاردانەوەیە دەگەڕێتەوە کە لە سەدەی نۆزدەو بیست لە دژی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هاتە ئارا. زۆربەیان سونەبوون و دواتر بوونە شیعە، بەتایبەتی هۆزە دەشتەکییەکانی خوارو. وەلێ هەر چۆنێك بێت عێراق لانکەی تەشەیوعە لە مێژوودا.

بە درێژایی مێژوو شیعە چەوسێنراونەتەوەو لە ناوەندی دەسەلاّت و نفوزی سیاسی و ئابوری دوورخراونەتەوە. لە سەردەمی دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، واتە پێش پێنج سەدە لەمەوبەر تاکو هاتنی ئینگلیز و سەردەمی ئینتیداب، دەسەلاّت بە دەستی سونەوە بووە کە ڕازی نەبوون هیچ کەسێ بەشدارییان لەگەڵدا بکەن.

دواتر لە سەردەمی سەربەخۆبوون و تاکو کۆتایی هاتنی سەدام حسێن، ئەوا دەسەلاّت هەر لەلایەن تایفەیەکی سونەوە قۆرخ کرابوو. بگرە تەنانەت پێش ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، شیعەکان بۆ پێنج سەدەی دیکە هەر لە دەسەلاّت

دوورخرابوونەوە، واتە لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسیەکان و سەلجوقییەکان تاکو سەرەتای دەسەڵاتی عوسمانی. ئەمەش مانای ئەوەیە شیعەکان بۆ ماوەی هەزار ساڵ بە بەردەوامی لە دەرەوەی مێژوو بوون! ئا لێرەوەیە ئەوەی ئێستا لە عێراقدا روو دەدات ترس و تۆقانێکی گەورەیە. ئا لێرەوەیە قەبەیی ئەو تەقینەوەیەی لە عێراقدا روو دەدات کە هەموو سنورەکانی توند و تیژی تێپەڕاندووە.

بۆیە هەنووکە سونەکان بە هەموو هێز و توانای خۆیانەوە ڕاپەڕیون، چونکە لەوە دەترسن بۆ یەکەم جارە لە مێژووی عێراقدا دەسەڵات لە دەستیاندا نەمێنێ. جگە لەوە سونەکان هەموو کاتێ لەوە ترساون کە ئێران دراوسێیان بۆ دەستبەسەراگرتنی وڵاتەکەیان و زیادکردنی قەڵەمڕەوی خۆی لە عێراقدا، پەنابەرێتە بەر تایفەی شیعە. لێرەوە کۆمەڵێ پێشهاتی گەورە لە عێراقدا دێتە ئاراوە. بۆ ئەوەی لەم حاڵەتە نوێیە تێبگەین، پێویستە ئەم فاکتەرە سیاسیانەو هەروەها فاکتەری زوڵم و چەوساندنەوەی مێژووی شیعەکان لەبەرچاو بگرین. مەسەلەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە لێیتێگەیشتوین.

مەسەلەکان لە عێراق رێک نابنەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە مێژوو تۆڵەی خۆی دەکاتەوە و جۆرێک لە عەدالەت لە دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری دێتە ئاراو هەموو ماف خوراوێک مافی تەواوی خۆی وەردەگرێتەوەو هەر دەستەو تاقمێکیش شوێنی شیاوی خۆی وەردەگرێ.

عێراق ئێستا ئەو کەبتە مێژووییەی کە چەندین ساڵە لە قوڵایی ناخیدا کەڵەکە بووە بەسەریەکدا دەتەقێتەوە، هێوریش نابێتەوە تاکو تەواو خۆی خاڵی دەکاتەوە. دوای ئەوە دەکرێ هەموو دەستەو تاقمەکان لەگەڵ یەکتر ئاشتببنەوە و لەسەر ئەساسێکی نوێ کاروباریان رێکبخەنەوە. واتە لەسەر ئەساسی ئازادی و شەفافییەت و دیموکراتی. بەڵام پێش گەیشتن بەوە میللەتی عێراق باجێکی گران دەدات، هەر ئەمەشە کە رۆژانە روودەدات.

وەلێ لە عێراقدا چەندین تایفەی مەسیحی هەیە و ژمارەیان بە 600 هەزار کەس مەزەندە دەکرێ.

هەرچی جووڵەکەیە پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، چەند سەد هەزارێکیان لە عێراقدا بوون، بەڵام ئێستا تەنها لە چەند پیاوێکی کەم تێناپەڕێت.

پێویستە کوردەکان و نەتەوەی کوردیش بخەینە سەر ئەوان کە چارەکێکی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن. لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین لە 11 ٪ نەوتی یەدەکی جیهان لە عێراقدایە، لێرەوە ئەو دوای سعودیە دووەم دەوڵەتە کە گرنگی و بایەخێکی نەوتی هەیە. بەڵام عێراق لەوەدا بەسەر سعودیەدا سەرکەوتوترە کە وڵاتێکی کوشتوکاڵی بە پیتە و پڕە لە ئاو و خێر و بێر و توانای مرۆیی، واتە عێراق بە تەنها دەوڵەتێکی نەوتی نییە. هەموو ئەمانەش وا دەکەن ململانێکە بۆ دەست بەسەراگرتنی عێراق توندتر و قوڵتر بێت.

بۆ چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی عێراق، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەوروپا و ئەمریکا. ئەوروپا پشتگیری ئەو چارەسەرەی دەکرد کە لە رێگەی

نەتەوە یەکگرتووەکان و یاسای نێو دەوڵەتیەوە بوو، ئەمریکاش وایدەبینی هێزی سەربازی و هێزی چەك لە هێزی یاسا بە هێزترە، ئەمریکا پێی وابوو دیکتاتۆرە خوێنرێژەکان تەنها لە زمانی هێز دەگەن.

لە ڕاستیدا مەسەلەکە لە نێوان ئەو دوو لایەدا تەواو هەڵگەڕایەوە، لە ڕابردودا ئەوروپا، واتە فەرەنسا و ئینگلتەرە، تەنها باوەڕیان بە زمانی هێز و کۆلۆنیالیزم و هەیمەنەکردن بەسەر جیهاندا هەبوو. ئەو کات ئەمریکا لەسەر دەستی سەرۆك (ویلسۆن) ئەمریکایەکی نموونەیی بوو، باوەڕی تەنها بە هێزی یاسا و شێوازی مرۆڤانەی شارستانی هەبوو، کەچی لە ئێستادا ڕۆڵەکان پێچەوانە بووەتەوە. ئەوروپا دەیەوێ لە تاوانە کۆلۆنیالیزمەکانی خۆی خۆش ببێت و لە هەموو ئەو گوناه و تاوانانەی لەسەر دەستی و لە میانەی جەنگی دووەمی جیهانی ڕوویاندا خۆش ببێت، لەبەر ئەوە ئەوروپا بووەتە یەکێك لەوانەی بڕوایەکی تەواوی بە زمانی یاسای نێو دەوڵەتی هەیە و چەندی بکرێ لە زمانی هێز و جەنگ دوور بکەوێتەوە

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط – 4ی نیسانی 2007.

# پیرۆزبایی

پیرۆزبایی گەرممان بۆ هاوڕێی بەڕێز، ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان مامۆستا شاهۆ سەعید، بە بۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی دوکتۆراوە لەسەر (فەلسەفەی رەخنە) هیوای سەرکەوتنی زیاتر و بەرهەمی زۆرتری بۆ دەکەین.

**ستافی نووسینی**
**گۆڤاری سەردەم**

